# پەیوەندییەکانی دایک و باوک بە منداڵەکانیانەوە



## منداڵەکەت بەم جۆرە پەروەردە بکە



نووسینی: حیۆم جینۆت



دار المعرفة
بەیرووت

# پەیوەندییەکانی دایک و باوک بەمنداڵەکانیانەوە

## منداڵەکەت بەم جۆرە پەروەردە بکە

نوسینی: حیۆم جینۆت

وەرگێڕانی لە فارسییەوە: سەلاح سەعدی

پێداچوونەوەی:مستەفاحەسەن

دارالمعرفة

بەیرووت

# پێرستی لاپەڕەکان

* یاداشتی وەرگێڕی دەقە فارسییەکە.
* چاوپێداخشانێك بەڕاوبۆچوونی ڕۆژنامە بەناوبانگەکانی ئەمریکا دەربارەی ئەم کتێبە
* پێشەکی
*بەشی یەکەم:– گفتوگۆکردن لەگەڵ منداڵاندا:
* مانای پرسیارەکانی منداڵان زۆربەی جار شاراوەیە
* گفتوگۆیێ بەرهەمەکان. ڕێگای نوێی پەیوەندیکردن لەگەڵ منداڵان. دووفاقی بوونی هەستەکانی منداڵ. دابینکردنی ئاوێنەیەك بۆکەسایەتی هەندێك بنەمای گفتوگۆ.
*بەشی دووەم ڕێگا نوێەکانی هاندان و ڕەخنەگرتن
سەربردەی تەبڵەجگەرەی هاوێشتراووچیرۆکێکی ئاکاری،ئایادەبێت کاری چاك ستایش بکرێت یان کەسایەتی؟منداڵان چی لەقسەکانی ئێمە هەڵدەهێنجن. یارمەتی ئێمەبۆ ئاگادارکردنەوەی منداڵان دەربارەی تایبەتمەندیی کەسایەتیی خۆیان.ڕەخنەگرتنی سودمەندوزیانبەخش.چۆن ئاکۆکی وپێکداهەڵشاخان لەنێوان دایك و باوك ومنداڵاندا ڕوودەدات.ئاوڕناتۆرەی قێزەونو قسەی ناشرینی زیادلە ئەندازە.زاڵبوون بەسەر تووڕەیی.
*بەشی سێیەم _خۆپاراستن لەڕێگا نەشیاوەکانی پەروەردەو فێرکردن
هەڕەشە_ بەرتیل _ قسەی بێجێوبەڵێنە دووردرێژەکان _ تانەو پەشەروگاڵتەپێکردن _ سیاسەتی درۆزنی _ جڵەوگیرکردنی نادروستیی منداڵ _ دزی _ فێرکردنی ئەدەب بەتوندوتیژی یان میهرەبانی؟
*بەشی چوارەم – لێپرسراویەتی وسەربەخۆیی
لێپرسراویەتی:کارەکانی ڕۆژانەو بەهاکان – ئامانجەپەسندوباشەکان وکارەکانی ڕۆژانە ـ بەرنامەنزیك و دوورەکان – لەشەڕەوە بۆ ئاشتی– لێپرسراوی: مافی ڕادەربڕین وهەڵبژاردن ـ خۆراك ـ ئەرکەکانیماڵەوە ـ وانەکانی مۆسیقا ـ

خەرجیی رۆژانە ـ هاوڕێیان و هاوگەمەکان ـ بەخێوکردنی ئاژەڵە ماڵییەکان ـ ڕستەکانی ئارەزوومەندکردن وگیانی سەربەخۆیی – جلوبەرگ چەندڕستەیەك

* بەشی پێنجەم ـ ڕێککاری: ئازادی و لێپرسراویەتی:لاپەڕە

ئەنجامەکانی گومان ودوودڵی لەجیهانی ئێستادا– پێویستییە سۆزییەکانی دایك و باوك وستەمکاریی منداڵان ـ ڕێگاپێدان وجڵەوبەردان – شێوازە نوێیەکان: چەندرێگایەکی نوێ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەست وجوولەکانی منداڵان ڕێککاری و ئاراستەکردن: لە رابردوو ئێستا ـ سێ ناوچەی ڕێککاری وئاراستەکردن ـ هونەری دیاریکردنی پاڵنەرە پڕ لە مەترسییەکان ـ مەسەلەکانی ڕێککاری و ئاراستەکردن وجموجۆڵە جەستەییەکان ـ بەهێزکردنی ڕێککاری و ئاراستەکردن– هەرگیز نابێت منداڵ لە دایك و باوکی بدات ـ لێدان لە سمتی منداڵ

*بەشی شەشەم ـ ڕۆژێك لە ژیانی منداڵدا

بەیانی باش– کاتەکانی پەلەیی ـ خواردنی بەرچایی: بەبێ وانەگوتنەوەی ڕەوشتی ـ جلوبەرگ پۆشین و:هەرا لەسەر بەستنی قەیتانی پێڵاو- چوون بۆ قوتابخانە- گەڕانەوە لە قوتابخانە- گەڕانەوەی باوك بۆماڵەوە- کاتی خەوتن ـ نابێت دایکان و باوکان بۆچوونە دەرەوە مۆڵەت لەمنداڵەکانیان وەربگرن ـ تەلەفزیۆنی ڕووت ومردوو.

*بەشی حەوتەم ـ ئیرەیی

ـ سروشتی دەردناك ـ ڕووداوی ناپیرۆز- دەربڕینی ئیرەیی:لەرێگای قسەکردن یان هاوشێوە جۆراوجۆرەکاندا ـ ئەوهەلومەرجانەی کەدەبنە هۆی بەهێزکردنی ئیرەیی ـ شەڕکردن لەگەڵ ئیرەیی.

*بەشی هەشتەم ـ هەندێك سەرچاوەی نیگەرانی

ـ نیگەرانیی سەرچاوەگرتوو لەترسی بێ یارویاوەری ـ نیگەرانیی سەرچاوە گرتوو لەکەموکورتکاری ـ نیگەرانیی سەرچاوەگرتوو لەقەدەغەکردنی ئازادی ـ نیگەرانیی سەرچاوە گرتوو لەشەڕ وکێشەی نێوان دایکو باوك ـ نیگەرانیی سەرچاوە گرتوولەدەستتێوەردانی چالاکییە جەستەییەکان ـ ئەونیگەرانییەی کەلەترسی مەرگەوە سەرچاوە دەگرێت.

*بەشی نۆیەم ـ پەروەردەی سێکسی
سەرەتای پەیدابوونی هەستەسێکسییەکان ـ سێکس وفێرکردنی منداڵ بۆچوونەئاودەست، چێژە سێکسییەکان ـ جیاوازیە سێکسییەکان وەلامدانەوەی پرسیارەکان ـ لەشی رووت ـ جێوبالینگانی نووستن و ژووری نووستن، خەیاڵی بێ ئومێدانە- دەستپەڕ- گەمەیاساغەکان: گەمەسێکسییەکان ـ قسەی کرچوکاڵ و ناشرین

* بەشی دەیەم ـ رۆڵی سێکسی و ئەرکە کۆمەلایەتییەکان
لاسایی کردنەوەو ئەرکە جەستەییەکان ـ رۆڵی دایکایەتی و رۆڵی باوکایەتی ـ رۆڵی باوك ـ نموونە بۆکچان و کوڕان ـ پەروەردەکردنی گونجاو بۆگێڕانی رۆڵی ژنانەوپیاوانە ـ سەرمەشقەجیاوازەکانی خانەوادەیی.

*بەشی یانزەهەم ئەومندالانەی پێویستیان بە چارەسەری دەروونی هەیە:
ـ ئەومندالانەی کە پێویستییەکی بەپەلەیان بەچارەسەرکردنی دەروونی هەیە ـ ئەومندالانەی کەدەتوانن لەچارەسەری دەروونیدا یەکسەرئەنجام وەدەست بهێنن.

*بەشی دوازدەهەم ـ ئەو دایکو باوکانەی پێویستیان بە چارەسەری دەروونی هەیە.
کەسایەتی دایك و باوك ورەفتاری منداڵان ـ دایك و باوکە هەڵچوو تووڕەکان ـ دایك و باوکەدوودڵەکان ـ دایك و باوکە منداڵانییەکان ـ دایك و باوکە گومڕا کەرەکان ـ دایك باوکەمنداڵ دەرکەرەکان ـ ئەرکناسە زێدەڕۆکارەکان ـ ئەودایك و باوکانەی کە بەهۆی تەلاقەوە جیابوونەتەوە.
دواوتە .

# یاداشتی وەرگێڕی دەقە فارسیەکە

ئەو وەرچەرخانە گەورەیەی کەلە سەردەمی ئێستادا لە هەمووڵایەنەکانی زانستی مرۆیی هاتۆتە کایەوە، لەهیچ قۆناغەمێژووییەکانی دیکە ناچێت وهاوتای نییە،بۆیەکەمین جارمرۆڤ پێی ناوەتەسەرمانگ وپێشینەی بۆدەست بەسەرداگرتنێکی تەواوی بۆشایی گەردوون فەراهەم کردووە، بۆیەکەمین جار مرۆڤی مەحکوم بەمەرگی رەها توانیویەتی بەدڵی مرۆڤێکی مردوو درێژە بەژیانی خۆی بدات و بۆیەکەمین جار لەسەر تاپای رشتەکانی زانست وپیشەسازی پێشکەوتنی سەرسوڕهێنەری وەها سەری هەڵنەداوە کەگەلانی جیهان سەریان سوڕماوە لەوەی چۆن خۆیان لەگەڵ ئەم پێشکەوتنە سەرسوڕهێنەرە بگونجێنن. وچۆن بۆباشترکردنی ژیانی خۆیان لەوهەموو ریفۆرمە ئەفسوون ئامێزانە سوود وەربگرن. هیچ گومانی تێدانییە کە بنیادەم هەموو ئەو پێشکەوتنانە دەگەڕێنێتەوە بۆپیشکەوتنی پەروەردەو فێرکردن و بەهەمان شێوە هەرپێشکەوتنێك کەلەجیهانی فێرکردن وپەروەردەدا روویدات، کار لە وەرچەرخانی گشت زانستەکانی دیکە دەکات هەر بۆیەشە سەرتاپای میللەتانی پشکەوتووی جیهان چاپکردن وبڵاوکردنەوەی نووسینەگرانبەهایە پەروەردەییەکان لەپێش هەرجۆرە چاککاری و پێشکەوتنێکی فەرهەنگی دادەنێن، وهەرئەوەندە کتێبێکی پەروەردەیی وەرچەرخێنەر لەگۆشەیەکی ئەم جیهانە بڵاوبێتەوە دوودڵی لەوەرگێڕانی ناکەن بۆزمانی نەتەوەیی خۆیان تاکوهەموو چینەکانی کۆمەڵ سوودی لێوەربگرن.

وەرگێڕ شانازی بەوە دەکات کە هەموو کاتێك تێکۆشاوە چەندین کتێب وەربگێڕێتە سەر زمانی فارسی کەلایەنی وەرچەرخان و زانستی وفەرهەنگی لەخۆیەوە بگرێت وبتوانێت گۆڕانێك لەبیروباوەڕدا پەیدابکات،چونکە یەکەمین وەرگێڕبووە کە لەبواری ئەدەبەوە(فیۆدۆردیستۆفسکی) و لەبواری فەرهەنگیەوەش (جۆن دیوی) بە هاونیشتیمانیانی خۆی بناسێنێت و شاکارە گرانبەهاکانی وەك (دەروونناسی بۆهەمووان) و(کۆمەڵناسی) بخاتە بەردەستی خەڵکی وسوودی لێوەربگرن. ئەمەش زۆر جێگای دڵخۆشییە کە بەرهەمێکی وەرچەرخێنەری نوێ بەبێ قوڵبوونەوە دەتوانرێت بگوترێت لەرووی بیرۆکەی نوێ و لایەنی رێگا

وەرچەرخێنەرەکانی فێرکردن وپەروەردەدا لەجۆرێکی بێ هاوتایە.پێشکەشی دەکات بەهەموو فەرهەنگدۆست وزانستپەروەرێك.بەپێی بەڵگەسەلمێنراوەکان ئەم کتێبەباس لەچۆنییەتیی پەیوەندییەکانی دایك و باوك بەمنداڵەکانیان دەکات و , بەپرفرۆشترین کتێبی ئەمەریکا دادەنرێت لەم دەساڵەی دوایی وبۆماوەی ٦٥ هەفتە پێبەپێ لەرووی پێشوازیی گشتیەوە هەموبەرهەمەکانی دیکەی بەزاندووە کە ئەوسا لەئەمریکادا بلاوببوونەوە.

دکتۆر (حۆیم جینۆت) d.r hoim g.cindt دەروونـاس و بـەخێوکاری گەورەی ئەمەریکی بەسوود وەرگرتن لەخەڵکانی دیکەوە دۆزینەوەو پێشکەوتنی دەروونناسیی لەم کتێبە دا بۆچارەسەری ئەو گیروگرفتانـەی کەبـە گشتی لـەنێوان دایکو بـاوك لەلایەك ومنـداڵان ،لەلایـەکی دیکـەوە دێتـە ئـەنجام و زۆربـەی جـاریش دەبێتە هۆی رووخاندنی پایـەی ئاسـودەیی خانـەوادەکان وبەدبـەختی دایـك و بـاوك ومنداڵان چەندرێگایەکی نوێ ووەرچەرخێنەری پێشنیارکردووە کە بەهۆیەوەهۆکاری زۆربەی ناکۆکی وغەمور رووبەروو بوونـەوە و هەنـدێك جاریش ئـەو دژایەتییـەی کـە لـەنێوان دایـك و بـاوك ومنـداڵان روودەدات رۆشـن دەکـات وهـەوڵی لـەناوبردنی دەدات.خوێندنـەوەی ئـەم کتێبـە زۆر بەسـوودە بەتایبـەت لـە ئێـران کـە بەداخـەوە ئێستاش دەستوری فێرکردن وپەروەردەی زیانبەخشی کۆن بـرەوی پـێ دەدرێـت و بەبوونی چەندبزاوتێکی گەورەی پەروەردەییشەوە ئێستاش لـەرووی کتێبـی نـوێی پـــەروەردەیی هەژارە،بۆیـــە لەســـەرهەموو دایکـــان و باوکـــان ومامۆســـتایان پێویـستەبەجوانی بیخوێننـەوە.ئـەم کتێبـە وەکوهەموونووسینە پەروەردەییـەکانی دیکە بۆزمانی فارسی وەرگێڕدراوە. دەبێتە جێگای سـوود وەرگرتنـی زانـستخوازان وئارەزوومەندانی فێرکردن وپەروەردە.

مشفق همدانی

## چاوپێدا خشاندنێك بەڕاو بۆ چوونی ڕۆژنامە بەناوبانگەكانی ئەمریكا دەربارەی ئەم كتێبە :

(ئەوەندە ئاسان وسادە نووسراوەو ئەوەندەبیرۆكەی نوێی تێداباسكراوە دایكان و باوكان دەتوانن لە پەروەردەكردنی منداڵەكانیان وەكو ڕێنمایەكی خۆیانی دابنێن.....نووسەر بۆچارەسەركردنی كێشە دەروونییەكان سوودێكی گەورەی لەبنەما زانستییەكان وەرگرتووە)

### فامیلی لایف family life

(ئەم كتێبە لەهەموو ڕوویەكەوە شتی تازەی تێدایەو لێتێگەیشتنی ئاسانە.ڕێنماییەكان بەچەند نموونەیەكی زیندوو وباسێكی لۆژیكی ڕۆشن كراوەتەوە.خوێنەرهەست دەكات كەنووسەر بەخێوكارێكی بەتواناییەو بیرۆكەكانی دەربارەی هەمووان قابیلی ئەنجامدانەوهەموو كەسێك بەئاسانی شێوەی مامەڵەكردن و گفتوگۆ بەئاسانی لەوكتێبە فێردەبێت. ئەم كتێبە نەك هەربۆ دایكان وباوكان بەڵكو بۆهەركەسێك بەجۆرێك پەیوەندیی لەگەڵ منداڵاندا هەیە سوودمەندە. پاش خوێندنەوەی ئەم كتێبەخوێنەر وازی لێناهێنێت بەڵكو لەپایەی سەرچاوەیەكی دادەنێت بۆچارەسەركردنی مەسەلە ڕۆژانەكانی ژیان سوودی لێوەردەگرێت.

### گۆڤاری كریشن هۆم ئاند سكول

### Chrision HOMe And scool

(بەڕاستی كتێبێكی پڕبەهایە كە بەقەڵەمی پسپۆڕێكی دەروناسیی منداڵ و(ڕێنما) یەكی شارەزای دلیك و باوك نووسراوە.

### گۆڤاری توگێذە

### together

( باسەكانی ئەم كتێبە ئەوەندە لەگەڵ ڕاستی و واقیعدا دەگونجێت كەجێگای خۆیەتی گشت دایكان دەستوورەكانی ئەم كتێبە بەدیواری موبەق چەسپ بكەن وسەیری بكەن)

## ئیپیسکۆ پالیۆن
## The EPISCO Palion

( ژمارەیەکی بێ شوماری دایك و باوکان بە هۆی ئەم کتێبەوە فێری ئەوە بوونە رەفتاری دروست لەگەڵ منداڵەکانیان بکەن. دەستوورەکانی ئەم کتێبەیان پیادە کردووە. تەواوی ئەو کەسانەی کە ئێمە گفتوگۆمان لەگەڵیاندا کرد بنەما پەروەردەییەکانی ئەم کتێبەیان زۆربە بەرزی نرخاند.)

## The new york Times
## نیویۆرك تایمز

(دایکان و باوکان بۆ گەیشتن بەمەبەست سەدەها بیرۆکەی سوودمەند لەم کتێبەدا دەبیننەوە.... تارادەیەك جێگای دڵخۆشییە کەبەختێوکارێکی ئەزموونديتە بەسوودوەرگرتن لەتاقیکردنەوەو کارونموونەزیندووەکانی بەرهەمێکی ئاوا گرانبەهای هێناوەتە بوون.)

## (Christion science monitor)
## گۆڤاری کریشسنساینس مۆنیتۆر

# پێشەکی

هیچ دایك و باوکێك نییە کەسپێدە لەکاتی بێداربوونەوە لەخەو،بۆ بەدبەختیی منداڵەکەی نەخشە بکێشێت. هیچ دایکێك بەخۆی ناڵێت: (ئەمڕۆ بە هەرشێوەیەك بێت عەیب لە منداڵەکەم دەگرم و تاپێمدەکرێت سووکی دەکەم). بەپێچەوانەوە زۆربەی دایکان سەرلەبەیانیان ئاوا نەخشەدەکێشن:( دەبێت ئەمڕۆ بەئارامی بگوزەرێت. بەبێ هۆ ڕەخنە لەمنداڵەکەم ناگرم، واز لە حەوت وهەشت و دەمەقاڵێ دێنم.)) بەلام لەگەڵ بوونی ئەم نیازە پاکانەشەوە، ناکۆکی ودەمەقاڵێ لە نێوان دایك و باوك و منداڵەکانیان ڕوودەدات و دووبارە قسەی وابە منداڵەکانیان دەڵێن کە بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ بڕواو نیازی ڕاستەقینەی ئەواندا ناگونجێت. هەموو دایك و باوکان حەزدەکەن منداڵەکانیان لەئارامی وبەختیاریدا بژین. هیچ کەسێك نییەحەز بکات بەئەنقەست منداڵەکەی ترسنۆك و گۆشەگیرو بێ دیقەت وخوێنتاڵ باربهێنێت و پەروەردەی بکات. لەگەڵ هەموو ئەمانەشەوە زۆربەی منداڵان لەکاتی پێگەیشتن هەندێ تایبەتمەندی نابەجێ وەردەگرن و هەست بەئارامی ناکەن و ناتوانن ڕێگاوتایبەتمەندیەك وەدەست بهێنن کەبەهۆیەوە ڕێزلە خۆیان وخەڵکانی دیکە بگرن، ئێمە چاوەڕێی ئەوە دەکەین منداڵانمان بە تەربیەت بن بەلام بە پێچەوانەوە، بەدخودەبن. حەزدەکەین خاوێن بن بەلام خۆیان پیس دەکەن. حەزدەکەین بڕوایان بەخۆیان هەبێت بەلام هەست بەترس و نائارامی دەکەن. تێدەکۆشین ئاسوودە وشادبن بەلام دەبینین داهێزراوو بەدبەختن. مەبەستی ئەم کتێبە هاریکاری کردنی دایك و باوکانە بۆنزیك کردنەوەی مەبەستەکانی خۆیان لە مەبەستەکانی منداڵەکانیان و دۆزینەوەی ڕێگای گونجاوە بۆگەیشتن بەو مەبەستانە.ئەمڕۆدایکوباوکان ڕووبەڕووی چەندمەسەلەیەکی گرینگ و دژواربوونەتەوە کەحەزبکەن وحەزنەکەن دەبێت ڕێگای چارەسەری بۆ بدۆزنەوە. ئەوان خۆیان بەنموونەو بنەمای لەقاڵبدراوی وەك (زیاترخۆشەویستی بەمنداڵەکەت ببەخشە) یان (زیاتر ئاوڕیان لێدەنەوە) یان (زیاترهەلی دڵخۆشکردنیان پێبدەن) نابەستنەوە.نووسەر لەیازدەساڵی دواییدا بەردەوام وەك ڕێنماو دەروونناس ج بەشێوەی تاکەکەسی وچ بەشێوەی گروپی پەیوەندی لەگەڵ دایکان و باوکان لەلایەك و منداڵان لەلایەکی دیکەوە هەبووە، ئەم

کتێبە دەرەنجامی تاقیکردنەوەی ئەوماوەیەیە کە بەشێوەیەکی زۆر ئازایانە دەتوانرێت بگوترێت ئەم بەرهەمە (رێنما) یەکی کرداریەو بۆچارەسەرکردنی ئەوکێشە دەروونیانەی کە رۆژانە لەپەروەردەکردنی منداڵدا رووبەڕووی دایك وباوك و پەروەردەکاران دەبێتەوە رێنمایەکی سوودمەندو ئەرێیی دەخاتە بەردەست و جگە لەمەش رێوڕەسمێك بۆپێکەوە ژیانی دایك و باوك لەگەڵ منداڵەکانی خۆیان لەکە شوهەوایەکی پڕلە ڕێزو خۆشەویستی هاوتاو بەرانبەردا رێورەسمێك دەست نیشان دەکات.

# بەشی یەکەم
# گفتوگۆکردن لەگەڵ منداڵان

ـ مانای پرسیارەکانی منداڵان زۆربەی جار شاراوەیە.
ـ گفتوگۆی بێ بەرهەم.
ـ ڕێگای نوێی پەیوەندی کردن بەمنداڵان
ـ هەندێك لە ڕێساکانی گفتوگۆ.
ـ دووفاقی بوونی هەستەکانی منداڵ.
ـ داڕێنکردنی ئاوێنەیەك بۆ کەسایەتی.

گفتوگۆکردن لەگەڵ منداڵاندا هونەرێکی تایبەتەو بنەماو ڕەهەندو (هێما)ی تایبەتیی خۆی هەیە، قسەکانی منداڵان ساکارو سادەن بەڵکو زۆربەی پرسیارەکانیان لایەنێکی ڕەمزیان تێدایەو دەبێت بەوردی وتێبینی کردنەوە کلیلەکەی وەدەست بێت

## مانای پرسیارەکانی منداڵان زۆربەی جار شاراوەیە

ئاندی(Andy)ی دەساڵە لە باوکی دەپرسێت:(ژمارەی منداڵانی بێسەرپەرشت لەگەڕەکی هارلیم (Harlem)چەندە؟.)

باوکی کیمیاگەرێکی ڕۆشنبیرە لەوگرینگی دانەی منداڵەکەی بە مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان زۆرخۆشحاڵ دەبێت بۆیە دەربارەی منداڵانی بێ سەرپەرشت قسەدەکات ودواتریش بۆئاگاداربوونی لەکاریگەریی ڕوونکردنەوەکانی. لەرووخساری (ئاندی) ورد دەبێتەوە بەڵام (ئاندی) ئەوەندە ڕازی نەدەهاتە بەرچاوو دیسانەوە دەربارەی هەمان بابەت پرسیاردەکات:(ژمارەی منداڵانی بێ سەرپەرشت لەشاری نیویۆرك چەندە؟لەهەموونەمریکا؟) لە(ئەورووپا) لە (دونیا؟)

سەرەنجام باوکی ئاندی پاش تێبینی و بیرکردنەوەیەکی وورد بۆی ڕوونبۆوە کەگرینگی دانی منداڵەکەی بەمەسەلەیەکی کۆمەڵایەتی نییە,بەڵکو پرسیارەکەی ئەو زیاتر لایەنێکی تایبەتی وهێمایی هەیە. گرینگی پێدانی ئەوبۆ ئەم مەسەلەیە لەدڵسۆزی بۆ منداڵانی بێ سەرپەرشت هەڵنەقوڵاوە بەڵکو ترسی کەسی (خودی) ئەولەو گریمانەیەیە نەوەك ئەویش ڕۆژێك وەکو خەڵکانی دیکە بێ یارویاوەر بمێنێتەوە. ئەوحەزناکات ژمارەی منداڵە بێ سەرپەرشتەکان بزانێت بەڵکو دەیەوێت دڵارامی پەیدابکات نەوەك ڕۆژێك تەنهاو بێ دایك و باوك بمێنێتەوە.

* * *

برۆس(bruce) لەیەکەمین ڕۆژی چوونی بۆ باخچەی ساوایان. کاتێك دایکی هێشتا هەر لە تەکیەوە بوو,تەماشایەکی وێنە هەڵواسراوەکانی سەر دیوارەکەی کردوو بەدەنگێکی بەرز پرسی:(کێ ئەم وێنە ناشرینانەی کێشاوە؟)

دایکی ناڕەحەتبوو و بەنیگایەکی سەرزەنشتکارانەوە سەیری کچەکەی کردوو بەترسەوە قیژاندی:(باش نییە منداڵ وێنەی ئاوا جوان بەناشرین لەقەڵەم بدات) مامۆستا کە پەی بە مانای پرسیارەکەی (برۆس) بردبوو زەردەخەنەیەکی کردوو گوتی:(ئێرە جێگای وێنە کێشانی جوان نییە.تۆش ئەگەرحەز دەکەیت دەتوانیت

وێنەی لەم جۆرەبکێشێت.زەردەخەنەیەکی پڕ لەهەستی ڕازیبوون لەسەرلێوانی (برۆس) نیشت چونکە ئێستا کە مانای پرسیارە شاراوەکەی دۆزیەوە. مەبەستی ڕاستەقینەی برۆس ئەوەبوو کە ئەگەر منداڵێك ئاوا بەخراپی وێنەبکێشێت چی لەگەڵدەکرێت؟هەروەکات(برۆس) تایەی ئۆتۆمبێلۆکەیەکی منداڵانی هەڵگرتەوە کەلەگۆشەیەکدا کەوتبوو بەئاوازێکی خۆشەویستانەوە پرسی:(کێ ئەم تایەی لەئوتومبێلۆکەکە کردۆتەوە؟) دایکی لەوەڵامدا گوتی:(ئەمە چ پەیوەندییەکی بەتۆوە هەیە کەچ کەسێك لێی کردۆتەوە؟ خۆتۆ لێرە کەس ناناسیت؟)

ئەم جارەش مامۆستاکە لە مەبەستی برۆس گەیشت, بۆیە گوتی:(کەلوپەلی گەمەبۆ گەمەکردنە.هەندێك جار دەشکێ. ئەم جۆرە ڕووداوانە زۆر ڕوودەدەن) شوێنەواری ڕازیبوون و دڵخۆشی لە ڕووخساری (برۆس) بەدیارکەوتن.خانمی مامۆستا زۆر زانایانە زانیاریی پێویستی خستبووە بەردەستی ئەوەوە.برۆس بەخۆی گوت:(ئەم خانمە مامۆستایە ژنێکی چەند باشە!لە دەست ئەو منداڵانە تووڕە نابێت کە بەخراپی وێنە دەکێشن یان کەلوپەلی گەمە تێکدەدەن. پێی ناوێت لێی بترسم. ئێرە بۆمن شوێنێکی ئەمینە)

ئەوسا بەدڵخۆشییەوە دایکی ماچکردوو خوداحافیزیی لێکردوو بەرەولای مامۆستاکەی ڕایکرد تاکو یەکەمین ڕۆژی خۆی لەباخچەی منداڵان دەست پێبکات.

* * *

کارۆل (carol)ی دوانزە ساڵە بەچاوی فرمێسکاوییەوە هەست بە ناڕەحەتییەکی توند دەکات چونکە کچی مامی کە پشووی هاوینی لەگەڵ بەسەر بردبوو, ئێستا دەیەوێت بچێتەوە ماڵی خۆیان.ئەو ناڕەحەتیی خۆی بەدایکی پێشان دەدات:

کارۆل:ئەمڕۆ(سۆزی Susie) بەجێمدەهێڵێت و دووبارە بەتەنیا دەمێنمەوە.

دایك: گرینگ نییە هاوڕێیەکی دیکە پەیدادەکەیت.

کارۆل: تەنیایی زۆر ناخۆش و ناڕەحەتکارە.

دایك:پێیڕادێیت

کارۆل:ئاه:دایەگیان (هۆڕ هۆڕ دەگرێت) .

دایك: تۆ تەمەنت دوانزەساڵە, کەچی وەکو منداڵێکی شیرەخۆرە دەگرێیت!

(کارۆل) بەنیگایەکی سەرزەنشتکارانەوە سەیری دایکی دەکات وبەرەو ژوورەکەی خۆی دەڕوات و بەتوندی دەرگا لەسەرخۆی دادەخات.

نابێت ئەم جۆرەسکالا مندالانەیە بەوشێوەیە کۆتایی پێبێت. دەبێت زیاترگرینگی بەهەستەکانی مندالان بدرێت.تەنانەت ئەگەربابەتی ناڕەحەتییەکەشی زۆربچووک بێت.ڕەنگە لەڕوانگەی دایکەوە مەسەلەی جودابوونەوە لە هاوڕییەك پاش کۆتایی هاتنی پشووی هاوینە ئەوەندە گرینگ نەبێت کە ببێتە هۆی گریان, بەلام نابێ وەلامی دایك لەبەرانبەر غەمەکانی مندال بەوشێوەیە توند بێت. دایکێکی ئەزموونديتە و دەروونناس دەبێ شتی لەم جۆرە بەخۆی بلێت: (کارۆل ناڕەحەتە هەرکاتێك خۆم بەهاوڕیەشی غەمی بزانم ,غەمی کەمتر دەبێتەوە.) کەواتە بەشێوەیەکی دلدەرەوە بەم شێوەیەی خوارەوە وەلامی کچەکەی خۆی دەداتەوە:(هەقی تۆیە ئازیزەکەم بەبێ سۆزی تەنیادەبیت) یان (زۆر بەداخەوەم کە بەجێت دەهێلێ) یان (کاتێك مرۆڤ لەگەل یەکێك هەلسێ و دابنیشێت و هۆگری بێت جوودابوونەوە لێی زۆر سەختە) یان (بەبێ سۆزی مال لەچاوی تۆدا چۆلو هۆلە.)

ئەم جۆرە وەلامانە ئاشنایەتی و لێك نزیکبوونەوەی دایك و باوك ومندالان زیاتر دەکات. کاتێك کە مندالێك هەست بکات لەدەردەدلەکانی دەگەن, توندیی ئاستی غەموو تەنیاییەکەی کەم دەبێتەوەو, لەهەمان کاتدا زیاتر پشت بەدایکی دەبەستێ ولەجاران خۆشتریدەوێت. خۆشەویستی و سۆزی دایك مەلهەمێکە زامی دل سارێژ دەکات.

## گفتوگۆی بێ بەرهەم.

هەمیشەدایکان و باوکان لەکاتی گفتوگۆکردن لەگەڵ منداڵەکانیان هەست بە بێزاری وناڕەحەتی دەکەن چونکە زۆربەی جارگفتوگۆیەکەیان ناگاتە هیچ ئەنجامێك, ئەم گفتوگۆیانە کەموزۆر بەم شێوەیە:

ـ (دەچیتە کوێ؟)

ـ(دەرەوە).

ـ(چ کارێکت لە دەرەوە هەیە؟)

ـ(هیچ)

دایك و باوکانی دەروونناس و هۆشمەند زوو درك بەوە دەکەن کە ئەم پرسیارانە تا چ ئەندازە یەك منداڵان بێزاردەکەن, ڕۆژێك دایکێك دەیگوت:(ئەوەندە تێدەکۆشم کوڕەکەم والێکەم گفتوگۆم لەگەڵدابکات کە سەرەنجام خۆم لە تووڕەییان شێتدەبم ودەقیژێنم) بەڵام ئەوبەبێ ئەوەی بەسەرخۆی بهێنێت سەیرم دەکات.زۆربەی جارمنداڵان لەگفتوگۆکردن لەگەڵ دایکان وباوکانی خۆیان سەرسەختی پیشان دەدەن. لە ئامۆژگاری ودەرسدادان و بەتایبەت لە ڕەخنە بێزارن و هەست دەکەن کە دایکوباوکانیان زیاد لەئەندازەی دیاریکرلو(دەچنە سەر ئوانگە)

ڕۆژێك (دیڤید) david بەدایکی گوت:(بۆچی کاتێك پرسیارێکی سادەت لێدەکەم لە وەڵام دانەوە ئەوەندە درێژ دادڕی دەکەیت) لەم بارەیەوە جارێك (دیڤید) لەلای هاوڕێیەکەی دانیپێدانا کە:(هیچ کاتێك شتێك بە دایکم ناڵێم, چونکە ئەگەر سەرە داوی گفتوگۆی بدەمە دەست ئیدی بۆ گەمەکردن کاتێکی وام بە دەستەوە نامینێت)

هەرکاتێك بینەرێکی ووردبین گوێ لە گفتوگۆی دایکێك یان باوکێك ومنداڵەکەی بگرێت,بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە بۆی ڕووندەبێتەوە کە هیچ یەکێکیان بەوجۆرەی کەپێویستە ئاگایان لە قسەکانی یەکتری نییە وگوێ لە یەکتری ناگرن و وەکو ئەوەیە کە هەرکەسەو بۆخۆیان قسە بکەن. واتا یەکێك بەردەوام ڕەخنە دەگرێت وئامۆژگاری دەکات وئەوەی دیکەش دانپێدانانێت و پاساو دەهێنێتەوە.بێ بەرهەمیی ئەم پەیوەندییانە لەکەمیی خۆشەویستی و تێکنەگەیشتنەوە نییە

بەڵکوزیاتر لەئەنجامی بێڕێزی ونەشارەزاییەوەیە. زوبانی ڕۆژانەی ئێمە بۆدۆزینەوەی پەیوەندییەکی ئاقڵانەو پێگەیشتووپڕ لە کەموکوڕییە.بۆگەیشتن بەگیانی منداڵان و ڕێگەگرتن لە ڕوویەڕووبوونەوەو دەمەقاڵێ پێویستمان بەڕەوشێکی نوێی پەیوەندی وگفتوگۆهەیە.

## ڕێگای نوێی پەیوەندیکردن لەگەڵ منداڵان:

ڕێگای نوێی پەیوەندی کردن بەمنداڵان لەسەر بناغەی ڕێزگرتنێکی هاوتاو یەکسان وشارەزاییەوەیە.پیادەکردنی ئەم ڕێگایە پێویستی بەلەبەرچاوگرتنی ئەم بنەمایانەیە:

١. دەبێ لەهەرگفتوگۆکردنێکداعیزەتی نەفس و ڕێزی دایکوباوك ومنداڵ بەشێوەیەکی یەکسان لە بەرچاوبگیرێت.

٢. لە پێش دۆزینەوەی (باش تێگەیشتن) ی دوولایەنە دەبێ لەهەر جۆرە ئامۆژگاری ودەرسدا دانێك دووربکەوینەوە

* * *

(ئێریك eric)ی تۆساڵە تووڕەو ڕەنجاو دەچێتەوە ماڵەوە, چونکە بڕیار وابووە لەگەڵ هاوڕێیانی بچێتە سەیران کەلە پڕێکدا بارانێکی بەخوڕ دەبارێت وبەرنامەکەیان لێ تێکدەچێت, ئەمجارە دایکی هەوڵ دەدات لەجیاتی بەکارهێنانی چەندرستەیەکی کلاسیکیی هەمیشەیی وەك:(نەچوون بۆسەیران لەڕۆژێکی بارانیدا ناڕەحەتی ناوێت) یان (ئەو ڕۆژانەش دێن کەخۆر لەدەرەوەبێت تاکوبچیتە سەیران), یان (خۆمن نەمگوتووە باران ببارێت بۆچی بەبێ هۆ ڕووت لەمن گرژکردووە), بۆهێمن کردنەوەی کوڕەکەی ودەرهێنانی لەو تووڕەییەی کەتێیکەوتووە ڕێگایەکی نوێ وئاقڵانەتری بەکارهێنا بە تایبەت کەڕێگا کۆنەکە جگە لە خۆشکردنی ئاگری ڕەق وتووڕەیی منداڵەکەی کاریگەریی دیکەی نییە, ئەمجارە بەخۆی دەڵێت: (چونکە کوڕەکەم نەیتوانیووە ، بچێتە سەیران زۆر تووڕەو ڕەنجاوەو بەپیشاندانی تووڕەیی وڕق دەیەوێ ناڕەحەتیی خۆی پیشانی من بدات ، زۆر هەستیارو خۆخۆرە. بەڕای من ئەگەر زیاتر گرینگی بەهەست و سۆزەکانی بدەم ناڕەحەتییەکەی کەمتردەبێتەوە), بۆیەئەم قسەیە بەئێریك دەڵێت:

دایك: زۆر تووڕەیت؟

ئیریك: بەڵێ.

دایك: زۆرت حەزدەکرد بچیتە سەیران وانییە؟

ئیریك: ڕاستە

دایك: کە باران باری لەگەڵ هاوڕێکانت هەموو شتێکتان ئامادە کردبوو؟

ئیریك: لەهەموو ڕوویەکەوە ئامادەی ڕۆیشتن بووین.

دایك: زۆر بەداخەوەم.

ساتێك بێدەنگی دروست دەبێت وپاشان (ئیریك) دەڵێت:

(ئەوەندەش گرینگ نییە,ئەو ڕۆژانەی کەخۆر لەدەرەوەیە یەکجار زۆرن) هەروەکوبڵێی نارەحەتییەکەی بەهۆی ئەم گفتوگۆیەوە نەما. تاکۆتایی ڕۆژەکە بەئارامی ڕەفتاری لەگەڵ دایکیداکرد. بەگشتی کاتێك (ئیریك) بە ڕقەوەدە هاتەوەماڵەوە دۆودۆشاوی تێکەڵ دەکردوو درەنگ یان زوو لەگەڵ یەکێك لەئەندامانی خانەوادەکەی بەشەڕ دەهات و تادرەنگانی شەو ئارامی لەئەندامانی ماڵەوە هەڵدەگرت.

لایەنی سەرنجڕاکێشی ئەم جۆرە مامەڵە ئاقڵانەیەی دایکی (ئیریك) کامەیەو, چۆن بەو ڕەفتارەی توانی بەسەر ڕق وتووڕەیی منداڵەکەیدا زاڵبێت.؟ کاتێك منداڵ دەکەوێتە نێو شەپۆلی سۆزی توندو شکێنەرەوە ناتوانێت گوێ لەقسەی هەق وراست رابگرێت. ئامۆژگاری یان قسەی دڵدەرەوەو رەخنەی لۆژیکی قبوڵ ناکات, بەڵکو چارەڕێیە درك بە بارودۆخەکەی بکەین. ئەوحەزدەکات لەو ساتێکی وەهادا بەشێوەیەکی تایبەتی ئاگامان لە دەردەدڵەکانی بێت و بەتایبەت چارەڕوانە بەبێ ئەوەی دەروازەی دڵی بەتەواوی بۆئێمە بکاتەوە پەی بەدەروونی ببەین. لە راستیدا لەگەڵ ئێمە دەست بەجۆرە گەمەیەك دەکات کە لەوێدا دەوری ئێمە ئەوەیە تەنیا بەتێبینی بەشێك لەنیشانەکانی نارەحەتییەکەی تەواوی نارەحەتییەکانی پێشبینی بکەین و بەجوانی درکی پێبکەین.

کاتێك منداڵێك دەڵێت:(مامۆستا لێیداوم)، هیچ پێی ناوێ داوای ڕوونکردنەوەی زیاتری لێبکەین یان قسەی ئاوای پێ بڵێین:(چ کارێکت کردکە لێت درا؟ هەڵبەتە

کارێکی بەدتکردووە بۆیە مامۆستا لێی دلویت.بلێ بزانم چ کەتنێکت کردووە؟).
هەروەها نابێ پێی بلێیت:(ئاه چەند بەداخەوەم)دەبێت بۆی بسەلمێنیت کەدرک بەئازارو نارەحەتی وهەستی تۆلەسەندنەوەکەی دەکەین.ئێمە لەکوێوە پەی بە هەستەکانی ببەین؟ سەیری دەکەین و زۆربە وردی وگرینگی پێدانەوە گوێ لەقسەکانی دەگرین و لەهەمان کاتدا چاو بەو تاقیکردنەوانەی خۆماندا دەخشێنینەوەکاتێ خۆمان لەرابردوودابەحاڵەتێکی هاوشێوەی حاڵەتی ئەو رووبەروو بووینەتەوە وپێەوە گرفتاربووینە،بەزوویی بۆمان روون دەبێتەوە کە ئەومنداڵەی لەبەرانبەر هاوپۆلانی خۆی سووك ورەنجاوبکرێت چی بەسەردێت و لەئەنجامدا بەشێوەیەك قسە دەکەین منداڵەکە درك بەوە بکات کەئێمە بەوشێوەیەی دەبێ وپێویستە (پەی) مان بەدەردەدڵی ئەوبردووە لەم بارەیەوە هەریەك لەم رستانە زۆرگونجاوو کاریگەرن: (هەڵبەتە زۆرنارەحەت بوویت!)، یان (بێگومان تووڕەبوویت)، یان (هەڵبەتە لەوساتەدا زۆر ڕقت لە مامۆستا بۆوە)، یان (مامۆستا بەوکارە هەستی تۆی بریندارکردووە) یان( سەیرە رۆژێکی خراپت بەسەر بردووە!).
کاتێك بەمنداڵ دەڵێیت:(نابێ بەو ئەندازەیە هەستیاربیت!) یان (هیچ ماقوڵ نییە بۆئەم شتەبێ مانایە ئەوەندەخۆت نارەحەت بکەیت!)ئەوەندەکاریگەریی لەسەرکەمکردنەوەی سۆزو هەڵچوونە توندەکەیدا نییە. بەقەدەغەکردنی منداڵان لەخۆبەدەستەوەدان لە بەرانبەر ڕەنجان وتووڕەبوونە توندەکان هیچ شێوەکۆمەکێك بۆلابردن ونەهێشتنی ئەم رەنجان وتووڕەییە ناکەین، بەڵکوتەنیا بەپیشاندانی دڵسۆزی وخۆبە هاوبەش زانین لەغەموو رەنجان ونارەحەتییەکانی منداڵان دەتوانین تا (رادەیەك) توندیی نارەحەتییەکانیان کەم بکەینەوە.
ئەومەسەلەیەتەنها دەربارەی منداڵان راست نییە بەڵکودەربارەی گەورانیش لەهەموو رووبەکەوە راستەو بۆ روونکردنەوەی زیاتری ئەم مەسەلەیە زۆر بەجێیەکە بەشێك لە(لێکۆڵینەوەیەکی کۆمەڵایەتی) کەلەژێرسەرپەرشتی مامۆستایەکی دەروونناس ئەنجامدراوە بەنموونە بهێنینەوە.
مامۆستا: وابهێنەپێش چاوت یەکێك لەورۆژە سەختانەیە کەچەرخی رۆژگار لەهەموو رووبەکەوە چەپگەردەوپێچەوانە دەخولێتەوە. زەنگی تەلەفۆن لێدەدات

ورقیژەوهاواری مندالآن بەرزبۆتەوەو ,ئاگات لەقاوەی سەر ئاگر دەبڕێت و قاوەکەهەڵدەچێت وتەباغەغازەکە پیس دەکات هەمووکاتێك لەساتێکی ئاوادا مێردەکەت بەتووڕەیی سەیری قاوەهەڵچووەکە بکات وپاشان بە گازاندەکردنەوەبەتۆبڵێت:(ئاخرئەوەچەندین جارەقاوەهەڵدەچێت؟) تۆلەبەرانبەر ئەم گازندەیە چ کاردانەوەیەك پیشاندەدیت؟

خانم ئەلف: قاوە گەرمەکە بە دەموچاویدا دادەکەم.

خانم با: پێیدەڵێم: (قۆڵی مۆبارەکت لێ هەڵماڵەو بۆ خۆت لێی بنێ).

خانم جیم: (ئەوەندە ناڕەحەت دەبم تاکو گریان دەمگرێت).

مامۆستا: ئەم جۆرە قسەیە لەدڵی ئێوەدا چ هەستێك دروست دەکات؟.

خانمەکان بەیەکەوە: ڕق، بێزاری، دڵڕەنجان.

مامۆستا: ئایا ئەوەندە ئەعسابت ساردە کەدووبارە قاوە لێنێیتەوە؟

خانم ئەلف: تەنیا بەمەرجێك کە برێك ژەهری تێبکەم ودەرخواردی مێردەکەمی بدەم.

مامۆستا: کاتێك کە مێردەکەت ڕۆیشت, دەتوانیت وەکو جارانماڵەوە پاك بکەیتەوە؟

خانم ئەلف: نەخێرسەرتاپای ئەو ڕۆژەم لێ تاریك دەبێت.

مامۆستا: ئێستا باوای دابنێین لەهەمان باری یەکەم.کاتێ مێردەکانتان سەرنجیان دەچێتە سەرهەڵچوونی قاوەکە پێتان دەڵێن:(ئازیزم! بەراستی ئەمڕۆگرفتار بوویت! لەلایەك قیژەوهاواری مندالآن و، لەلایەکی دیکەشەوە زەنگی تەلەفۆن، ئێستاش قاوەکەڕژاو بووە ئاردی نێودرك.ئەوکاتەچ کاردانەوەیەك پیشان دەدەیت.؟

خانم ئەلف: ئەگەرمێردەکەم بەم شێوەیە قسەبکات لەخۆشیان پەڕوباڵ دەگرم.

خانم با: "زۆر چێژ وەر دەگرم.

خانم جیم: ئەوەندە خۆشحاڵدەبم کەبەبێ دواکەوتن بۆلای رادەکەم و کوڵمەکانی ماچ دەکەم.

مامۆستا: ئەی قیژەو هاواری مندالآن، ئەدی قاوەکە بەتەواوی تەباخە غازەکەی خراپ کردووە؟

ژنان بەیەکەوە: ئەوانە هیچ گرینگ نین.
مامۆستا: جیاوازی ئەم کاردانەوەیەی ئێوە لەگەڵ کاردانەوەی دووەم لەچیدایە؟
خانم با:: چونکە مێردەکەم رەخنەم لێناگرێت و بەپێچەوانەوە هاوسۆزی پیشان دەدات و دەبینم لەگەڵ مندا ناکۆك نییە, هەست بەدڵەڕەوەریی ئەودەکەم.
مامۆستا: کاتێك مێردەکەت چووە سەر کاری خۆی,ئایا پاککردنەوەی ماڵەوە بۆتۆ دژوارە. خانم جیم:نەخێر!بەدڵێکی خۆشتروگوڕانی گوتنەوە بەرێککارییەکی پڕلەجموجۆڵ کارەکانم ئەنجام دەدەم.
مامۆستا: ئێستا بوارم پێبدەن دەربارەی جۆری سێیەمی مێرد قسەبکەم. مێردەکانتان بەنیگایەکی داخدارانە سەیری قاوە هەڵچووەکەدەکەن و پێتاندەڵێن: ئازیزم!لێبگەڕێ باپێت پیشان بدەم کە دەبێ چۆن قاوە لێبنرێت کە بەبێ هۆ خراپ نەبێت.
خانم ئەلف: ئاه!نەخێر ئەو لەمێردی جۆری یەکەم خراپترە,چونکە دەبەنگی خۆم بەلاچاوردا دەداتەوە
مامۆستا: ئێستا مۆڵەتم بدەن تابەیەکەوە سەیر بکەین ئەم سێ جۆرە ڕەفتارە لەشێوەی رەفتاری ئێمە بەرانبەر بەمندالآن تاچ ئەندازەیەك قابیلی ئەنجام دانە؟
خانم ئەلف: دەزانم دەتەوێ چ ئەنجامێك بەدەست بهێنیت. من هەمیشە بەکوڕەکەم دەڵێم:(ئێستا تۆ بەپێی پێویست گەورەیت کەئەم شتەبزانیت). زۆربەی جار لەجیاتی ئەوەی ئارامی بکەمەوە تووڕەتری دەکەم.
خانم با:: من هەمیشە بەکوڕەکەم دەڵێم: (ئازیزم لێگەڕێ پێت پیشان بدەم کەفلآنە کاردەبێ چۆن ئەنجام بدرێت؟
خانم جیم: ئەوەندە رەخنەیان لێگرتووم رەخنە گرتن لەلای من بۆتە شتێکی ئاسایی, من دەربارەی منداڵەکانم هەرئەو قسانە بەکاردەهێنم کەدایکم لەکاتی منداڵیمدا بەرانبەر بەمن بەکاری دەهێناو هەمیشە لەبەر ئەو قسانەی ڕقم لێی دەبۆوە من هیچ کاتێك ئەوکارەی بەوشێوەیەی دەبوایە ئەنجام بدرابوایە ئەنجامم نەداوەو لەهەموو کارێك رێنمایی دەکردم.
مامۆستا: تۆش هەمان ئەو قسانە بەرانبەر کچەکەت بەکاردەهێنی؟

خانم جیم: بەڵێ! هەڵبەتە خۆم دەزانم ڕێگایەکی ڕاست نییەو خۆشم لەم بارەیەوە ڕەخنەم لەخۆم گرتووە.
مامۆستا:ئایا بۆگفتوگۆکردن لەگەڵ منداڵەکانت بەدوای ڕێگایەکی نوێدا ناگەڕێیت؟
خانم جیم: بەڵێ بەدوایدا دەگەڕێم.
مامۆستا: ئێستا مۆڵەتم بدەنێ لەچیرۆکی هەڵچوونی قاوەکە ئەنجامێك وەدەستبهێنم. چ هۆکارێك دەبێتەهۆی ئەوەی کەهەستی (نەشیاو وقێز هەڵسێن) ونەخواستراو بۆ خۆشەویستی و وابەستەیی بگۆڕێت؟
خانم با::ئەوەیە کە کەسێك پەی بەدەردەدڵ و سۆزت ببات.
خانم جیم: بەبێ ئەوەی ڕەخنەت لێبگرێت.
خانم ئەلف: بەبێئەوەی ڕێگای ڕاستت پێ نیشان بدات. ئەم کورتە باسە بەباشی کاریگەریی قسە لەپەیداکردنی رکابەرییەتی وناسوودەیی پیشان دەدات. ئەنجامی ئەم چیرۆکە ئەوەیە وەڵامەکانی ئێمە کە(بەگشتی لەقسەوە هەست پێدەکرێت) لەگۆڕینی کەشو هەوای ماڵدا کاریگەریی زۆری هەیە.

## هەندێ بنەمای گفتوگۆ لە ڕووداوەوە بۆ پەیوەندییەکی قووڵ

کاتێك منداڵ دەربارەی ڕووداوێك پرسیار دەکات ویان شتێك دەربارەی ڕووداوێك دەزانێت زۆربەی جار باشترە ڕاستەوخۆ ئاماژە بەڕووداوەکە نەکرێت,بەڵکو دەبێت دایك و باوك زیاتر جەخت لەسەر لایەنی مرۆیی ئەو ڕووداوە بکەنەوە.
فلۆرا (FLORA) کە تەمەنی ٦ ساڵە, گلەیی لەدایکی دەکات کە بۆچی برا گەورە ترەکەی زۆرتر دیاری وەردەگرێت. دایکی نکوڵی لە گلەییەکەی ناکات هەروەها دەربارەی ئەوەی کەبرای فلۆرا گەورەترەو مافی ئەوەی هەیەزیاتردیاری وەربگرێت درێژدادڕی ناکات, هەروەها بەڵێنیش نادات ئەو نایەکسانییە هاوسەنگ بکاتەوە, بەڵکو زۆر باش دەزانێت منداڵان زیاتر گرینگی بەوە دەدەن کە ئاخۆدایك و باوکیان

چەندیان خۆشدەوێن و لە ناوەوە ژمارە وئەندازەی دیاری لەلای ئەوان ئەوەندە گرینگ نییە. بۆیە دایك بەبێ هیچ شێوە پێشەکیەك دەپرسێت:(ئەزیزم تۆش دیاریی زیاترت دەوێت؟). دواتر زۆرخۆشەویستانە کیژۆڵەکەی لە باوەش دەگرێت وزەردەخەنەیەکی ڕازیبوون ودڵخۆشانە دەکەوێتە سەرلێوانی (فلۆرا) ئەو رستە کورتە کۆتایی بە گفتوگۆیەکە هێناکە رەنگبوو ببێتە حەوت و هەشت ودەمەقاڵێیەك و دەرنجامێکی داخدارانەی لێبکەوتبایەوە.

## لە ڕووداوەوە بۆهەستەکان

کاتێك کەمنداڵێك ڕووداوێك دەگێڕێتەوە هەندێ کات وباشترە لەکاتی وەڵامدانەوەی ئاماژە بەخودی ڕووداوەکە نەکرێت, بەڵکو زیاتر ئەو هەستانە لەبەرچاو بگیرێن کە پەیوەندی بەڕووداوەکەوە هەیە.

گلۆریا(CLORIA) کە تەمەنی حەوت ساڵە بەپەرێشانی وناڕەحەتیەوە لەقوتابخانە دەگەڕایەوە بەئاوازێکی سەرزەنشت ئامێزانە روونیکردەوە کەچۆن ژمارەیەك لەکوڕانی بچووك (دۆری)ی (DORI)کچە گۆشەگیرەکەی هاوڕێیان فڕێ داوەتەنێوچڵکاوو تەڕیانکردووە. لەجیات ئەوەی دایکی لەبارەی ڕووداوەکە روونکردنەوەی زیاتری لێبخوازێت,لە بارەی ڕووداوەکەوە رەچاوی هەستی کچەکەی کردو گوتی: (هەڵبەتە لەبینینی ئەم دیمەنە ناڕەحەت بوویت و ڕقت لەو منداڵانەش دەبێتەوە کە ئەم کارەیان کردووە؟ ئایا ئێستاش بەرانبەر ئەوان هەست بەتووڕەیی دەکەیت؟ (گلۆریا) وەڵامی تەواوی ئەم پرسیارانەی بەبەڵێ دایەوە. بەڵام کاتێك کە دایکی لێی پرسی:(ئایا لەوە دەترسیت هەمان گاڵتەش لەگەڵ تۆدا ئەنجام بدەن؟), گلۆریا بەتۆنێکی ئازایانەوە گوتی: (ئەگەر ئازان ئەم گاڵتەیە لە بەرانبەر مندا دووبارە دەکەنەوە! لەگەڵ خۆم دەیانخەمە نێو ئاوو هەموویان وەکو مشکی تەڕ لێدەکەم).

گلوریا خۆشی کاتێك ئەم دیمەنەی هاتەبەرچاو قاقاپێکەنی و بەم شێوەیە گفتوگۆیەکی زۆرباشترلەوێنمایە بێجێیانە کۆتایی هات کەهەندێ دایك زۆربەی جارلەحاڵەتی وەك ئەوەی گلۆریادا ئامۆژگاری منداڵەکانیان دەکەن کە چۆن بەرگری لەخۆیان بکەن وئاگایان لە خۆیان بێت گاڵتەی لەم جۆرەیان لەبەرانبەردا

نەکرێت.بۆیە کاتێك منداڵێك لەکاتی گەڕانەوە بۆماڵەوە, دەردەدڵ لەدەست هاوڕێکەی یان مامۆستاکەی یان بارودۆخی ژیانی خۆی دەکات. لەجیاتی ئەوەی لێکۆڵەرەوانەو پشکێنەرانە بۆچۆنییەتیی رووبەڕووبوونەوەی رووداووپێشهاتەکان مامەڵەی لەگەڵدابکرێت ورێنمایی بکرێت دەبێ زیاتر جەخت بکرێتە سەر ئەو هەستانەی کە پەیوەندییان بە رووداوەکەوە هەیە .

هارۆڵد(HAROLd) کە تەمەنی(١٠) ساڵە بە بۆڵەبۆڵ وتووڕەییەوە هاتەوە ماڵەوەو دەستی بەسکاڵاکردن کرد: (ئای ئەوە چ ژیانێکە کاتێك بە مامۆستاکەمم گوت نوسینەوەکانم لە ماڵەوە بەجێهێشتووە, باوەڕی نەکردوو بە درۆزنی لە قەڵەم دام!هەرایەکی وای لەگەڵمکرد وەکو ئەوەی تاوانێکم کردبێ! دەیگوت نامە بۆ ئێوە دەنووسێت.)

دایك: رۆژێکی خراپت بەسەر بردووە؟

هارۆڵد: ئەو پەڕی خراپی.

دایك: بێگومان زۆر ناڕەحەتبوویت لە وەی کە لەپێش هاوڕێکانت تۆی بە درۆزن لە قەڵەم داوە!

هارۆڵد: وایە ناڕەحەت بووم!

دایك: هەڵبەتە لە دڵی خۆتدا چەند جنێوێکیشت پێداوە!؟.

هارۆڵد: ئەریَ وەللا! بەلام تۆ چۆنت زانی!؟.

دایك: چونکە وەکو باوە کاتێك کەسێك ئازارمان دەدات ئەم کارە دەکەین.

هارۆڵد: بەم شێوەیە مرۆڤ دڵی ئارام دەگرێت.

لەگشتەوە بۆبەش: ـ کاتێك منداڵێك باس لەخۆی دەکات و, را وەردەگرێت زۆربەی جار باشترە بە(ئەشهەدوبیللا) وەلامی نەدرێتەوە, بەڵکو دەبێت جەخت لەسەر بەشەکانی ئەو بابەتە بکرێتەوە کە جێگای گرینگی پێدانی منداڵەکەیە تاکو زانیاریی منداڵەکە دەربارەی خۆی زیاد بکات.

کاتێك منداڵێك دەڵێت: (لەبیرکاریدا باش نیم) هیچ سوودی نییە کەپێی بڵێین (راستە تۆلە بیرکاریدا باش نیت) وهەروەها هیچ ئەنجامێك بە دەست ناهێنێت,ئەگەرهاتوو باس لەبیروڕای ئەویکەین یان ئامۆژگاری لەم جۆرەی بکەین: (ئەگەرزیاتر

بخوێنێتەوە باشتر دەبێت)، ئەم جۆرە رادەربڕینە خێرایانە هەستی پشتبەخۆبەستن ویاوەڕبەخۆبوونی منداڵەکە لاواز دەکات و زیانی پێ دەگەیەنێت ،کاتێك منداڵێك بیروڕایخۆی دەردەبڕێت ودەڵێت: (لەبیرکاریدا زۆرباش نیم)، دەتوانرێت بەیەکێك لەورستانەی خوارەوە وەڵام بدرێتەوە کەبەبێ شك کاریگەرییەکی فراوانی لە کەمکردنەوەی ناڕەحەتیی ئەوەدا دەبێت،واباشە بەم شێوەیە وەڵامی بدرێتەوە: ((ئەزیزم! دەبێ تۆ بزانێت کە بیرکاری خۆی وانەیەکی ئاسان نییەو بۆ هەر قوتابییەك کەم و زۆر گرفتی تێدایە) یان ((زۆربەی مەسەلە بیرکارییەکان زۆربە زەحمەت دەتوانرێ درك بکرێت))، یان((هیچ مامۆستایەك ناتوانێت بەرەخنەگرتن گرفتی قوتابی چارەسەربکات))، یان ((مەرج دەکەم کە هەمیشە لەسەر ئاو و ئاگریت تاکو وانەی بیرکاری تەواو دەبێت)) یان((کاتێك زەنگ لێدەدرێت بەڕای من هەناسەیەکی دلخۆشانە هەڵدەکیشیێ)، یان (قۆناغی تاقیکردنەوە بۆتۆ قۆناغێکی دژواردەبێت))، یان (دەڵێی لەترسی کەوتن زۆرناڕەحەتی))، یان(تۆناڕەحەتی لەوەی کەئاخۆئێمە چ بیرێکمان دەربارەی تۆ بەمێشك دادێت))، یان(تۆدەترسیت کە ئێمە ناڕەحەت بین)) یان((ئێمەدەزانین هەندێ لەوانەکان ئەوەندەئاسان نین) یان(ئێمە بڕوادارین کەتۆ کۆششی خۆت دەکەیت).

منداڵێکی تەمەن (١٢) ساڵان نمرەی زۆرخراپی هەبوو، لەبەرئەوەی هەرچەندە باوکی ئاگاداربوو کەکەوتووە بەڵام رووی لێگرژنەکردبوو، بەبێچەوانەوەدڵی دابۆوەو بڕوای خۆی وا دەربڕیبوو کەمنداڵەکەی زیرەکە.منداڵەکەخۆی دەخواردەوە بەتووڕەییەکی زۆرەوە بە هاوڕێیەکەی دەگوت:(من زۆر ئازار دەچێژم چونکە باوکم باوەڕێکی بێهوودەی بە زیرەکیم هەیە.) زۆرجار روودەدات کەکچێك یان کوڕێك لەلای دایکی یان باوکی سکاڵا لەبێ توانایی خۆی دەکات و دەڵێت:(بەڕاستی زۆردەبەنگم)، لەم حاڵەتانەدا باوکەکە زۆر باش دەزانێت کە منداڵەکەی بەهیچ شێوەیەك دەبەنگ نییە. بۆیە هەوڵ دەدات دڵی بداتەوەو بۆی بسەلمێنێ کە بەپێچەوانەوە کوڕێك یان کچێکی زیرەکەو زۆربەی جار گفتوگۆیەکی لەم شێوەیەی خوارەوە لەنێوانیاندا ڕوودەدات:

کوڕ: من زۆر دەبەنگم!

باوك: نا! تۆ دەبەنگ نیت.

کوڕ: با ! زۆریش دەبەنگم!

باوك: نا !دەبەنگ نیت!ئایا لەبیرتە کە مامۆستا دەیگوت چەندە کوڕێکی زرنگیت؟

کوڕ: شتی ئاوای بەمن نەگوتووە.

باوك: خۆی بەمنی گوت.

کوڕ: ئەی کەوڵتە بۆچی بەردەوام بەدەبەنگم لەقەڵەم دەدات؟

باوك: لە خۆشەویستیانە, گاڵتەت لەگەڵدا دەکات.

کوڕ: نەخێر!من زۆر دەبەنگم! سەیری نمرەکانم بکە.

باوك: ئەوەندە بەسە کەمێك خۆت ماندوو بکەیت.

کوڕ: هەوڵی خۆم داوە هیچ ئەنجامێکی نییە لەبنەڕەتەوە هەرمێشکم نییە!

باوك: زۆر بەمێشکیت من خۆم دەزانم.

کوڕ: من دەبەنگم! باش دەزانم.

باوك: (بەپەرێشانی و تاقەت چوونەوە) گوتم دەبەنگ نیت!

کوڕ:دەبەنگم! دەبەنگم!

باوك:تۆ دەبەنگ نیت! هەی دەبەنگ!.

کاتێك منداڵێك دەڵێت کە بێهۆش یان ناشرین و بێ توانایە هیچ بەڵگەیەکی لۆژیکیی ئێمە ناتوانێ ئەو باوەڕەی بگۆڕێت.کاتێك کەباوەڕێك لەکەسێکدا جێگیر بوو بێت وڕەگی داکوتابێت, بەدەگمەن دەتوانرێ بەشێوەی راستەوخۆ بگۆردرێت. چونکە کوڕێك لەگفتوگۆیەکی درێژدا دەربارەی ئەم مەسەلە تایبەتە بەم شێوەیە بەباوکی گوت:(باوکە دەزانم کە تۆ لە خۆشەویستیانەوە بەم شێوەیە قسەلەگەڵ مندادەکەیت. بەو ئەندازەیەش دەبەنگ نیم کە گوفتارەکانی تۆدەربارەی ئەوەی کەقوتابییەکی زیرەکم قبوڵ بکەم.),کاتێك کەمنداڵێك بەرانبەر بەخودی خۆی رایەکی خراپی دا. بەبەدرۆخستنەوەی و نارەزایی ئێمە ئەوەندە کاریگەریی لەگۆڕانی باوەڕی ئەودا ناکەین. بەڵکو بە پێچەوانەوە باوەڕی ئەو زیاترو زیاتر جێگیر دەکات, باشترین کۆمەکی ئێمە بۆ منداڵەکە ئەوەیە پێی پیشان بدەین کەنەك تەنیادرك بە هەستە گشتییەکانی دەکەین بەڵکو لە شوێنەوارو کاریگەریی ئەوهەستانەش ئاگادارین:

کوڕ: خودایە ! چەند زەینکوێرم!
باوك: (بە ئاوازێکی جدی)!ئایا بەراستی باوەڕت لەسەر خۆت بەم شێوەیە؟, پێت وانییە بە پێچەوانەوە کوڕێکی هۆشیاربیت؟.
کوڕ: بە هیچ شێوەیەك!
باوك: کەواتە لەم بارەیەوە گیانت زۆر بە ئازارە؟
کوڕ: وایە.
باوك: لە قوتابخانەدا هەمیشە گرفتاریت ودڵەخورپەتەو دوودڵیت ودەترسیت نەوەك بکەویت یان نمرەی کەم بەدەست بێنێت , ئەو کاتانەی مامۆستا بانگت دەکات سەرت لێ دەشێوێت بۆ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەی بدەیەوە ئەوەندە هەست بە شکستەیی خۆت دەکەیت وەڵامی هەڵەی دەدەیتەوەو دەترسیت بەقسەکانت پێبکەنن و یان مامۆستا رەخنەت لێ بگرێت وقوتابییەکان پێت پێبکەنن,بڕوای تەواوم هەیە کەزۆربەی کاتەکان وا بەباشتر دەزانیت هەر هیچ شتێك نەڵێیت, پێم وایە ئەوحاڵەتانەت وەبیردێتەوە کە لەرابردوودا پێت پێکەنیون, لەم حاڵەتانەدا سەدا سەد خۆت بەدەبەنگ دەزانیت و زۆر تووڕەو پەرێشان دەبیت. (لێردا ڕەنگە منداڵ هەندێك تاقیکردنەوەی ڕابردووی خۆی باس بکات.)

باوك: کوڕم جوان گوێبگرە!بەڕای من تۆ کوڕێکی زیرەکیت وەلێ خۆت بڕوایەکی دیکەت هەیە!, ڕەنگە ئەم گفتوگۆیە لە گۆڕینی بڕوای منداڵ بەرانبەر بەخۆی کاریگەریەکی یەکسەری نەبێت, بەڵام ئەوەندەش دوورنییە ڕەگی گومان و دوودڵی لە زەینیدا هەڵبکێشێت. ڕەنگە لەو نموونەیەی باسمان کرد شتێکی ئاوا هەڵکرێنێت: (هەموو کاتێك باوکم درك بە من دەکات و من بەهۆشیار دەزانێت. ڕەنگە ئەوەندەش پشتگوێ خرلو نەبم کە تەسەوری دەکەم. ئەو ئاشنایەتی و لێك نزیکبوونەوەیەی کەگفتوگۆیەکی وا دەیهێنێتەکایەوە ڕەنگە زیاتروزیاتر منداڵەکە والێ بکات پشت بەبڕوای باوکی ببەستێت. کاتێك منداڵێك دەڵێت:(من هەرگیز چانسم نەبووە) هیچ جۆرە بەڵگەو روونکردنەوەیەك ناتوانێت بڕوای بگۆڕێت, لەبەرانبەر هەرحاڵەتێکدا باسی هەرجۆرە بەختیارییەکی بۆبکەین,دووحاڵەتی بەدبەختیمان بۆباس دەکات کە بەسەری هاتووەو بەلاچاومان دادەداتەوە تەنیا ئەو کارەی کە

لەدەست ئێمەدێت ئەوەیە پێی پیشان بدەین تاچ ئەندازەیەك ئەو درك بەو هەستانەی دەكەین كە بۆتەهۆی ئەوەی ئەو بڕوایانەی لەلا دروست بێت:

كوڕ: من بەهیچ شێوەیەك چانسم نییە.

دایك: بەراستی بڕوات وایە؟

كوڕ: ئەریَ وەڵلا.

دایك: كەواتە كاتێك گەمەیەك دەكەیت هەڵبەتە بەخۆت دەڵێیت:(من نایبە مەوە من هەرچانسم نییە.)

كوڕ: بەڵیَ! هەمیشە ئاوا بیردەكەمەوە.

دایك: كاتیَ لەقوتابخانەدا وانەكانت بەباشی دەزانیت هەڵبەتە بەخۆت دەڵێیت:(ئەمڕۆ مامۆستا بانگی من ناكات.)

كوڕ: ئەریَ وەڵلا.

دایك: بەپێچەوانەشەوە,كاتێك وانەكانت نازانیت وابیر دەكەیتەوە كە:(هەڵبەتە ئەمڕۆ بانگم دەكات.) دڵنیام دەتوانی لەم بارەیەوە چەندین نموونەی دیكەشم بۆ بهێنیتەوە.

كوڕ: وایە.. بۆنمونە منداڵ لێرەدا چەندین بەڵگە و نمونەی زیاتر دەهێنێتەوە.)

دایك: من زۆر حەزدەكەم ڕای تۆ دەربارەی بە بەختی و بیَ بەختی بزانم. هەركاتێك ڕووداوێكت بەسەردێت تۆ ڕووداوەكە لە بەچانسی و و بێچانسی دەزانیت. وەرە دانیشە كەمێك لەبارەی چانس قسە بكەین. ڕەنگە ئەم باسكردن و گفتوگۆیە یەكسەر ڕاوبۆچوونی منداڵ كە بەرانبەر بەدبەختی نەگۆڕێت. بەڵام ڕەنگە ئەو بڕوایەشی لە زەیندا بچێنیَ كە بوونی دایكێكی ئاوا تێگەیشتوو و دڵسۆز بەختێكی گەورەیە.

## دووفاقییەتی هەستەكانی منداڵ:

منداڵان لەیەك كاتدا هەم ئێمەیان خۆشدەوێت و هەم لە دەست ئێمە هەست بە پەرێشانی و دڵ ڕەنجان دەكەن. بەشێوەیەكی گشتی منداڵان بەرانبەر بە دایك و باوك و مامۆستایان و هەموو ئەو كەسانەی دەسەڵاتیان بەسەریاندا دەشكێت بە

دووجۆر بیردەکەنەوە. زۆر دژوارە کە دایکوباوکان ئەم دووفاقیبوونە وەك راستییەکی ژیانی منداڵەکانیان وەربگرن. ئەوان ئەم هەمە ڕەنگییەیان پێ خۆش نییەو ئامادەنین بوونی ئەم دوو فاقییە لەنێو دڵی منداڵەکانی خۆیاندا قبووڵ بکەن واشیان بەخەیاڵیان دادێت کە بوونی دوو جۆرە هەست لەمنداڵدا بەتایبەت بەرانبەر ئەندامانی خانەوادە زۆر خراپ و ناڕەوایە.

دەبێت بوونی دووفاقی لە هەستەکانماندا قبووڵبکەین جا لە خۆمان بێت یان لە منداڵەکانمان. بۆجلەوگیری لەڕووبەڕووبوونەوەو پێکدادەڵشاخانی بێ ئەنجام پێویستە منداڵان بزانن ئەم جۆرە هەستانە لەهەموو ڕوویەکەوە ئاسایی و سروشتین ئێمەبە قبوڵکردن وئاشنابوونمان بەهەبوونی دووفاقیی هەست وبیرەکانی منداڵان دەتوانین دوودڵی و ناڕەحەتییەکانیان لاببەین: (واپێدەچێ دووجۆرە هەستت بەرانبەر براگەورەکەت هەبێت. هەندێ جاریە شانوباڵیدا هەڵدەدەیت وهەندێ جاریش ڕقت لێی دەبێتەوە.یان (دەربارەی ئەم مەسەلەیە دووبڕوات هەیە، هەم حەزدەکەیت بچیتەتۆپتۆپێن هەم حەز دەکەیت لە ماڵەوە بمێنیتەوە.)

پیشاندانی ڕایەکی ئارام و ناڕەخنەیی دەربارەی دووفاقیی بیرەکانی منداڵان لەڕێکخستن وچاکردنەوەی بڕوایان تا ئەوپەڕی کاریگەرە. چونکە وایان لێ دەکات بزانن تەنانەت (هەستە ئاڵۆز وتێکچڕژاوەکان)یشیان لەچوارچێوەی ئاگایی و تێگەیشتنی دایك و باوك و مامۆستایاندا نییە، بە شێوەیەك کەڕۆژێك منداڵێك ئاوای دەگوت: (هەرکاتێك هەستە دژبەیەکەکانی من قابیلی تێگەیشتن بێت ئەوەندەی کەمن تێڕوانین ئەکەم دژو پێچەوانەی یەکتری نین). بەڵام دەبێت ئەوەش بزانرێت قسەی هاوشێوەی ئەو قسانەی خوارەوە بەهیچ شێوەیەك کاریگەریی لەلابردنی دووفاقیی هەستی منداڵاندا نییە:(کوڕم! خۆشت نازانیت چیت دەوێت! بیریت تێکەڵ و پێکەڵ و ئاڵۆزکاوە، ساتێك هاوڕێکەت خۆشدەوێت و ساتێکی دیکە ڕقت لێی دەبێتەوە! تۆ ئەگەر مێشکێکی ئاساییت هەیە دەبێت بەیەك جۆر بیربکەیتەوە.).

هەر مرۆڤێك لە ڕوانگەی فەلسەفییەوە سەیری ڕاستیەکانی ژیان بکات، ڕاستیی ئەم خاڵەی بۆ روون دەبێتەوە کە لەهەر جێگایەکدا خۆشەویستی هەبێت ڕق و کینەش هەیە ،لەهەرجێگایەکدا دڵپاکی و هاندان و پیداهەڵگوتن هەبێت، هەستی رکابەری و

ئیرەیش هەیە, لەهەرشوێنێ پەیوەندیی قوڵی نێوان مرۆڤەکان هەبێت جۆرە ئیرەیی و حەسوودییەك هەیە, لەهەر شوێنێك سەرکەوتن هەبێت, ترس و نیگەرانیش بوونی هەیە, تەنها مرۆڤی دەروونناس و دونیا دیتەیەکە دەزانێت هەموو هەستێ بەباش و خراپ و دووفاقی ودژ بەیەکەکانیشەوە سروشتی و ئاساین.
شتێکی ئاشکرایە قبوولکردنی ئەم رایانە لە ڕوانگەی ڕووحییەوە کارێکی ئەوندە ئاسان نەبێت, لەبەر ئەوەی شێوەی پەروەردەکردنی ئێمە ج لە قۆناغی منداڵی و ج لە قۆناغی پێگەیشتندا دژی ئەم رایانە دەوەستن, لە کاتی منداڵیدا هەمیشە بەئێمەیان گوتووە کەوا نابێ ڕێگابەشتی خراپ و نەخوازراو بدەین بچێتە مێشکمانەوە,دەبێت لە بوونی ئەم جۆرە هەست و بیرانە شەرمەزاربین و وەکو ئەوەی پەروەردەو دەروونناسیی نوێ و زانستی بیەوێت پیشانی بدات کە تەنها بە کاری باش و خراپ دەتوانرێت سیفەتی باش یان خراپ دەستنیشان بکرێت, دەنا کاری خەیاڵیی باش و خراپ بوونی نییە, رەفتاری ئێمە قابیلی رەخنە لێگرتن یان ستایشکردنە, بەڵام هەستەکانی ئێمە قابیلی سەرکۆنەکردن یان پێدا هەڵدان نین بەڵکو حوکمدان لەسەر هەست و چوارچێوەکانی خەیاڵ وبیر,زیانێکی گەورە بەئازادیی سیاسی و سەلامەتی دەروونی دەگەیەنێت. سۆزەکان بەشێکن لەخودی ئێمە کەپشتاوپشت بۆمان ماوەتەوە, ماسی مەلەدەکات, مەل دەفرێت و, مرۆڤ هەست دەکات. هەندێ کات خۆشحاڵ و هەندێ کات غەمگینین, بەڵام لە هەندێ ساتی ژیاندا بە تەواوی لێمان روونەکە هەست بەتووڕەیی و ترس و,غەم و خۆشی شانازی و شەرم و,چێژ یان ڕق لێبوونەوەو, ئارەزوو یان بێ ئارەزوویی دەکەین، لە کاتێکدا ئازادنین لە هەڵبژاردنی ئەو سۆزانەی کە لە ئێمەدا سەرهەڵدەدا ،بەڵام ئازادین لەوەی ئەو سۆزانە چۆنچۆنی و ج کاتێك پیشان بدەین ،بەمەرجێك لەچۆنییەتیی ئەو سۆزانە ئاگاداربین, ئەم مەسەلەیە گرینگیەکی سەرەکی هەیە. هەندێك کەس وا پەروەردە کراون لە چۆنییەتی و راستیی هەستەکانی خۆیان ئاگادارنین. لەوکاتەی کە بەرانبەر کەسێك هەستیان بە ڕق لێبوونەوە کردبێت ئاولیان پێگوتراوە:(هیچ نییە,ئەم ڕق لێبوونەوەیە لە خۆشەویستیەوە سەرچاوە دەگرێ). کاتێك کە هەستیان کردووە ڕەنجێنراون پێیان گوتراوە کە ئازابن و

پێبکەن. بابەتی زۆربەی پۆلێنە باوەکەی نێو خەڵکی ئێمە ئەوەیە:(ئەگەر هەردڵت خۆش نییە.وابکە دڵت خۆش بێت), لەبەرانبەر ئەم ڕێگایە نادروستە دەبێ چی بکرێت؟ بەڕای ئێمە باشترین ڕێگاڕاستگۆیی و پەروەردەی سۆزدارەکەیارمەتی منداڵان دەدات تاکو لەچۆنییەتی هەستەکانی خۆیان ئاگادارین. درککردنیمنداڵان لە هەمبەر ئەوەی کە هەست بەچیدەکات و چ هەستێکی هەیە گرینگترە لەوەی کە:(بۆ هەست دەکات).کاتێك کە ئەو بەروونی دەزانێت هەستەکانی چین, کەمتر ئەگەری ئەوە هەیە بکەوێتە نێوداوی هەستە نادیار و ئاڵۆزەکاوو ودژ بەیەکەکان.

## دابینکردنی ئاوێنە یەك بۆ کە سایەتی؛

چۆن دەتوانرێت یارمەتی منداڵ بدرێت تاکوئاگاداری و زانیاریی لەسەرهەستەکانی خۆی هەبێت؟ ئەم کردەیە بەوە دەبێت کە خۆمان بکەینە ئاوێنەیەك و سۆزی منداڵەکان لە خۆماندا پیشان بدەین.منداڵ بۆئاگاداربوون لە ڕووخساروباری جەستەیی خۆی سەیری ئاوێنەیەك دەکات, بەڵام تەنیا بەسەرنج دان لەوشتانەی کەئێمە لەبارەی ئەو سۆزانەی باسی دەکەین لە چۆنییەتیی سۆزەکانی خۆی ئاگادار دەبێت.

ڕۆڵی ئاوێنە ئەوەیە کە وێنە وەکوخۆی پیشان بدات. نەك جولنی بکات یان کەموکوڕیی دروستکراوی بۆ زیادبکات. ئێمەحەزناکەین ئاوێنە پێمانبڵێت: (بەراستی قیافەیەکی ترسناکت هەیە!چاوەکانت خوێنیان تێکەوتووە.دەمووچاوت ئەستوور بووەو وەکو دێوت لێهاتووە!بڕۆبیرێك لەخۆت بکەرەوە). پاش چەندجارێك سەیرکردنی ئەم جۆرە ئاوێنە سەراوگێر کەرەوەیە. ئاساییەکە منداڵ وەکو ئەوەی تاعوونی دیبێت لێی رابکات. ئێمە داوا لە ئاوێنە ناکەین وتارمان بۆبخوێنێتەوەو ئامۆژگاریمان بکات, بەڵکو چاوەڕێین وێنەی ڕاستەقینەی خۆمانی تێدا ببینین, ڕەنگە لەئاوێنەدا حەز بەبینینی ڕووخساری ڕاستەقینەمان نەکەین, بەڵام حەزدەکەین خۆمان هەوڵی ئارایشتکردنی بدەین.

ڕۆڵی ئاوێنەیەکی سۆزدارگێڕانەوەی هەستەکانە بەشێوەیەکی ڕاستەقینە وبەبێ

کەموکوڕی، بەسەرنج دان لەباروودۆخی منداڵ دەتوانرێ ئەم رستانەی خوارەوەی پێبگوترێ:(دەڵێی زۆر تووڕەیت؟) یان (هەڵبەتە زیاد لە ئەندازە رقت لێی دەبێتەوە)، یان (دەڵێی بەتەولوی لەم پێشهاتە ناڕەحەتیت)، ئەم جۆرە رادەربڕینە کە لەسەر بناغەی راستی و دوور لە زیادەڕۆییە سوودێکی زۆر بەباروودۆخی منداڵ دەگەیەنێت لەبەرئەوەی هەستە راستەقینەکانی ئەو بەروونی پێشانی خۆی دەدات، روونیی وێنە چ لە ئاوێنەی راستەقینەی ئەوچ لە ئاوێنەی سۆزی زەمینەی هەوڵدانی چاککردنەوەی کەموکوڕییەکان لەلایەن خودی کەسەکەوە دەڕەخسێنێت.

## بەشی دووەم

## (رێگا نوێیەکانی هاندان و رەخنەگرتن)

- سەربردەی تەپلە جگەرەی باڵندەو چیرۆکێکی ئاکاری.
- ئایا دەبێ کاری چاك ستایش بکرێت یان کەسایەتی؟
- ئەوەی منداڵان لەقسەکانی ئێمەی هەڵدە هێنجن.
- یارمەتیی ئێمە بۆ ئاگادارکردنەوەی منداڵان دەربارەی تایبەتمەندییەکانی کەسایەتیی خۆیان.
- رەخنەی سوودمەند و زیانبەخش.
- چۆن ناکۆکی وپێکدا هەڵشاخان لەنێوان دایك وباوك ومنداڵاندا روودەدات؟
- جنێوی قێزەون و قسەی ناشرینی زیاد لە ئەندازە
- زاڵبوون بەسەر هەڵچووندا

### سەربردەی تە پلە جگەرەی هاوێشتراو

چیرۆکێکی ئاکاری - بەرەبەیانی رۆژی دووشەمە، پاش تەواوبوونی پشووی کۆتایی هەفتەبوو، ئافرەتێك بەئاوازێکی شێتانە بەم شێوەیە لە تەلەفۆنەوە

سەربردەکەی بۆخوشکەکەی باس دەکرد:(جوان گوێبگرە وببینە ئایاهەرگیز دەتوانی هەرتەسەوری ئەم جۆرە رووداوەش بکەیت؟دوێنێ هەموومان لەنێوئوتۆمبێلدا بووین, ڕۆژەکەمان زیاتر لەنێو ئوتومبێلدا بەسەربرد (ئیڤان)(IEVAN)بەتەنیا لەپشتەوەی ئوتومبێلەکە دانیشتبوو و, لەتەولوی ئەوسەفەرەمان وەکو فریشتەیەك ئارام و لەخۆڕاچوو دانیشتبوو, تەنانەت جارێکیش شەیتانیی نەکرد. بەخۆمم گوت بەڕاستی ئەم منداڵە شایستەی ستایشکردنە. دەمانویست بچینە نێوتونێلێ کە ئاورم دایەوە وپێمگوت:(ئافەرین (ئیڤان)! بەراستی کوڕێکی ژیکەڵەیت و رفتاروئاکاری پیاوانەت هەیە. من شانازی بەوەدەکەم کەکوڕێکی ئاوا باشم هەیە!), یەك دەقیقە دواتردەتگوت ئاسمان بە سەرسەرماندا رووخا.(ئیڤان) بەبێ ئەوەی پێشتر بەسەر خۆی بێنێت تەپڵە جگەرەی تەنیشت دەرگای ئوتومبێلەکەی دەرکێشاو هەرچەند پاشماوەی تێدا بوو بەدەموو چاوی ئێمەی داکرد, تاچەند دەقیقەیەك, سۆتکەو فلتەری جگەرەو تۆزوخۆڵ وەکو ئەتۆمی بۆمبی ئەتۆمی بەسەرسەرماندا باری. بیری لێبکەوە راست لەهەمان ساتدا بەنێو تونێلێکی نیوە تاریك و پڕلە هاتوچۆی ترسناکی ئوتومبێلاندا گوزەرمان دەکرد و کەمێکی مابوو بخنکێین. باوەڕبکە ئەوەندە تووڕە ببووم حەزم دەکرد بیکوژم, ئەگەر ڕێز بەندی ئوتومبێلەکان لەپشت ئێمە نەبوایە زۆر بەباشی تەنبێم دەکرد, ئەوەی زیاتر منی دەسووتاند ئەوەبوو چەند ساتێك بەر لەم رووداوە بەوپەڕی نیازپاکییەوە ستایشمدەکرد, ئێستاکەبەردەوام وەها ئامۆژگاری خەڵکی دەکەن و دەڵێن کەدەبێ منداڵ ستایش بکرێت. بەراستی هەرگیز جێی بڕوا کردن نییە؟چەند هەفتەیەك دواتر بەبۆنەیەکەوە (ئیڤان) هۆی ئەم کارە سەرسوڕهێنەرەی بۆ دایکی ڕوونکردەوە, ئەو لەدرێژایی ماوەی سەفەرەکە بیری لەوەکردۆتەوە چۆن لەدەست برا بچووکەکەی ڕزگاربێت کە بەوپەڕی دڵخۆشییەوە لە کوشنی پێشەوەی ئوتومبێلەکە لەتەك دایك و باوکی ودانیشتبوو؟. لەکۆتاییدا ئەوبیرە چووبوە مێشکیەوە کە ئەگەریەهۆی رووداوێکی گەورەوە, ئوتومبێلەکە لەناوەندەوە وەکو سێویك ببێتە دوو لەت خۆی و دایك و باوکی سەلامەت دەبن بەڵام منداڵەکە دەبێتە دووپارچەوبۆ هەمیشە لەدەستی رزگاردەبن. لەهەمان کاتیشدا بوو کە دایکی

ستایشی رەوشت و رەفتاری ئەوی کرد،ئەم پێهەڵدانە خراپی و بەدیی خۆی لە بەرچاوانیدا زەقترکردەوەو بریاری دا بیسەلمێنێ کە بەهیچ شێوەیەك شایستەی ئەم جۆرە ستایشە نییە. بۆیەش سەیرێکی دەوروبەری خۆی کردووچاوی بەتەپڵە جگەرەکە کەوت وئیدی رووداوەکە یەکسەر و بەبێ ویستی ئەو هاتە کایەوە.

## ئایا دەبێ کاری باش ستایش بکرێت یان کەسایەتی؟

هەندێك بڕوایان وایە کە ستایشکردن هەستی باوەڕبەخۆبوون و پشتبەخۆبەستنی منداڵان بەهێز دەکات و وادەکات مندااڵەکە زیاتر هەست بەدڵنیایی بکات و باوەڕی بەخۆی زیاتر بێت. هەندێکیش بڕوایان وەهایە کە پیاهەڵدان و ستایشکردن تووڕەیی و بەدخویی منداڵان زێتر بکات، بۆ؟. زۆربەی جار منداڵان لەبەرانبەرئەندامانی خانەوادەدا بیروئارەزووی ناپەسندوناشرین لە زەینی خۆیاندا پەروەردە دەکەن، کاتێك کەباوکێك بە کوڕەکەی دەڵێت: (بەراستی کوڕێکی زۆر زیکەڵەیت!)، ڕەنگە منداڵەکە ئەم ستایشکردنە قبووڵ نەکات لەبەرئەوەی بۆچوونی ئەو بەرانبەر بە خۆی لەگەڵ بۆچوونی باوکی جیاوازییەکی زۆری هەیە. روون کردنەوەش ئەوەیە کە ئەو چەند ساتێك لەمەوبەر لە قوڵایی دڵیەوە هیوای دەخواست کە دایکی بۆ ماوەیەك لاڵ بێت و براکەی لە نەخۆشخانە بخەوێت، هەربۆیە وا دەزانێت منداڵێکی باش و شایستەی ستایش نییە. لەراستیدا چەند زیاتر ستایش بکرێت، زیاتر بەدخویی دەکات. چونکە بەم هۆیەوە دەیەوێت (وێنەی راستەقینە)ی خۆی پیشان بدات.بەردەوام ئەوە روودەدات کە دایکان و باوکان سکاڵا دەکەن کە راستەوخۆ پاش ستایشکردن، منداڵەکانیان رووبەرووی گۆڕانی ئاکاریی کتوپڕی منداڵەکانیان دەبنەوەو بەسەرسوڕمانەوەدەپرسن بۆچی منداڵەکە ڕێگایەکی درندانە دەگرێتە بەر وەکو ئەوەی یاخیبوون و نارەزایی خۆی لە بەرانبەر ئەم ستایشکردنە پیشان بدا؟ زۆر ئەگەری ئەوە هەیە منداڵ لەم ڕێگایەوە بیەوێت جیاوازی بیروڕای خۆی بەرانبەر ئەو بیروڕایانە پیشان بدات کە دایك وباوکی دەربارەی ئەو هەیانە

## ستایشی خوازراو یان نەخوازراو

ئایا لەم بۆچوونەی ئێمەوە دەبێت ئەنجامێکی وا بەدەست بخرێت کەستایش کردن بەرهەمێکی نییەودەبێت پشتگوێ بخرێت؟بەهیچ شێوەیەك وانییە, مەبەستی من ئەوەیە کەستایشکردنیش وەکو پەنسلین نابێت کوێرانەو بەبێ زانیاری ولێووردبوونەوە بەکاربېرێت.هەر پزیشکێك لەنووسینی دەرمانە بەهێزەکاندا هەلومەرجێکی تایبەتی وەکو رێژەی دەرمان وکاتی خواردنی و. کاردانەوەی لەشی نەخۆش لەبەرانبەر دەرمانەکەو چەندانی دیکەش لەبەرچاو دەگرێت. دەربارەی بەکارهێنانی دەرمانە (سۆز) یەکانیش دەبێت ئەم تێبینیانە لەبەرچاو بگیرێن یاسای گرنگ و سەرەکی لەم رووەوە ئەوەیە کەدەبێ ستایشکردن تەنها پەیوەندی بەهەوڵدان و هەنگاوەکانی منداڵەوە هەبێت نەك رەوشت و کەسایەتییەکەی بگرێتەوە, بۆ نموونە: کاتێك کە منداڵێك حەوشە پاك دەکاتەوە, زۆر ئاساییە کەپێی بڵێین: بەراستی زەحمەتێکی زۆرت کێشاوە ئێستا حەوشەکە زۆر دڵگیر بووە زۆریش بێ مانایە کەپێی بڵێین (کوڕێکی چەند باشە(۱))دەبێ قسە ستایش ئامێزەکان هەر وەکو ئاوێنە وێنەی راستەقینەی هەنگاوەکانی منداڵ پیشان بداتەوە, نەوەك کەسایەتییەکەی سەراو ژێر پیشان بداتەوە, ئەم نموونانەی خوارەوە تا ئاستێك ستایشکردنی بەجێ پیشان دەدات.

(جیم) کەتەمەنی شەش ساڵە لە پاککردنەوەی حەوشەدا کارێکی چاکی ئەنجام داوەو هەمووگەڵا وشکەکانی کۆکردۆتەوەو رووەکە زیادەکانی هەڵکێشاوەو پاشانیش هەموو کەرەسەکانی لەجێی خۆی داناوتەوە, دایکی ئەوپەڕی دڵخۆش دەبێت و بەم شێوەیە ستایشی کارە چاکەکانی دەکات.

دایك: حەوشەکە گەلێك پیسبوو هەرگیز باوەڕم نەدەکرد لە ماوەی یەك رۆژدا بتوانرێت ئاوا بە چاکی پاك بکرێتەوە.

جیم: بینیت کە من پاکم کردەوە.

دایك: پڕ بوو لە گەڵای وشك و چڵە گیای زیادە.

جیم: هەموویم کۆکردنەوە.

دایك: کارێکی زۆر قورس بوو!.

جیم: ئەرێ وەڵڵا زۆری پێدەویست.

دایك: ئێستا حەوشەکە زۆرپاك بۆتەوە. مرۆڤ کەتەماشای دەکات دڵی دەکرێتەوە.
جیم: ئا. زۆر باش بووە.
دایك: کورم سوپاست دەکەم.
جیم: (بەزەردەخەنەیەکی گاڵتە ئامێزەوە) ئەرکی سەر شانمە بەرێز!
ئەم قسە بەجێیانەی دایکەکە لەهەموو رووییەکەوە(جیم)ی لە بەرانبەر ئەنجامدانی کارەکەی دڵخۆش کرد, جیم تا شەولەسەر ئاو وئاگربوو تاکو لەکاتی گەڕانەوەی باوکی حەوشە پاکەکەبەباوکیشی پیشان بدات و جارێکی دیکەش لەقووڵایی دڵیەوە بەهۆی کارە چاکەکەیەوە هەست بە شادوومانی و بەرزە فڕی بکات. بەپێچەوانەشەوە. ئەم قسە ستایش ئامێزانەی خوارەوە کە ئاراستەی کەسایەتیی منداڵ بکرێت هیچ کاریگەرییەکی نابێت:(بەراستی کوڕێکی باشیت!) یان (بەراستی بۆ دایکت یارمەتیدەرێکی بچکۆلەو ژیکەڵەیت) یان (بەبێ تۆ دایکت چی دەکرد!)
رەنگە ئەم جۆرەشیکردنەوەیە منداڵ ناڕەحەت بکات و زیاتر نیگەرانیی بخاتە دڵیەوە.
ڕەنگە بەم جۆرە هەست بکات کەهەرگیز بەو پایەیە نەگات کە چاوەڕوانییان لێی هەیە. بەم شێوەیە لەجیاتی ئەوەی دان بەخۆیدا بگرێت تانەوکاتەی کەموکورییەکانی کەسایەتییەکەی ئاشکرا دەبن, بەئەنقەست دەست بەبە دخووییی دەکات تاکو زیاتر لەو رادەیە چاوەڕوانییان لێی نەبێت. ستایشکردنی راستەوخۆی کەسایەتی وەکو تیشکی راستەوخۆی خۆر ئازاربەخش و کوێرکەرە. هەمووکەسێك بەوە ناڕەحەت دەبێت کە خەڵکانی دیکە بەچاوتێرو سادەو بلیمەت لە قەڵەمی بدەن. وەکو ئەوەیە داوای لێبکەن بەلای کەمەوە بەشێك لەوستایشانە بەدرۆ بخاتەوە.رەنگە کەسەکە لەناو جەماوەردا بەناچاری وەك خەڵکی دیکە پێی خۆش بێت تائەندازەیەك ستایش قبوڵ بکات وئەوە بڵێت: (سوپاستان دەکەم!قسەکانی ئێوە دەربارەی ئەوەی کەچاوتێرو دەستودڵ کراوەم قبوڵ دەکەم.) بەلام لەدڵی خۆیدا ئەم مەراییکردنە رەتدەکاتەوە, چونکە ویژدانی رێگای پێنادات بەخۆی بڵێت:(من دڵفراوان یان فریشتەو یان بەهێزو یان سادەوخاکیم) ئەو نەك ئەم ستایشە رەتدەکاتەوە, بەڵکو لەبەرانبەرئەوکەسانەداچەند بیرێکی نوێ لە زەینیدا پەیدادەبێ کەمەراییان بۆکردووە بەجۆرێك ڕەنگە بەخۆی بڵێت:(ئەگەر دەربارەی کەسایەتیی

من ئەوەندە بەهەڵە داچووین بەهیچ شێوەیەك مرۆڤی هۆشمەند نین.)

## منداڵان چی لە قسەکانی ئێمە هەڵدە هێنجن.

وەکو گوتمان نابێت ستایشکردن دەربارەی ئاکارو تایبەتمەندیی کەسایەتیی منداڵان بێت, بەڵکو دەبێ بابەتی ستایشکردنەکە هەروەکو هونەرەکانی منداڵان بێت,دەبێ بەشێوەیەك ستایشی منداڵان بکەین لەمەویەدواوە بەرانبەر تایبەتمەندییەکانی کەسایەتیی خۆی چەندخاڵ و ئاماژەیەکی راست و دروست هەڵبهێنجێت.(کینی) (KEUNY)کە تەمەنی لە (١٠)ساڵ زیاتر نییە لە رێکخستنی ژێر زەمیندا یارمەتییەکی باشی باوکی داوە لەئەنجامدا ناچاربوو کەلوپەلی قورسیش رابگوازێت, باوکی ئاوای پێ دەڵێت:

باوك: ئەم مێزە زۆر قورسە راگواستنی ئەوەندەش ئاسان نییە.

کینی: (بەشانازییەوە) بینیت کەمن گواستمەوە.

باوك: هێزێکی گەلێ زۆری دەوێت.

کینی: (لەکاتێکدا کە ماسولکە کانی خۆی پیشاندەدات) من بەهێزم.

لەم نموونەیەدا باوك ئاماژەیەکی بەسەختیی کارەکەکرد بەڵام ئەوە خودی کینییوکە لەم ئاماژەیەوە دەربارەی هێزی ماسولکەکانی خۆی شتێکی هەڵهێنجا. ئەگەر باوکی پێیبگوتبایە:(ماشەڵلا کورم! بەراستی بەهێزیت!) رەنگە کورەکەی ئاوا وەڵامی بدابایەوە:(نەخێر! ئەوەندەش بەهێزنیم کە تۆ بەخەیاڵتدا دێت, لە پۆلەکەماندا کەسانی لەمن بەهێزتر زۆرن. رەنگە لەئەنجامی ئەم وەڵامەشدا لە نێوان کورو باوکەکەدا دەمەتەقێیەکی تاڵ و بێسوود رووی بدابوایە.

## یارمەتیی ئێمە بۆ بەئاگاهێنانەوەی منداڵ لە تایبە تمەندییەکانی کەسایەتیی خۆی

ستایشەکانی ئێمە دووبەش لەخۆدەگرن: قسەکانی ئێمەو هەڵهێنجان وراوبۆچوونی منداڵ لە بارەی قسەو راوبۆچوونەکانمان. دەبێ قسەکانمان بەشێوەیەکی روون ئەوە پێشان بدات کە رێز لە تێکۆشان وهونەرو یارمەتی و تێبینی و داهێنانەکانی منداڵ دەگرین, بەشێوەیەك منداڵ بتوانێت لەکۆی قسەکانی ئێمە بۆ ئاگاداربوون لە کەسایەتیی خۆی ئەنجامێك وەدەستبهێنێت, لەراستیدا دەبێ قسەکانمان بۆ منداڵ

وەکو پارچە قوماشێك بێت کەوێنەیەکی ئەرێیی خودی خۆی لەسەر بچنێت. ئەم نموونانەی خوارەوە بەچاکی ئەم خاڵە رۆشن دەکەنەوە:

ستایشی بەجێ:سوپاست دەکەم کە ئۆتومبێلەکەی منت شووشت ئێستا وەکو ئۆتومبێلێکی نوێ دێتە بەرچاو.

هەڵهێنجانی مندالێ: کارێکی چاکم ئەنجام داوە. باوکم کارەکەی پەسندکردم.

هاندانی بێجێ: کورم! بەراستی تۆ فریشتەی.

هاندانی بەجێ: جلکی سەرەوەتم زۆر پێ جوانە. جوان و نەخشینە!

هەڵهێنجانی ئیحتیمالێ: سەلیقەیەکی باشم هەیە! دەتوانم پشت بە سەلیقەی خۆم ببەستم.

ستایشی بەجێ: تۆ هەمیشە جوانناسی.

ستایشی بێجێ: هۆنراوەی تۆ چووە دڵمەوە.

هەڵهێنجانی گریمانەیی: چەند خۆشحاڵم!من دەتوانم بەباشی هۆنراوە بنووسم!

ستایشی بێجێ: لەگەڵ ئەوەی تەمەنت بچووکە بەڵام هۆنراوە باش دەنووسیت.

ستایشی بەجێ: ئەو کتێبخانەیەی دروستتکردووە چەند جوان دێتە بەر چاو.

هەڵێنجانی گریمانەیی: بێ توانانیم (لێنە هاتوو نیم).

ستایشی بێجێ: بەراستی دارتاشێکی دەست رەنگینیت.

هاندانی بەجێ: نامەکەت دڵی رووناك کردمەوە!

هەڵهێنجانی گریمانەیی: دەتوانم دڵی خەڵکانی دیکە رووناك بکەمەوە.

هاندانی بێجێ: بەراستی لە نامە نووسیندا دەستێکی رەنگینت هەیە.

ستایشی بەجێ: سوپاست دەکەم چونکە بە چاکی قاپەکانت شووشت.

هەڵهێنجانی گریمانەیی: من دەتوانم تاتاستێك یارمەتی دایکم بدەم.

ستایشی بێجێ: تۆ باشتر لەچێشتلێنەرەکەمان قاپەکانت شووشت.

ستایشی بەجێ: سوپاست دەکەم کەگوتت پارەیەکی زۆرم بەتۆداوە لە راستگۆیی تۆ زۆر خۆشحاڵ بووم.

هەڵهێنجانی گریمانەیی: خۆشحاڵم بەوەی کە راستیت نواند.

ستایشی بەجێ: بەراستی کورێکی راستگۆیت!

ستایشی بەجێ: دلۆشتنەکەت بیرێکی نوێی خستە مێشکمەوە.
هەڵێنجانی گریمانەیی: دەتوانم خاوەنی بیری نوێبم (داهێنەرانەبم).
هەڵێنجانی بێجێ: بە بەراورد لەگەڵ پۆلەکەت زۆربەباشی شت دەنووسیت بەلام هەردەبێ زیاد خۆت ماندوو بکەیت.
ئەمجۆرە ستایشکردن وبیرۆکە هەڵێنجانە ئەرێنیانە لەو پایە سەرەکیانەوە دەروون دروستیی منداڵ فەراهەم دەکات.(دادەمەزرێنێت) ئەو ئەنجامەی کە منداڵ لە قسەکانی ئێمەدا وەدەستی دەهێنێ.دواتر بەئارامی لەبەرەخۆی دووبارەی دەکاتەوە.
ئەودەربڕینە ئەرێنیانەی کەلەلایەن منداڵەوە دووبارەببێتەوە بەرانبەرخۆی وجیهانی دەووبەری تاڕاستێکی بەرز کاریگەری لە بیروباوەڕی دەکات و وا دەکات باوەڕی بە خۆی بێت.

## رەخنەگرتنی سوودمەندو زیانبەخش:

ج کاتێك رەخنەگرتن سوودمەندەو ج کاتێك زیانبەخشە؟
رەخنەگرتنی سوودمەند بریتیە لە خستنە رووی رێگای ئەنجامدانی کارێك و بە هیچ شێوەیەك ئاماژەی نەرێنیی بە کەسایەتیی منداڵ ناکات.
(لاری) (LARRY)(١٠)ساڵانە. بەبێ ئەوەی ئاگای لێبێت پەرداخە شیرەکەی دەڕژێتە سەرمێزی نانخواردن.
دایك: تۆ ئەوەندە گەورەیت کە بتوانیت پەرداخە شیرێك بەدەست بگریت! تا ئێستا چەندین جار بەتۆم گوتووە کاتی نانخواردن ئاگات لەخۆت بێت.
باوك: (ئەم قسانە لەم گوێیەی دەچێتە ژوورێ و لەگوێیەکەی دیکەی دەچێتە دەرێ ,ئەو هەمیشە گوێڕایەڵ نییە, بڕواناکەم بیەوێت خۆی چاك بکاتەوە.) .(لاری) بای پوولێکی سووتاو شیری نەڕشتووە, وەلێ رەنگە باجی ئەم رەخنە گرتنە بێجیەی دایك و باوکی لەرووی لاوازکردنی هەستی پشت بە خۆبەستن وباوەڕ بەخۆبوونی منداڵەکە هەزاران جار گرانتر بێت لە پەرداخە شیرێك. کاتێك منداڵێك کارێکی نادروست دەکات,هیچ پێویست نییە کە دەربارەی کەسایەتییەکەی وتاربدەین,

بەڵکو باشترە تەنها ئاماژە بەخودی ڕووداوەکە بکەین و کارمان بە خودی کەسەکەوە نەبێت.

## کاتێک منداڵ بەدخوویی دەکات دەبێ چی بکرێ؟

کاتێک (مارتین) (MARTIN)ی (٨)ساڵە, بێ ئەنقەست پەرداخە شیرەکەی ڕژاندە سەرمێز. دایکی کە لەهونەری پەروەردەکردنی دروست ئاگاداربوو, بەوپەڕی ئارامییەوە ئاوای پێگوت:(دەبینم شیرەکەت ڕژاوە, ئەمە پەرداخە شیرێکی دیکەو ئەمەش ئیسفەنج! ئەوکات لەجێی خۆی هەڵساوەو پەرداخە شیرەکەی دا بەکوڕەکەی.(مارتین) هەناسەیەکی دڵخۆشانەی هەڵکێشاو بەسەرسوڕمانەوە لەدایکی ڕاما و لەبەر خۆیدا گوتی:(زۆر سوپاست دەکەم دایە!) دواتر بەیارمەتیی دایکی مێزەکەی پاککردەوە. دایکی هیچ قسەیەکی دیکەی بەمنداڵەکەی نەگوت کە لۆمەکردن لە خۆبگرێت ویان هەڕەشەی تێدابێت. پاشان بەم شێوەیە لەلای هاوڕێکانی باسی ئەم ڕووداوەی کرد:(ئەوەندەی نەمابوو پێی بڵێم کە جارێکی دیکە زۆر ئاگاداریە! بەڵام کاتێک بینم لەبەرانبەر ئارامییەکەم بە سوپاسەوە سەیری دەکردم, بۆیە هیچم نەگوت. بەتایبەت کەئەوەم هاتەوە یاد کەجارێك بەهۆی ڕشتنی پەرداخە شیرێك هەڵلام دروست کردو ڕۆژێکی تەواوهیچ کاممان ئارامان نەبوو.

## چۆن شەڕو پێکداهەڵشاخان لەنێوان دایکوباوک ومنداڵ ڕوودەدات

لە زۆربەی ماڵەکاندا شەڕو کێشەو حەوت و هەشت لەنێوان دایك و باوك لەلایەك ومنداڵان لەلایەکی دیکەو بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو ڕوودەدات.منداڵ کارێکی ناشرین دەکات یان قسەیەکی نەشیاوی بەزلرداێت وباوك یان دایك سەرزەنشتی منداڵەکەیان دەکەن وسستو سووکی دەکەن و باوك قسەیەك بەمنداڵەکە دەڵێت و منداڵەکەش وەڵامێکی توندتر دەداتەوە. باوك یان دایك ئەم توندوتیژیە بەتۆڵە لێسەندنەوە و هەندێ کاتیش بە هەڕەشە دەزانن و لە ئەنجامدا کارەکە بەرەو ڕووداوێکی توندتر دەڕوات.

(NATHANIEL)(ناتانیل) کە تەمەنی (٩) ساڵەکەمەی بە فنجانێکی بەتاڵ دەکرد.

دایك: فنجانەکە دەشکێنیت! تۆ لەشت شکاندن شارەزاییەکی باشت هەیە.

ناتانیل:نەخێر،من چ کاتێك شتم شکاندووە؟لەهەمان کاتدا فنجانەکە کەوتە سەرزەوی و شکا.

دایك:(بەوپەڕی تووڕەبوونەوە) بەراستی منداڵێکی زۆر دەبەنگیت!لەماڵەوە هەرچیەکت بکەوێتە بەردەست دەیشکێنیت!

ناتانیل: کەواتە تۆش دەبەنگیت! ئەدی تۆ نەبووی ریشتراشە کارەباییەکەی باوکمت شکاند.

دایك: ئافەرین! کەوایە بەدایکیشت دەڵێیت دەبەنگ!ئەوەندەبێ چاوو ڕوو بوویت؟!.

ناتانیل: تۆ بێ چاوەڕوویت! تۆ یەکەم جار بەمن گوت دەبەنگ!

دایك: ئیدی نامەوێ دەموچاوە شوومەکەت ببینم. یەکسەر برۆ ژووری خۆت!

ناتانیل: ناچمە ژووری خۆم! ئەگەر ڕاست دەکەیت وەرە بەندم بکە!

دایکیشی لەبەرامبەر ئەم ڕکابەرییە تووڕەبوو و، کەوتە دوای کوڕەکەی، کاتێ کە بەزەحمەت خۆی گەیاندێ (ناتانیل) دایکی بەرەو پەنجەرەکە پاڵپێوەناو شووشەکە شکاو دەستی دایکی بریندار بوو.

بینینی خوێن ناتانیلی تووشی ترس و نیگەرانی کرد لە ماڵەوە هەڵات و تا کاتێکی درەنگی شەو بەدیار نەکەوتەوە. پێویست ناکات ئەوە وەبیر بهێنینەوە کە ئەم

رووداوە بەتەواوی ماڵەوەی شێواندوو ئەو شەوە کەس بە ئارامی نەخەوت.
ئایا ناتانیل لەم رووداوەدا پەندوعیبرەتی وەرگرتوو چیدیکە گەمەی بەفنجانی بەتاڵ کردیان نە؟ فنجانێك، لەبەرانبەر پەندوعیبرەتێکی نێگەتیڤ کە دەربارەی خۆی ودایکی فێربوونێر کەم بووە. بناغەی مەبەست ئەوەیە کە ئەم بە رانگژیوونەوەیە پێویست بوو؟ ئایاپێویستی بەو جۆرە قیژەو هەرایەهەبوو؟ ئایا ناکرێ ئەم رووداوە ناقڵانەتر رێگای لێبگیرێت و نەهێڵدرێت رووبدات! دایکەکە هەر لەگەڵ بینینی ئەوەی کە کورەکەی گەمە بەفنجان دەکات دەیتوانی لێی بسێنێتەوەو، لەجیاتی فنجانەکە کەلوپەلێکی گەمەی کەم مەترسیتری وەك تۆپ و شتی دیکەی بدابوایە دەستی. یان کاتێك فنجانەکە شکا، دەیتوانی پارچەکانی بەکورەکەی پیشان بدابووایە وتێی بگەیاندبوایە کە فنجان زوو دەشکێت، هیچ کەس تەسەوری ئەوەی نەدەکرد کە فنجانێکی ئاوا وردوخاش بێت، رەنگ بوو سەرسورمانی منداڵەکە لەو روونکردنەوانە نارەحەتی بکات ووای لێبکات داوای لێبوردن بکات و تەنانەت لەجیات بەدخوویی کردن و وەڵامدانەوە لەوانەبوو دەرەنجامێکی وەهای لێ بکەوتبایە دەست کە فنجانی چای بۆ گەمەکردن دروست نەکراوە.

## هەڵەی بچووك و سزای زێندە رۆیانە ) سزادانە زێندە رۆیەکان:

منداڵان دەتوانن لە هەڵەی بچووك دەرەنجامی گەورە وەدەستبێنن. دەبێ منداڵ لە دایك و باوکیەوە جیاوازی نێوان رووداوی ناشرین و قێزەمەستێن لەلایەك و رووداوی سەخت و مەترسیدار لەلایەکی دیکەوە فێربێت و تا ئەندازەیەك پلەی هێزو لاوازیی هەر پێشهاتێك لێك جیابکاتەوە. زۆربەی دایك و باوکان لە بەرانبەر هێلکەیەکی شکاودا هەمان کاردانەوە پیشان دەدەن کەدەبێ لە بەرانبەر قاچێکی شکاودا پیشانی بدەن.یان لەبەرانبەر شووشەیەکی شکاودا بانگ وهاوارێکی وا بەرپادەکەن وەك ئەوەی لەبەردەم مەرگی ئازیزێکیاندابن، لە حاڵێکدا دەبێ رووداوی بچووك بەهەمان قەبارەی خۆی بچرپێنرێتە گوێی منداڵ و پێی پیشان بدرێت.
ـ دیسانەوە دەستەوانەکانت بزرکرد؟ زۆربەداخەوەم چونکە بۆ کرینی ئەم دەستەوانانە پارە خەرج کراوە. هەڵبەتە رووداوێکی داخ ئامێزە وەلێ نابێت زیاد

لە رادەی خۆی گرینگی پێبدەیت.

نابێ بزرکردنی جووتە دەستەوانەیەك ببێتە هۆی توورەبوونێکی زۆر، هەروەها نابێ دڕانی کراسێك ببێتە هۆی دانانی پرسە.

## جنێوی قێزەون و قسەی ناشرینی زیدەڕۆیانە:

قسەی سووك و جنێوی قێزەون وەکو گوللەی گەرم و تیری ژەهراوی، دەبێ تەنها بەرانبەر بە دوژمنانی خوێنخۆر بەکاربێت، نەك ئاراستەی مندالْ بکرێت. کاتێك یەکێك دەلێت:(ئەم کورسیە خراپ دروستکراوە) هیچ هێدمەیەك بەکورسیەکە ناگات، کورسی نەناڕەحەت دەبێت و نەدەڕەنجێت و کەمترین جوولەش ناکات وهیچ جۆرە کاردانەوەیەك لەبەرانبەر ئەو سیفەتەدا پیشان نادات کەوا خراوەتەپالی ،بەلام هەرکاتێك بەمندالێك بلێین ناشرین یان کەودەن یان شەپڕێو خێرا دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەم قسەیە، کاردانەوەیەك لەلەش وگیانیدا روودەدات وبێشك لەنێودلیدا دەبێتە هۆی پەیدابوونی ڕق و هەستی دوژمنایەتی. بەرانبەر ئەم بێ حورمەتی پێکردنە لەجیهانی خەیالی خۆیدا چەند پلانێك دادەڕێژێت، ئەم شتە هەستی خۆبەکەمزانین پەیدا دەکات و ئەم هەستەش دەبێتە هۆی دروستکردنی دوودلی و بەدخوویی و شەڕخوازی، (چاوێك بەبەشی هەفتەمدا بخشێنەوە) بەکورتی کۆمەلە کاردانەوەیەکی توند لەلای مندالەکە پەیدا دەبێت و دەبێتە هۆی بەختڕەشیی مندالەکەو دایك وباوك. کاتێك کە مندالێك بەشەپڕێو لەقەلەم دەدرێت، ڕەنگە بەگوێبیستبوونی ئەم راستییە تەنها بلێت: (نەخێر! من شەپڕێونیم)، بەلام زۆربەی جاربڕوا بەقسەکانی دایك و باوکی دەکات و بەراستی خۆی بەمرۆڤێکی شەپڕێودێتە بەرچاو.کاتێك بەڕێکەوت کتێب وکەلوپەلەکانی خوێندنی بەپەرت وبلاوی دەبینێت، بەدەنگێکی بەرز بەخۆی دەلێت :(بەراستی من کوڕێکی شەپڕێوم)، ڕەنگە لەپاش ئەمەوە بەرەبەرە لەو کارانەدوور بکەوێتەوە کەپێویستیان بە ڕێکخستن و ڕێککاریی تەواوهەیە. چونکە لەلای خۆیەوە دلنیایی پەیداکردووە کەئەوشەپڕێویەی لەڕەمەکی ئەودایە دەبێتە کۆسپ لەبەردەم سەرکەوتنی. کاتێك کە مندالێك بەبەردەوامی گوێی لە دایك وباوك ومامۆستای بێت پێی بلێن: (دەبەنگ) ڕەنگە بەرەبەرە بڕوابەوە بهێنێت کەبەهۆش نییەو لەئەنجامدا خۆی لە هەموجۆرە کۆششێکی فیکری

بەدووردەگرێت و لەترسی ریسوابوون خۆی لەو چالاکیانە بەدووردەگرێ کەپێویستیان بە بەکارهێنانی هۆش هەیەو, بەتەواوی خۆبواردن و ئارامیی خۆی لەکۆشش نەکردن دەدۆزێتەوەو دروشمێکی ئاوا بۆخۆی هەڵدەبژێرێت:(هەرچەندە کەمتر کۆشش بکەم باشترە.)

## زاڵبوون بەسەر تووڕەیی

لەسەردەمی منداڵیدا هەرگیز ئێمەیان فێرنەدەکرد کە چۆن بەسەر تووڕەیی خۆماندا ـ کە یەکێکە لە راستییە سەلماوەکانی ژیان ـ زاڵبین ـ بەڵکو بەردەوام ڕووی دەمیان لە ئێمە کردبووەو پێیانگوتووین کە تووڕەبوون کارێکی زۆر ناشیرنەو, شایستە نییە منداڵێکی تێگەیشتوو تووڕەبێت ,تەنانەت بەردەوام بە ئێمەیان دەگوت کەتووڕەبوون نەك هەرتەنیا قێزەونە بەڵکو لەبناغەوە رووخسارێکی وەحشیگەریانەیە. ئێستا ئێمە هەوڵدەدەین تاپێمان دەکرێ بەرانبەر منداڵەکانمان دان بە خۆداگرتن پیشان بدەین. گشت کاتێك لەو بڕەداین کە نەوەك زیان بە منداڵەکانمان بگەیەنێت, هەربۆیەش وەکو ئەوکەسەی کە هەناسەی تووڕەیی لە سینەی خۆیدا بەند دەکات, هەوڵدەدەین تووڕەیی لە دەروونی خۆمان ڕابگرین, وەلێ هەموو دەزانن کە لە هەردوو باردا توانای دانبە خۆداگرتنی مرۆڤ زۆر دیاریکراوە. تووڕەیی وەکو هەڵامەت وایەبمانەوێ ونەمانەوێ ماوە ماوە تووشی دەبین،ڕەنگە حەزی پێنەکەین بەڵام ناتوانین نکوڵی لە بوونی بکەین. ڕەنگە لە چۆنییەتیی تووڕەبوون ئاگادار نەبین بەڵام ناتوانین پێشی لێبگرین. تووڕەیی زۆر جار لە هەندێ باردا کەدەتوانرێت بەباشی پێشبینی بکرێت ڕوودەدات, وەلێ زۆر جاران لایەنی کتوپڕی چاوەڕواننەکراوی هەیەو ئەگەرچی ڕەنگە ئەوەندەی پێنەچێ, لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا یەکسەر وەکو بەڵایەکی درێژ خایەن دەکەوێتە بەرچاوان, کاتێ کە زۆرتووڕە دەبین وەکو ئەوەیە ئەقڵی خۆمان لە دەست دابێت و بەرانبەر بە منداڵەکانمان هەندێ هەنگاوی وادەنێین کە لەباری ئاساییدا تەنانەت بەرانبەر بە دوژمنەکانیشمان بەڕەوای نازانین و, قسەی واناشرین دەکەین کە دواتر دێتەوە بیرمان هەست بەشەرم دەکەین. کاتێك تووڕەیی بەسەرماندا زاڵ دەبێت, دەنەڕێنین

و بوختان دەكەین و دەست دەوەشێنین ،كاتێكیش دەگەڕێینەوە سەرباری ئاسایی خۆمان هەست دەكەین هەڵەیەكمان كردووە و پەیمان بەخۆمان دەدەین جارێكی دیكە ئەو جۆرە رەفتارە دووبارە نەكەینەوە. بەڵام پاش تێپەڕبوونی ماوەیەكی كەم لەگەڵ نیازپاكی و بڕیارە راستەقینەكانیشدا دووبارە گرفتاری تووڕەیی دەبینەوەو دووبارە هەروەكو شێری بریندار هێرش دەكەینە سەر ئەو ئازیزانەمان كە تەواوی ژیان و سامانی خۆمان لە پێناویاندا تەرخان كردووە.

بڕیاردان لەسەر ئەوەی كە چیدی تووڕەنەبین نەك بێ ئەنجامە، بەڵكو مەترسیی زۆریشی هەیە ،چونكە راست وەكو ئەو ڕۆنە وایە كە دەڕژێنرێتە سەر ئاگرەوە. تووڕەیی وەك تۆفان و راستییەكی بێ شك و گومانی ژیانە كە دەبێ لە چۆنییەتیی روودانی ئاگاداربین و بۆ رووبەڕووبوونەوەی پێشتر خۆی بۆ ئامادە بكرێت. ماڵی ئارام وەكوجیهانی بێ جەنگ ئارەزووی هەموومرۆڤێكەو، پەیوەندی بەگۆڕانێكی ئەرێنیی پەرجوو ئاسای نێو خودو سرووشتی مرۆڤەوە نییە،بەڵكو بەندە بەكردەوەو هەنگاوی بەجێ وئاقڵانە كە پێشگیریی لەرووبەڕووبوونەوەو پێكدادامەڵشاخان ودژواربوونی بارودۆخەكان بكات بەر لەوەی بگاتە ئاستی تەقینەوە.لەپەروەردەو فێركردنی منداڵدا، تووڕەیی دایك و باوك پێگەوشوێنێكی تایبەتی هەیە.لەراستیدا خۆدووركرتن لەتووڕەبوون لەهەندێ حاڵەتی پەروەردەو فێركردن،نیشانەی خۆشەویستی و گرینگی دان بە سەلامەتیی منداڵ نییە، بەڵكو بەپێچەوانەوە نیشانەی ئاڵۆزی و بێ غەمی و كەمیی خۆشەویستییە. هەڵبەتە مەبەست ئەوە نییە كە منداڵان دەتوانن بەباشی لەبەرانبەر شەپۆلی تووڕەیی و قسەی ناشریندا بەرگە بگرن، بەڵكو مەبەست ئەوەیە كەدەبێ لەهەندێ باردا منداڵان تێبگەیەندرێن كە (دڵنیە خوداگرتن و سینگفراوانیش سنووری خۆی هەیە.) بۆ دایك وباوكان تووڕەیی هەڵچوونێكی زۆر گرانبەهایە ونابێ بۆ سوود لێوەرگرتنی بەبێ هۆ بەكاربهێنرێت.نابێ تووڕەیی بەشێوەیەك بەكاربێت كە پاش دەربڕین توندییەكەی زیاتر بێت.بەواتایەكی دیكە نابێ دەرمان لەخودی نەخۆشی خراپتربێت.دەبێ تووڕەیی بەشێوەیەك پیشان بدرێت كە تا ڕادەیەك ناڕەحەتیی دایك و باوك سارێژ بكاتەوەو هۆشیاری و ئاگاداربوونی منداڵیش زیاتر بكات،بەبێ ئەوەی زیانی بۆ هیچ

یەکێکیان هەبێت. بە پەیڕەوکردنی ئەو یاسایەی :نابێ لەکاتی ئامادەبوونی هاوڕێکانی منداڵ توورەبین، کەللەڕەقی منداڵ زیاتر دەکات و لەئەنجامدا ئێمە توورەتردەکات. مەبەستی ئێمە ئەوە نییە کەیەك لەدوای یەك شەپۆلی توورەیی و بەدگومانی وتۆڵەخوازی دروست بکەیت، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەمانەوێت مەبەست و ڕای خۆمان لەمنداڵ بگەیەنین و لەهەمان کاتیشدا هەروەها لافاو چێکەرەکانیش دووربخەینەوە

## سێ هەنگاو بەرەو بوژاندنەوەو هەڵسانەوە:

بۆئەوەی لە کاتە ئارامەکاندا خۆمان بۆڕووبەڕووبوونەوەی ڕووداوەکانی کاتە لافاوییەکان ئامادەبکەین، دەبێ گشت کاتێك ئەم ڕاستییانەی خوارەوە لەبەر چاو بگرین:

١ـ دەبێ ئەو ڕاستییە قبوڵ بکەین کە منداڵان بەردەوام ئێمە توورە دەکەن.

٢ـ مافی خۆمانە بەبێ هەستکردن بەوەی کە هەڵەمان کردووە هەروەها بەبێ شەرم کردن توورەیی خۆمان دەربڕین.

٣ـ جگە لەو حاڵەتانەی کە گیانمان دەکەوێتە مەترسییەوە، دەتوانین هەستەکانی خۆمان دەربڕین. دەتوانین توورەیی خۆمان رابگەیەنین بەو مەرجەی هێدمە بەڕەوشت و کەسایەتیی منداڵ نەگەیەنین. بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی توورەیی دەبێ هەمووکاتێ ئەم بنەمایە لەبەر چاو بگیرێت کە:

یەکەم هەنگاو بۆ زاڵبوون بەسەر هەڵچوونەکانماندا ئەوەیە کە هەڵچوونەکان بەدەنگێکی بەرزدەربڕین. ئەم کارە خۆی لەخۆیدا ئاگادارکردنەوەیەکی توورەکەرەکەیە بۆ هۆشیار بوونەوەو خۆ سازدان، بۆ نموونە:

ـ هەست بەبێزاری دەکەم!

ـ ناڕەحەتم!

ـ لەباری ئاساییدانیم!

ـ توورەم!

هەرکاتێ ئەم ڕستە کورتانەو نێو چەوانی گرژ بۆ هۆشداری دان بەکەسی بەرانبەر بەس نەبوو پەنا دەبینە بەر هەنگاوی دووەم

بەشێوەیەك تووڕەیی خۆمان توندتر دەردەبڕین:
- من زۆر تووڕەم!
- خەریکە بەتەواوی ئیمان لەکەللەمدا نامێنێ!
- ئەوەندەی نەماوە لەتووڕەییان بتەقم!
ڕەنگەهەندێ جار ئامازەکردنی ئێمە (بەبێ ڕوونکردنەوەی زیاتر) ببێتە هۆی ئەوەی ڕێگا لەرەفتاری ناپەسندی منداڵ بگرێت. رەنگەلەهەندێ باری ناسکدا پێویست بکات پەنا ببەینە بەر هەنگاوی سێیەم. بەم شێوەیە کەهۆی تووڕەبوونی خۆمان دەربڕین کاردانەوەی دەروونیی خۆمان هەڵبڕژێنینە بەردەم منداڵ و ئەو هەنگاوە دڵخوازە شیبکەینەوە کەلە منداڵانمان دەوێت و چاوەڕوانیمان لێیان هەیە، بۆ نموونە ڕەنگە بڵێین:
- کاتێ دەبینم پێڵاو و جانتاو کراس وکتێبت هەریەکەو لەگۆشەیەکدا کەوتووە ئەوەندە تووڕەدەبم دەمەوێ هەموویان لەپەنجەرەوە فرێدەمە کۆلان.
- زۆر تووڕەدەبم کە دەبینم لە براکەت دەدەیت،بەڕادەیەك کە چاوم تاریك دەبێت و خوێنم دەجۆشێ. هەرگیز ناتوانم مۆڵەت پێبدەم لە براکەت بدەیت! - کاتێ دەبینم هەموتان پێکڕا بۆ بینینی تەلەفزیۆن لە ژووری نانخواردن دەچنە دەرەوەو تەواوی قاپە پیسەکان بەجێدەهێڵن تاکو من بیانشۆم، وەهائاگر دەگرم بەبێ ویستی خۆم دەست بۆ قاپەکان دەبەم تاکو هەموویان هەڵگرم و بە تەلەفزیۆنەکەی دابدەم.
- کاتێ بۆ نانخواردنی ئێوارە بانگت دەکەم و نایەیت، زۆر تووڕەدەبم و بەخۆم دەڵێم:(ئەم هەموو زەحمەتەم کێشاوەو خواردنێکی چاکم لێناوە، ئەوانیش لە جیاتی ئەوەی دەستخۆشیم لێبکەن دەمڕەنجێنن.)
ئەم جۆرە رستەو ڕوونکردنەوانە مۆڵەت بەدایك و باوکان دەدات بەبێ زیانگەیاندنی زۆر تووڕەیی خۆیان دەربڕن. بەپێچەوانەش ڕەنگە پەندودەرسی گرینگ وسوودمەندی بۆ منداڵ هەبێت سەبارەت بەدەربڕینی تووڕەیی خۆی بەشێوەیەکی بێ مەترسی. ڕەنگە منداڵ ئەوە فێر نەبێت کە تووڕەیی ئەوەندە مەترسیدارنییە وە دەتوانرێت بەبێ زیانگەیاندن بەکەسێکی دیکەپیشان بدرێت.
بەڵام بۆ ئەوەی منداڵان باشتر سوود لەو دەرس و پەندە وەربگرن نابێ دایك و باوك

تەنیا بە دەربڕینی تووڕەیی واز بهێنن ،بەڵکو دەبێ منداڵانی خۆیان بەڕێگە پەسەندەکانی پیشان دانی سۆزەکان وشێوە بۆ مەترسییەکانی رزگار بوون لە تووڕەیی ئاشنا بکەن. مەسەلەی دۆزینەوەی چەند رێگایەکی جێگیرەوەی گونجاو بۆهەستە شێوێنەرەکان لەبەشی پێنجەم دا بەدووروو درێژی دەخرێتە بەرباس.

## بەشی سێیەم

## خۆپاراستن لە ڕێگا نەشیاوەکانی پەروەردە و فێرکردن.

- هەڕەشە.
- بەرتیل.
- بەڵێن دان.
- تانەو تەشەروو گاڵتە پێکردن.
- سیاسەتی درۆزنی.
- ڕێگەگرتن لە نادروستییەکانی منداڵ.
- دزی.
- فێرکردنی دابونەریت و ئەدەب: بەتوندوتیژی یان میهرەبانی؟

هەندێ ڕێگای پەروەردەکردن هەمیشە ئەنجامی پێچەوانەیان هەیە: ئەم ڕێگایانە نەك هەر مرۆڤ ناگەیەننە کە نارەکانی مراز، بەڵکو دەبنە هۆی سەر لێشێواندن و گومڕایی. ئەم ڕێگایانەش بریتین لە هەڕەشەو بەڵێن وگاڵتەپێکردن و ئامۆژگاری و وتاردان بۆ منداڵ دەربارەی درۆزنی و دزی و ڕێگا توندەکانی پەروەردە.

هەڕەشە بانگەشەیەك بۆنوێکردنەوەی بەدخوویی؛

لەراستیدا هەڕەشەکردن وەکوو ئەوە وایە کەئێمە هانی منداڵ بدەین کاریناپەسندو ناشرین بکات. کاتێك بە منداڵێك دەڵێین:(ئەگەر بۆجارێکی دیکە کارێکی وابکەیت) منداڵەکەگوێی لەبڕگەی(ئەگەرتۆجارێکی دیکەنابێت) بەڵکوتەنیا گوێی لە(جارێکی دیکە)دەبێت, هەندێ کات لەبەرخۆیدا قسە پڕهەڕەشەکانی دایکی بەم شێوەیە لێکدەداتەوە:(دایکم چاوەڕوانەجارێکی دیکەئەم کارە دووبارەبکەمەوە ئەگەرنادڵی دەڕەنجێت.)بەکارهێنانی ئەم جۆرە ئاگادارکردنەوانە ڕەنگە لە ڕوانگەی گەورانەوە سوودمەند بێت بەڵام بەهیچ شێوەیەك بەرانبەر منداڵان سوودبەخش نییە.لەراستیدا هەڕەشە مانای بەرپەرچدانەوەی سەربەخۆییەکانی منداڵە. ئەگەر منداڵ پابەندی گەورەیی نەفسی خۆی بێت, دەبێ سەر لەنوێ هەمان کار دووبارە بکاتەوە تا بۆ خۆی و خەڵکانی دیکەی بسەلمێنێ کە بێ توانا و مردەڵە نییە.

(ئۆلیڤەری) (olivere)ی (٥) ساڵە. لەگەڵ ئەوەی دایکی چەندین جار ئاگاداری کردەوە هەر تۆپی بەرەو پەنجەرە دەهاوێشت. لە ئەنجامدا کاسەی سەبری دایکی پڕبوو و لەسەری ڕژاو ئاوای پێگوت:(ئەگەر جارێکی دیکە تۆپەکە بەرەو پەنجەرە بهاوێیت لەماڵەوە دەرتدەکەم. پاش دەقیقەیەك دەنگی شکانی شووشەی پەنجەرە پیشانی دا کە هەڕەشەی دایکی کاریگەریی پێچەوانەی هەبووە, تۆپەکە بەتوندییەکی زیاترەوە بەر پەنجەرەکە کەوتەوەو ئاکامی پێشهاتەکانی وەك هەڕەشەو نارەزاییە توندترەکەی دایك و سەرسەختیی زیاتری منداڵەکە و رقوتووڕەیی هەردووکیان هەر لەسەرەتاوە پێشبینی دەکرا.

بەپێچەوانەوە ئەم ڕووداوەی خوارەوە نموونەیەکی سەرنجراکێشە بۆ پێشاندانی پێشگیری لەکاری ناپەسند بەبێ ئەوەی پەنا بۆ هەڕە شەکردن ببردرێت:

(پیتەر) (peter) ی (٨) ساڵە. بەتفەنگۆکەکەی خۆی تەقەی لەبراکەی دەکرد و دایکی گوتی:(تەقە لە منداڵەکە مەکە دەبێ تەقە لە نیشانە بکەیت) پیتەر سەر لەنوێ تەقەی لە منداڵەکە کردەوە دایکی تفەنگۆکەکەی لەدەستی دەرێناو پێیگوت:(هەرگیز نیشانە لەمرۆڤ ناگیرێت). بەم ڕێگایە دایکەکە ئەوەی کە دەبوایە بۆ پاراستنی منداڵەکەی بیکات, ئەنجامی داو لە هەمان کاتیشدا بەشێوەیەکی گونجاو و ئاقڵانە پیتەری بە هەڵەکانی خۆی ئاشناکرد

(پیتەر) لەئاکامەکانی کارە ناپەسندەکانی خۆی ئاگاداربۆوە بێ ئەوەی نەفسبەرزییەکەی بریندار بکرێت بەشێوەیەك کەخۆی لە دووریانێکدا ئەوزیەوە دەبوایە لەدوو رێگا یەکێکیان هەڵبژێرێت، یان تەقە لەنیشانە بکات یان دەست لەتفەنگەکەی بشوات.

لەم رووداوە دایکەکە خۆی لەچاوسوورکردنەوە باوەکان بە دوورخستەوە کە لەم جۆرەحاڵەتانەدا بەکاردەبرێت وپەنای بردە بەرهەرەشە ئاساییەکانی وەك: (پیتەر تفەنگەکەت دانێ سەر زەوی! نیشانەیەکی باشترت نەدۆزیەوە تەقەی لێ بکەیت براکەت نەبێت؟ ئایا نیشانەیەکی باشترت نییە؟ ئەگەر ئەم کارە دووبارە بکەیتەوە ئیدی تفەنگۆکەکە بەچاوی خۆت نابینیتەوە) ،کاریگەریی ئەم جۆرە هەرەشە توندانە (تەنیا بەرامبەر منداڵە ترسنۆك و لاوازەکان نەبێت) جگە لەدووبارە کردنەوەی کاری ناشیرین بەولاوە ئەنجام و شوێنەوارێکی دیکەی نابێت، ئەو دیمەنانەی کە لەپاش پێداگرتن وسوور بوون لە سەر ئەو شێوازە هەڵەیە دێنە ئاراوە لای هەموو کەس روون و ئاشکرایە.

## بەرتیل

یەکێك لەرێگا نادروستەکانی پەروەردەو فێرکردن ئەوەیە کە کاتێك منداڵ کارێك ئەنجام دەدات یان ئەنجام نادات، بەڵێنی پێدەدرێت کە دیارییەکی باش وەردەگرێت.

(ئەگەر براکەت ئازار نەدەیت و ئاقڵ بیت دەتبەمە سینەما!) (ئەگەر پێخەفت تەڕ نەکەیت چێژنی نەورۆز پاسکلێکی باشت بۆ دەکڕم!) (ئەگەر هۆنراوەکە جوان لەبەر بکەیت دەتبەمە بەلەمسواری!)

ڕەنگە ئەم ئەگەرانە بۆگەیشتن بەمەبەستی یەکسەرو هەنووکەیی پاڵ بەمنداڵەوە بنێت، بەلام بەدەگمەن هانی دەدات تاکو بەردەوام کۆشش بکات بۆ گەیشتن بەئامانجە دوورترەکان. هەر ئەو ئەگەرانە ئەوە پیشاندەدەن کە ئێمە لەبەرانبەر لێهاتوویی و توانای شایستەیی منداڵەکە بۆ باشترکردنی بارودۆخی خۆی دوودڵین. کاتێ کە دەڵێین:(ئەگەر هۆنراوەکە بەباشی ئەزبەر بکەیت) مانای ئەوەیە کە

:(دڵنیانیم بتوانیت ئەم هۆنراوەیەئەزبەر بکەیت) کاتێك دەڵێین (ئەگەر پێخەفت تەڕنەکەیت), مانای ئەوەیە کە (لەو بڕوایەدانیم خۆت رابگریت!)

جگە لەمانەش.بەرتیلدان ئەنجامێکی ڕەوشتیی خراپیشی هەیە. دروتی بارۆخ (DOROTHY BARUCH) لەگەڵ ڕەخنە گرتن لەبەرتیلدان نموونەی کوڕێکی بچووك دەهێنێتەوە کە ئاوای پێگوتبوو:(کاتێ وانیشان دەدەم کەوا کارێکی خراپ دەکەم,دایکم ناچار دەکەم کە هەر چی دەمەوێت بمداتێ, ئاساییە هەندێك کات دەبێ بیسەلمێنم کە بەئەندازەی پێویست بەدم تائەو بزانێت کەبەخۆڕایی بەرتیلم ناداتێ!). ئەم جۆرە ئاکارە بەرەبەرە بەچەرچیەتی کردن لەسەر زیادکردنی رێژەی بەرتیل و هەلپەیەکی زیاتر بۆ بەدەستهێنانی هەقدەستی زیاتر لە بەرانبەر رەفتاری چاك کۆتایی دێت. هەندێ لە دایك و باوکان لەرووی بەرتیلدان ئەوەندە لەژێر ویستی رۆڵەکانی خۆیاندان کە بەدەگمەن بەدەستی بەتاڵ دەگەڕێنەوە ماڵەوە ,لە جیات ئەوەی منداڵانیان بە (بەخێرهاتییەوە بابەگیان) پێشوازییان لێبکەن بە(چیت بۆمن کڕیووە) پێشوازییان لێدەکەن. ئەوکاتە دیاری کاریگەرو دڵخۆشکەر دەبێت کە بەبێ ئاگاداری پێشترو بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو تەنها وەك رێزوستایش و هاندانی بەجێ بدرێتە منداڵان.

## بەڵێنە بێجێ و دوور و درێژەکان

هەرگیز نابێ بەڵێن بەمنداڵ بدرێ یان بەڵێنێکی وا لە منداڵ بخوازین کە نەتوانێ بیگەیەنێتەسەر.بۆ دەبێ قەول و بەڵێن تائەو ئەندازەیە لەگۆڕێدابێت؟ ئایا واباشترنییە کە پەیوەندیی ئێمە لەگەڵ منداڵەکانماندا لەسەر بناغەی پشت بەیەکتر بەستنێکی هاوتاو تەواو تۆکمە بکرێت و دابڕێژرێت؟ کاتێ کە باوك یان دایکێك (بەڵێنێکی مکوڕانە) بەمنداڵەکەی دەدات کە کارێکی بۆ ئەنجام دەدات,مانای ئەوەیە کە قسەکانی دیکەی دایکەکە جێگای پشت پێبەستن نین و لەنێوان بەڵێنی پێداگرانەو بەڵێنە ئاساییەکانی ئەودا جیاوازییەکی زۆر هەیە. بەڵێنی دوور و درێژو خەیاڵخولقێن پێشبینی و چاوەڕوانیی ناڕاستەقینە لە منداڵاندا دروست دەکات. کاتێ بە مکوڕی بەڵێنێك بەمنداڵێك دەدەن کە هەڵبەتە بیبەنە باخچەی ئاژەڵان, منداڵەکە ئەم بەڵێنە بە بەڵێنێکی پتەوونەگۆڕ لەقەڵەم دەدات بەو مانایەی کە ئەگەر گریمان

لەرۆژی بەڵێندراو کەشوهەوا بارلناوی بوو یان ئوتومبێلەکە کارنەکات یان خۆی نەخۆش بێت, بەهەر جۆرێك بێت هەردەبێ بچێتە باخچەی ئاژەڵان. لەبەر ئەوەی ژیان پڕە لە رووداوی چاوەڕواننەکراو ئەگەر بەڵێنەکان بشکێن منداڵان ئەو ئەنجامە وەردەگرن کەفریودراوون و دایك و باوکان ئەوەنین پشتیان پێ ببەسترێ. سکاڵاباوەکەی منداڵان (ئاخرتۆخۆت بەڵێنت دابوو!) بەردەوام لەگوێی زۆربەی ئەودایك و باوکانە دەزرینگێتەوە کە لە بەڵێندانی ئەستەم پەشیمانن. کاتێ منداڵ ناچاردەکەین بەڵێنێکمان پێبدات تاکو خووڕەوشتی خۆی باش بکات, یان لە رەفتارە نا پەسندەکانی پێشووی دەست هەڵبگرێ ,ئەنجامێکی ئەو تۆی نییە. ئەگەر منداڵ بە ویستو ئارەزووی خۆی بەڵێن نەدا وەکو ئەوەیە کە بکەوینە دوای سەراب وخەیاڵ, ئێمە هەرگیز نابێ هاندەری ئەم جۆرە هەنگاوە فریودەرانەیە بین.

### تانەو تەشەرو گاڵتە پێکردن کۆسپی گەورەی رێگای فێرکردنن.

کۆسپێکی گەورەی رێگای دابینکردنی دەروونددروستی و پێشکەوتنی پەروەردەو فێرکردنی منداڵ ئەوتیروتوانجانەن کەوا دایکوباوکان بەردەوام بەکاریان دەهێنن.

ـ دەبێ چەندجار شتێك دووبارە بکرێتەوە؟ مەگەر ئەتۆ کەڕی؟ بۆچی باش گوێ رانادێری؟

ـ جوولەیەکی چەندرندڵنەت هەیە؟ لە ج جەنگەڵێك پەروەردەکراویت؟ ئایا دەزانی کەمرۆڤێکی تەواو درندەیت؟

ـ نازانم چارەنووسی تۆ چیدەبێت! ئایا هەر بەڕاستی دەبەنگیت یان خۆت دەبەنگ پیشان دەدەیت؟ خۆم دەزانم چیت لێ دەردەچێت. ڕەنگە ئەم جۆرە دایك و باوکانە نەزانن کە لە راستیدا ئەم تیرو توانجەتیژانە هاندانی منداڵە بۆهێرشێکی بەرابەرو هاوتاو, هۆکارێکە بۆ پەیدابوونی هەستی تۆڵەخوازی لە دەروونی منداڵ و پەیوەندیی منداڵەکە لەگەڵ دایکوباوکی بەتەواوی دەشێوێ,بەهیچ شێوەیەك نابێ تانەوتەشەروقسەیناشرین لەپەروەردەکردنی منداڵدا بوونی هەبێت, باشتروایە لەبەکارهێنانی رستەی وەك (ئەم قسانە بۆتۆنەهاتووە), یان (وادەزانی کێیت؟), یان (زۆر لووت بەرزیت) بەتەواوی دوور بکەوینەوەو نابێ منداڵ ج بەئەنقەست وج بە هەڵە لەبەرچاوی خۆی و خەڵکانی دیکە بشکێنرێتەوە وسووك بکرێت.

## سیاسەتی درۆزنی

دایك و باوکان لەدرۆزنیی منداڵان ئەو پەڕی تووڕە دەبن بەتایبەت کاتێ کە درۆکە شاخداربێت و درۆزنیش ناشارەزا. زۆر دژوارە دایك یان باوك بەنکوڵیکردنی منداڵ رازیبێت لەسەر ئەوەی کەدەستی لەشووشەی مەرەکەب نەداوە یان بەدزی ساردەمەنییەکەی نەخواردووە لەکاتێکدا بە روونی شوێنەواری مەرەکەبەکە یان ساردەمەنی لەسەر جلوبەرگی یان روخساریدا دیارە.

### بۆچی منداڵ درۆ دەکات؟

هەندێ کات منداڵان بۆ ئەوە درۆدەکەن چونکە مۆڵەتیان پێ نادرێت راستییەکە بدرکێنن. کاتێك منداڵێك بەدایکی دەڵێت کە رقی لەبراکەی دەبێتەوە،رەنگە دایك بەرانبەرئەو راستگۆییە بەخێرایی شەقەزلەیەکی لەبنە گوێی بدات ,بەلآم کاتێك ئەو منداڵە پاش چەند ساتێك بەو پەڕی روونی و ئاشکراییەوە بە درۆبڵێت ئێستا براکەی خۆی خۆشدەوێت,رەنگەدایکی زۆر بەخۆشحاڵیەوە یەکسەر نوقمی ماچی بکات و پاداشتێکی باشیشی بداتێ. منداڵ لە تاقیکردنەوەیەکی لەم جۆرە چ ئەنجامێك وەدەست دەهێنێ؟ رەنگە ئەو ئەنجامە وەدەست بهێنێت کە راستگۆیی دەبێتە هۆی رەنجاندن و دڵشکاندن و,درۆزنیش ئاسوودەیی و رووخۆشی دروست دەکات و دایکی پاداشت دەداتە درۆزنە بچووکەکان. لەبەر ئەوە ئەگەر ئێمە خوازیاری فێرکردنی راستی و راستگۆیی بین دەبێ چۆن ئارام و لەسەرخۆگوێ لەراستییە شیرینەکانی منداڵ دەگرین. بەهەمان شێوەش گوێ لەراستییە تاڵەکانیشی بگرین. ئەگەر بڕیار ئەوە بێت کە منداڵ لەسەر راستگۆیی پەروەردە بکرێت,نابێ لە بەرانبەرهەستە باش و خراپ و دووفاقیەکانیشیەوە سەرکۆنەبکرێت,منداڵ تەنها لەبەرانبەرکاردانەوەی ئێمە سەبارەت بە هەستەکانی خۆی دەرك بەوە دەکات ئایا راستگۆیی رێگایەکی پەسەندە یان ناپەسەندە؟

ئەودرۆیانەی باس لەراستی دەکەن: کاتێك منداڵ بەهۆی راستگۆییەوە سەرکۆنە دەکرێت.لەپێناو خۆشویستنی خۆی وبەرگری لەخۆکردن لەخۆوە دەکەوێتە درۆکردن. هەروەها هەندێ جار بۆ ئەوە درۆ دەکات,تاکولەجیهانی خەیاڵی خۆیدابببێتە خاوەنی ئەوشتانەی کە لەجیهانی راستەقینەدا نییەتی, منداڵ بەهۆی

درۆکانییەوە باس لە دڵەڕاوکێ و نیگەرانی و نومێدەوارییەکانی دەکات. لەراستیدا ئەو درۆیانە ئەوشتانە پیشان دەدەن کە منداڵ دەیەوێ ئەنجامیان بدات ،مرۆڤی دەروونناس زۆر بەروونی دەزانێت منداڵ بە چ ئامانجێك درۆدەکات. کاردانەوەی ئاقڵانەی گەورەکان سەبارەت بەدرۆی منداڵان دەبێ لەسەر بناغەی تێگەیشتن و گرینگی پێدانی تەواو بێ, ئامانجی سەرەکی درۆیەکە نەك چاوپۆشین لە مانای راستەقینەی درۆیەکەو یان سزادانی منداڵ بۆ ئەوەی پەنا بەرێتە بەر درۆکردن. ئەو زانیاریانەی کە لەنێو درۆیەکانی منداڵدا هەن هۆکاری زۆر بەسوودن تاکو بتوانین بە هۆی ئەو زانیاریانەوە یارمەتیی منداڵ بدەین راستییەکان لە خەیاڵی شیرین جیابکاتەوە. کاتێك منداڵێك پێمان رادەگەیەنێت کە بەبۆنەی هاتنی جەژن فیلێکی زیندووی وەك دیاری وەرگرتووە،لەجیاتی ئەوەی یەکسەر پێی بڵێین (هەی درۆزن) زۆر بەجێیە کە ئاوای پێ بڵێین:

ـ تۆ بەڕاستی حەزت لەوەیە فیلێکی زیندووت هەبێت!

ـ تۆ زۆر حەز دەکەیت باخچەیەکی بچووکی ئاژەڵانت هەبێت!

ـ ئێستا پێم بڵێ بەبۆنەی جەژنەوە چ دیارییەکت وەرگرتووە!

هاندانی منداڵ بۆ درۆ کردن: ـ نابێ دایك و باوکان پرسیاری وا لە منداڵان بکەن کە ناچاربن بۆ وەڵامدانەوەو پارێزگاری لە خۆکردن درۆ بکەن. منداڵان رقیان لەوە دەبێتەوە کە تووشی لێپرسینەوەی دایك و باوکان ببن. بەتایبەتی کاتێك کە بزانن وەڵامی پرسیارەکانیان هەر لە سەرەتاوە روون و ئاشکرایە. بەشێوەیەکی گشتی بێزارن لەکەوتنە نێو داوی لێپرسینەوە, واتا هەڵبژاردنی درۆی مەسلەحەت یان دڵنیێدانانێکی نەویستراو.

جۆن (Joun) ی تەمەن حەوت ساڵە, ئەو تفەنگە نوێیەی شکاندبووکە تازە باوکی پێی دابوو, زۆر نارەحەت بوو وپارچە شکاوەکانی تفەنگەکەی لەژێر زەمیندا شاردبۆوە.کاتێك باوکی بەرێکەوت پاشماوەی تفەنگەکەی لە ژێرزەمینەکەدا دۆزیەوە،یەکسەر چووەلای منداڵەکەو بەپەلە چەند پرسیارێکی لێکرد کە بووە هۆی پەیدابوونی شەڕ و کێشەیەکی گەورە.

باوك: تفەنگەکەلە کوێیە؟

جۆن: ئێستا نازانم لە کوێیە. لە شوێنێکم داناوە.

باوک: ئەمدیوە یاری پێبکەیت.

جۆن: لەبیرم نییە لە کوێم داناوە.

باوک:زوو برۆ بیبینەوە. دەمەوێ بیبینم.

جۆن: لام وابێ یەکێك لێی دزیوم.

باوک: تۆ بەبێ شەرمیەوە درۆم لەگەڵدا دەکەیت! تفەنگەکەت شکاندووە, ولەزانی ئاوا بەسووك و ئاسانی چاوپۆشی لەم رەفتارەت دەکەم. یەکێك لەو شتە خراپانەی کە ئیمان لە کەللەمدا نایەڵێت درۆزنییە!. پاشان زللەیەکی وەهای لە پاشکۆی منداڵەکەی دا کە (جۆن) تاماوەیەکی زۆر هەر لەیادی نەدەچۆوە.

ئەم دیمەن و گفتوگۆیە بەتەواوی بێ بەرهەم بوو. لەجیاتی ئەوەی باوکەکە رۆڵی پۆلیسێکی پشکێنەر ببینێت و لێکۆڵینەوە لەگەڵ منداڵەکەیدا بکات زۆر باشتر بوو ئاوای بە جۆن بگوتایە:

ــ دەبینم کە تفەنگەکەت شکاندووە!

ــ پێموانییە لەوە زیاتر خۆی بگرتبایە.

ــ زۆر بەداخەوەم! دەزانی ئەم تفەنگەم هەرزان نەکڕیوە.

رەنگە منداڵەکە لەم گفتوگۆیەدا دەرسێکی گرنبەها وەربگرێت, بەومانایەی لەوانەیە ئاوای بەخۆی بگوتبایە:(باوکێکی وام هەیە بەباشی تێمدەگات.من دەتوانم سەربەستانە ئەو رووداوانەی بۆ باس بکەم کە بەسەرم دێن.دەبێ باشترئاگام لەو دیاریانەبێت کەپێم دەدات.

## پێشگیری لە ناڕاستیی منداڵ

رێگای ئێمە بەرانبەر درۆزنی بەتەواوی روون و ئاشکرایە:لەلایەك نابێت رۆڵی پشکێنەر ببینین یان پێدا بگرین لەسەر دانپیانانی منداڵ یان مێشی لێ بکەینە گامێش ,لەلایەکی دیکەشەوە دەبێ سپی هەر بەسپی ببینین نەك بەرەش. کاتێ کە دەبینین منداڵێك بۆ ماوەیەك کتێبێکی لە کتێبخانەدا خواستووەو هێشتا نەیگەڕاندۆتەوە نابێ ئاوای پێبڵێین: (ئایا کتێبەکەت گەڕاندۆتەوە بۆ کتێبخانە؟ئایادڵنیایت؟ بۆچی کتێبەکەت نەدلوەتەوە کتێبخانەو تاکوئێستا لەسەر

مێزەکەتە؟)
لەجیاتی ئەم ڕستانە دەبێ ئاوای پێبڵێین: (دەبینم کە وادەی دانەوەی کتێبەکە تێپەڕیووە.) کاتێ کەقوتابخانە ئاگادارمان دەکاتەوە کەمنداڵەکەمان لە تاقیکردنەوەی بیرکاریدا کەوتووە. نابێ لێی بپرسین: (ئایا لەتاقیکردنەوەی بیرکاریدا دەرچووی؟ دڵنیای؟ دڵنیابە ئەم جارە درۆی تۆ سەر ناگرێت. قسەم لەگەڵ مامۆستاکەت کردووە دەزانم بەشێوەیەکی شەرمەزارانە کەوتووی!).
لەجیاتی ئەمە دەبێ بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئاوا بەمنداڵ بڵێین: (مامۆستای بیرکاری دەیگوت کەلە تاقیکردنەوەی بیرکاریدا کەوتوویت لەبەرئەو زۆر ناڕەحەتین و دەمانەوێ بزانین بۆ یارمەتیدانت چ کارێکمان لەدەست دێت؟). بەکورتی مەبەستمان ئەوەیە کەنابێ منداڵ هانبدەین بۆبەرگری لەخۆکردن درۆبکات یان بە ئەنقەست زەمینە بۆ درۆزنیی ئەو بڕەخسێنین, کاتێ کە منداڵێك درۆدەکات, نابێ کاردانەوەی ئێمە پڕبێ لە زیادەڕۆیی ودرێژدادڕی, بەڵکو دەبێ لەسەر بناغەی ڕاستی و واقعیەت بنیاد بنرێت, دەبێ تەنیا ئامانجی ئێمە ئەوەبێت لەمنداڵ بگەیەنین کەهیچ پێویست ناکات درۆمان لەگەڵدا بکات.

## دزی

ئەوەندە نائاسایی نییە هەندێ کات منداڵان شتی وەها بهێننەوە ماڵەوە کە هی ئەوان نییە. کاتێ کە دزی منداڵ ئاشکرا دەبێت خاڵی گرینگ ئەوەیە کە لەبەرپاکردنی شەڕو هەرلو ئامۆژگاریی دوورودرێژ خۆمان بەدوور بگرین. ئێمە دەتوانین بەو پەڕی هێمنی و ئارامییەوە منداڵان بێنینەوە سەر ڕێگای ڕاست, بە جۆرێك کە بەهێمنی بەڵام بە ئاوازێکی پڕ لە مکوڕی پێیان بڵێین:
ــ ئەم ئۆتۆمبێلە هی یەکێکی دیکەیە. بیدەرەوە خاوەنەکەی!
ــ ئەم تفەنگە هی تۆنییە هەرچی زووترە بیگەڕێنەوە بۆ خاوەنەکەی.
کاتێك منداڵێك لە دووکانێك نوقڵێك دەدزێت و لەگیرفانی دەنێت. باشتر وایە کەبەبێ دەربڕینی تووڕەیی ئاگاداری بکەینەوە:
((ئەونوقڵەی خستۆتە گیرفانی چەپت دەبێ لەجێگای خۆی دایبنێیتەوە,هی ئێمە نییە.)) هەرکاتێك منداڵ پێ لەسەر ئەوە دابگرێ کەنوقڵەکەی نەبردووە ئامارە

بەگیرفانی دەکەین و پێی دەڵێین:((ئەم نوقڵەی کەلە نێو ئەم گیرفانەی تۆدایە هی دوکانەکەیە, خێرا لەشوێنی خۆی دایبنێوە)).
ئەگەرسەرلەنوێ خۆی لەفەرمانەکەی ئێمە بوارد ئەوکات دەستە نوقڵەکە لەگیرفانی دەردەهێنین وپێی دەڵێین:(پێمگوتی کەهی دووکانەکەیەو دەبێ لەجێگای خۆی دایبنێینەوە).

## کاری هەڵەونواندنی گونجاو:

کاتێ دڵنیان لەوەی کە کوڕەکەتان پارە لەجزدانەکەتان دەدزێ, نابێ پرسیاری لێبکەین ئایا ئەم کارەی کردووە یان نا. بەڵکو باشترە ئاوای پێبڵێین!:(تۆ لەجزدانەکەی من دۆلارێکت بردووە, بیخەرەوە شوێنی خۆی.) پاش ئەوەی پارەکەی خستەوە نێوجزدانەکە بە ئاولێکی زۆرجدییانە ئاگاداری بکەوە:( هەرکاتێك پارەت پێویست بوو بە من بڵێ تاکوقسەی لەسەر بکەین.)
ئەگەرمندالێ نکوڵی لە بردنی پارە کرد, نابێ دەمە تەقەی لەگەڵدا بکرێت و یان سوور بین لەسەر دانپیانانی مندالەکە بە هەڵەکەی خۆی, بەڵکو دەبێ تەنیا پێی بڵێین:(پارەکەت بردووەو بیخەرەوە شوێنی خۆی!). دەبێ ئەم خاڵە هەمیشە لە بیر نەکرێت کە هەرگیز نابێت منداڵ بەدز یان درۆزن لەقەڵەم بدرێت.یان پێشبینی بکرێت کەسەرئەنجام خۆی لە نێو ڕیزی خراپەکارانی زینداندا دەدۆزێتەوە. هەروەها هیچ سوودی نییە کە بەمنداڵ بگوترێت: (بۆ ئەم کارەت کرد؟) ڕەنگە بەخۆشی هۆیەکەی نەزانێ وفشاری ئێمە بۆ ناچارکردنی منداڵەکە تاکو هۆی ڕەفتارەکەی بڵێت تەنها وای لێدەکات پەنا بەرێتە بەر درۆیەکی دیکە.
زۆر بەجێیە کە وا لە منداڵەکەتان بگەیەنن هەرکاتێ پێویستی بە پارەبوو لەگەڵ ئێوەدا قسەبکات, بۆنموونە دەتوانرێت ئاوای پێبگوترێت:
- زۆر بەدلخەوەم کە بەمنت نەگوتووە پارەت پێویستە, هەرکاتێك پێویستت بەپارە هەبوو وەرە بەمن بڵێ تا قسەی لەسەر بکەین.ئەگەر منداڵەکەتان پێشوەخت ئاگادارکرابێتەوە کەنابێت دەست بۆ کێکە بە کرێمەکەی نێو بەفرگرەکە بەرێت و, کەچی بەنهێنی چەند دلنەیەکی لێ خواردبوون و پاشماوەی کرێمەکەش بەلایەکی

جلەکانییەوە دیاربوو نابێ پرسیاری لەم جۆرەی لێبکرێت:
ـ ئایا کەس دەستی لە کێکە بەکرێمەکانی نێو بەفرگرەکە داوە؟
ـ ئایا تۆ دەزانی کێ کێکە بەکرێمەکانی خواردووە؟ ئایا تۆ خواردووتە, دڵنیایت تۆ دەستت بۆ نەبردووە؟ ئەم جۆرە پرسیارانە وا لە منداڵ دەکات کە پەنا بەرێتە بەر درۆو بەم شێوەیەش تووڕەیی ورقی ئێمە توندتر دەکات. دەبێ هەمیشە لەم بارانەدا یاسای پەروەردە ئەوەبێت:
کاتی کە پێشوەخت وەڵامی پرسیارێك دەزانین دەبێ واز لەم پرسیارانە بهێنین. باشترە پێی بڵێین:
ـ ڕۆڵەگیان! لەگەڵ ئەوەی ئاگاداریشم کردبوویەوە کەچی کێکە بە کرێمەکانت هەر خواردووە؟ لەوکارەی تۆ زۆر ناڕەحەت و بەداخم.تەنها ئەم رستەیە خۆی لە خۆیدا لێدانێکی زۆر بەجێیە, چونکە جۆرێك هەستی پەشیمانی لە منداڵ پەیدادەکات و پاڵی پێوە دەنێت تاکو بیر لە چاککردنەوەی رەفتاری خۆی بکاتەوە.

## فێرکردنی دابونەریت و ئەدەب بە توندو تیژی یان بەمیهرەبانی؟

نموونەتایبەتییەکان ونەریتەکۆمەڵایەتیەکان: دابونەریت وئەدەب وپەروەردە هەم تایبەتمەندیی خوودی مرۆیی و هەم شارەزاییەکی کۆمەلایەتییە کە لەرێگای لاسایی کردنەوەی دایك و باوکی بەئەدەب و تەربیێت بە دەست دێن. بەشێوەیەکی گشتی لەهەموو هەلومەرجو بارەکاندا دەبێ منداڵ بە خۆشرویی و ومیهرەبانییەوە فێری ئەدەب وتەربیێت بکرێت, لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا زۆرن ئەو دایك و باوکانەی کە لەم رووەوە توندو تیژییان لە نەرمی و میهرەبانی پێ باشترە. کاتێ کە منداڵێك لەبیردەکات بڵێت (سوپاس) دایك و باوکی یەکسەر لەبەردەم خەڵکی تانەی لێدەدەن کە منداڵێکی بێ تەربیێتە ، زۆربەی جار دەبینرێت دایك و باوکان لەنێو خەڵکیدا بەرلەوەی خۆیان خوا حافیزی بکەن بەخێرایی منداڵە بچوکەکەی خۆیان ئاگاداردەکەنەوە کە بڵێت:(خوا حافیز).
ڕۆبێرت ((Robert)ی تەمەن شەش ساڵە دیارییەکی وەرگرتووەو بەهەستێکی وردبینانەو بەخۆشحاڵییەوە هەوڵ دەدات کارتۆنی دیارییەکە بکاتەوە, تاکو بزانێت

چی لەنێو دایە.
دایك: رۆبێرت! کارتۆنەکە مەکەرەوە! تێکی دەدەیت! کاتێك دیاریت پێ دەبەخشن دەبێ یەکسەر چی بڵێیت!؟
رۆبێرت: (بەئاوازێکی تووڕەوە): دەبێ بڵێین سوپاست دەکەم!
دایك: ئێستا کوڕێکی چاکیت!
دایکەکە دەیتوانی ئەم ئەرکە پەروەردەییە بە شێوەیەکی نەرمترو کاریگەرییەکی زیاترەوە ئەنجام بدات. بۆ نموونە دەیتوانی روو لە بەخشەری دیارییەکە بکات و ئاوای پێبڵێت:
پورە پاتریشیا ((Patricia) (زۆر سوپاست دەکەم بۆ ئەم دیارییە, زۆر جوانە), ئەگەر وای بگوتبایە ئەگەری ئەوە زۆر هەبوو کە رۆبێرتیش لاسایی دایکی بکاتەوە و سوپاسی پووری بکات , ئەگەر وای دابنێین سوپاسیشی نەکردبایە, دەبوایە پاشان کە خۆی و مندالەکەی بەتەنیا دەمانەوە مەسەلەکەی بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ بە مندالەکەی بگوتبایە, بۆ نموونە دەبوایە ئاوای پێبڵێت: ((دەبێ زۆرسوپاسی پورە پاتریشا بکەین کەتۆی لەیادبووەو ئەم دیارییە جوانەی بۆ هێناویت, وەرە با سوپاسنامەیەکی بۆ بنووسین. بەبێ شك ئەویش دڵخۆش دەبێت بەوەی کە ئێمە ئەومان لەیاد بووە.
ئەگەر چی شێوەی پەروەردەکردن لە ئاگادارکردنەوەیەکی راستەوخۆ دژوارترە, بەلام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کاریگەرییەکی زیاترو باشتری هەیە. جوانییەکانی دابونەریتی ژیان هەرگیز لەگەڵ توندوتیژی ناگونجێت.کاتی مندال قسەی گەورە سالان دەبڕێ, زۆربەی جار گەورە سالان بەتووڕەییەوە کاردانەوە لە بەرانبەرئەم رەفتارەی مندالان پیشان دەدەن: ((قسە مەکە! چەند جار پێمگوتووی کاتێ گەورە قسان دەکەن قسەکانیان مەبڕە؟) بێ ئاگا لەوەی کە ئەم جۆرە قسە بڕینانەی مندالیش خۆی لە خۆیدا هەلقوولاوی بێ ئەدەبیە. بەشێوەیەکی گشتی دایك وباوکان هەرگیز نابێ لەفێرکردنی ئەدەبدا توندوتیژی لەهەمبەر مندالەکانیاندا بنوێنن. رەنگە واباشتر بێ بڵێین: (لێگەڕێ بامن قسەکەم تەولو بکەم, نۆرەی تۆش دێت.) ئەگەر بەمندال بلێین (تۆئەدەبت نییە) هەرگیز ئەم قسەیە مندالەکە بەرەو

ئاقاری ئەدەب و نەریت نابات. بەپێچەوانەوە مەترسیی ئەم قسەیە لەوەدایە کەڕەنگە منداڵەکە ئەم هەڵسەنگاندن و بۆچوونەی ئێمە قبووڵ بکات و بەراستی خۆی بەمنداڵێکی بێ ئەدەب بێتە بەرچاو و کاتێکیش ئەم بڕوایەش لەزەینیدا ریشەی داکوتا،هەوڵدەدات درێژە بە بێ تەربیێتی بدات. لەبەرئەوەی بێ تەربیێتی کردن بۆ مرۆڤی بێ تەربیەت کارێکی ئاساییە. هاتووچۆکردنی ماڵی هاوڕێ و خزمان هەلێکی گونجاو و باشە تاکو بە هۆیەوە منداڵ فێری داب ونەریت وئەدەب بکرێت. ئەم بینین وسەرلێدانانە هەم بۆ دایك و باوك وهەم بۆمنداڵان ئاقڵانە ودڵخۆشکەرن و لەهەمان کاتیشدا هەوا گۆڕینە. ئەم سەرگەرمی و هەوا گۆڕییە لەوکاتەدا خۆشتر دەبێت کە لێپرسراویەتیی رەوشت ورەفتاری منداڵ بخرێتە سەرشانی خودی منداڵ و خانەخوێیەکە.

(دەست تێوەردانی ئێمە دەبێ تەنیا ئەوەندەبێت کەباس لەهەستەکانی منداڵەکە بکەین)، منداڵ بەم شێوەیە فێری ئەوە دەبێ کە ئێمە حەزناکەین لەماڵی خەڵکانی دیکە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکەین و بەم شێوەیە ڕەنگە بە خراپی سوود لەم تێبینییەی ئێمە وەربگرن و باشترین ڕێگا بۆ ڕوویەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم سوود وەرگرتنە خراپەی منداڵ ئەوەیە کە بەتەواوی خانەخوێ لە پاراستنی پرەنسیپی ماڵی خۆیدا سەربەست بکەین.کاتێ منداڵێك بەپێ دەچێتە سەر قەنەفەی پوورە ماری((Marry). لێبگەڕێین خودی پوورە ماری ڕوونی بکاتەوە،کە ئایا دەکرێ بەپێ بچینە سەر قەنەفە یان نا؟ بەگشتی منداڵان زیاترگوێ لە قسەی خەڵکانی دیکە دەگرن هەتاهی دایك و باوکیان. دایك کەبەم شێوەیە لە لێپرسراویەتی دەربازی دەبێت،دەتوانێ بەشێوەیەکی تایبەتی منداڵەکەی بە سنووری تەربیەتی دەرەوەی ماڵ ئاشنابکات،بۆ نموونە: دەتوانێ بەهێواشی بەگوێی منداڵەکەیدا بچرپێنێ: (چیمان پێ دەکرێ؟ تاکو لەماڵی پوورە"ماری" ئەم شتانە رەچاو بکرێن)، بەڵام ئەم شێوازە تەنیا ئەوکاتە دەتوانرێت بەباشی بەکاربرێت کەپێش وەخت لەنێوان خانەخوێ و مێواندا هەماهەنگی دەربارەی سنووری لێپرسراویەتیی هەریەکێکیان باسی لێوەکرابێت و ڕێککەوتبن. مافی خانەخوێیە کە داوا لەمیوان بکات پرەنسیپەکانی ماڵەکەی رەچاو بکات و لەسەر میوانیش پێویستە کە بەشێوەیەکی

كاتێ پەروەردەی منداڵ بداتە دەست خانەخوێ. دایك بە دەستێوەرنەدانی بەجێ، یارمەتییەكی كاریگەری منداڵەكە دەدات بۆ ڕەچاوكردن و دەرككردنی ئەو هەلومەرجەی تێیدایە.

# بەشی چوارەم:
# لێپرسراویەتی و سەربەخۆیی

ـ لێپرسراویەتی: کارەکانی ڕۆژانە و بەهاکان.
ـ ئامانجە پەسەند و باشەکان و کارەکانی ڕۆژانە.
ـ بەرنامە نزیك و دوورەکان.
ـ لە شەڕەوە بۆ ئاشتی.
ـ لێپرسراویەتی: مافی رادەربڕین و هەڵبژاردن.
ـ خۆراك.
ـ جلوبەرگ.
ـ ئەرکی ماڵەوە.
ـ وانەکانی مۆسیقا.
ـ خەرجیی ڕۆژانە (پارەی گیرفان).
ـ هاوڕێیان و هاوگەمەکان.
ـ بەخێوکردنی ئاژەڵە ماڵییەکان
ـ رستەکان ـ هاندانی گیانی سەربەخۆیی.

## لێپرسراویەتی: کارەکانی ڕۆژانە و بەهاکان

دایکان وباوکان بەردەوام هەوڵ دەدەن چەند ڕێگایەك بدۆزنەوە تاکو بە هۆیانەوە وا لە منداڵەکانیان بکەن هەست بە لێپرسراوی بکەن، لە زۆربەی ماڵەکاندا کارە ئاساییەکانی ڕۆژانە بەباشترین هۆکار دادەنێن تاکو بە هۆی ئەو کارانەوە منداڵ فێری ئەوە بکەن هەست بەلێپرسراوی بکات. بەتاڵکردنی سەتڵی خاشاك و خۆڵی کۆکراوەو برینەوەی فریز لە ڕوانگەی زۆربەی باوکان لە فێرکردنی هەستی لێپرسراویەتیی کوڕەکاندا کاریگەرییەکی فراوانی هەیە ،هەروەها ژمارەیەکی زۆری دایکان وادەزانن کە بەهاندانی کچان بۆقاپشۆری یان ڕێکخستنی پێخەف بناغەیەکی پتەویان لە فێرکردنی لێپرسراویەتی بنیاتناوە، لەراستیدا ئەگەرچی کارە ئاساییەکانی ماڵەوە لە ڕووی پاراستنی ڕێکوپێکی و خۆشی ژیان زۆر گرینگە، لەگەڵ ئەمەشدا ڕەنگە لە پەیداکردنی هەستی بەرپرسیاریەتیی منداڵدا هیچ جۆرە شوێنەوارێکی نەبێت، بەپێچەوانەوە لەهەندێ ماڵدا ئەنجامدانی ئەرکەکانی رۆژانە دەبێتە هۆی پەیداکردنی کێشمەکێش و پێکدا هەڵشاخانی بەردەوام ،هەروەها دەبێتە هۆی دروست کردنی توورەیی و ناڕەحەتی لەنێوان دایك و باوك ومنداڵاندا. کاتێك فشاری توند دەخەینە سەر منداڵان بۆ ئەوەی لەماڵەوە کارێکی پەسەند ئەنجام بدەن ،ڕەنگە بە پەیداکردنی هەستی گوێڕایەڵی و فەرمان جێبەجێکردن لەلای منداڵان و سوود وەرگرتن لە موبەق و حەوشەی پاك کۆتایی پێبێت، بەڵام جگە لەمەش دوورنییە شوێنەوارێکی خراپ لە قاڵبڕێژیی خوو و کەسایەتیی ئەواندا هەبێت.راستییەکەی ئەوەیە کەناتوانرێ هەستی لێپرسراویەتی بەزۆر بسەپێندرێ. بەڵکو تەنیا دەبێ هەستی لێپرسراویەتی لەناوەوەی مرۆڤدا چەکەرە بکات و بەهۆی وەدەستهێنانی بنەما بەهادارە ڕەوشتییەکانەوە لەماڵەوەو لەکۆمەڵگادا پەروەردەبکرێت. ئەو لێپرسراویەتییەی کە لەسەر بناغەی بەهادار دانەڕێژرابێت وبینا نەکرابێت،دژە کۆمەڵ وماڵشێوێنە.ئەندامانی زۆربەی ڕێکخراوە نهێنی و تاوانکارەکان بەشێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر لە هەمبەر یەکتری و دەستەوگرووپی خۆیاندا هەست بەلێپرسراوی دەکەن و وەفاداری پیشان دەدەن ،زۆربەی جار فەرمانەکانی گەورەکانی خۆیان بەبەهای لەدەست دانی گیانی خۆیان مووبەموو جێبەجێ دەکەن.

## سەرچاوەکانی لێپرسراویەتی:

کاتێك بەراستی بمانەوێت منداڵەکانمان خاوەنی هەستی لێپرسراویەتی بن. دەبێ هەوڵ بدەین ئەم هەست بەلێپرسراویەتیکردنە لە بنەما بەرزو بەنرخەکانی ڕەوشتەوە سەرچاوە بگرێت . دەتوانرێت هەندێ لەم بنەمایانە وەکو ڕێزدانان بۆ ژیان و رووکردنە خێرو چاکەی مرۆیی ناو ببرێن. بەواتایەکی دیکە:دەبێ هەستکردن بەلێپرسراویەتی پشت بەستوبێت بەرێز گرتن لە ژیان و ئازادی و گەڕان بەدوای خۆشبەختیدا. بەگشتی ئێمە مەسەلەی لێپرسراویەتی لەچوارچێوەیەکی تەواوو فراوان لەبەرچاو ناگرین بەڵکو هەستی لێپرسراویەتی و هەروەها نەبوونیشی لەشتە هەستپێکراوەکاندا دەبینین. بۆنموونە هەر لەگەڵ ئەوەی ژووری کاری منداڵێکمان بەشەپرێوی بینی یان لە مەشقی پیانۆدا بە پێی پێویست پێشنەکەوتبێ یان هەستی گوێڕایەڵیی لەجاران سستربێت ,ڕەفتاری توندوتیژ بێتە بەرچاومان ئەو ئەنجامە وەدەستدەهێنن کە هەستی لێپرسراویەتی تێدانییە.

لەگەڵ ئەمانەشدا ڕەنگە منداڵێك زۆر بەئەدەب بێت وخۆی و ژوورەکەشی پاك و خاوێن ڕابگرێت و کاروبارەکانی خۆی بە وردی ئەنجام بدات, بەڵام رەنگە هەندێ بڕیاری وەهابدات کەدژی هەستی لێپرسراویەتی بێت. ئەم ڕاستییە بەتایبەت لەو منداڵانەجێدەگرێت کە بەردەوام لەلایەن گەورەکانیانەوە ڕێنمایی دەکرێن و دەرفەتێکی کەمیان هەیە تاکو شتەکان لێکبکەنەوە یان بەدەروونی خۆیان دابێنەوە, کاردانەوەی سۆزیی دەروونی منداڵ لەبەرانبەر فەرمانەکانی ئێمەدا هۆکارێکی بێ ئەملاولایە بۆتاقیکردنەوەی ئەنجامی پەروەردەو فێرکردنەکانی ئێمە. ناتواندرێ بنەما رەوشتییە بەهادارەکان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ فێری منداڵ بکرێ, بەڵکو منداڵ ئەم بنەمایانە تەنها لەرێگای لاساییکردنەوەو ڕۆیشتن لەسەر ڕێگەی ئەو کەسانەوە فێردەبێت کە جێگای خۆشەویستی و ڕێزی ئەوین.

بەم شێوەیە مەسەلەی هەستی لێپرسراویەتی منداڵان بەرەو رووی دایك وباوك دەبێتەوە یان بە واتایەکی دیکە نموونەو نەخشەی هەستی لێپرسراویەتخوازیی منداڵان ئەو بنەما رەوشتی و بەهایانەیە کە دایك وباوکان لەکاتی پەروەردەکردن و فێرکردندا پیشانی منداڵەکانیان دەدەن. ئێستا ئەومەسەلەیەی کە دەبێ لەم

ڕووەوە لەبەرچاو بگیرێت بەم شێوەیەی لێدێت:(ئایا ڕێگاو کاردانەوەیەکی راشکاو و دیاریکراو هەیە کە بتوانیٚ لە دەروونی منداڵەکانماندا هەست بە لێپرسراویەتیکردنێکی گونجاوویەسند هەوێنبکات؟ هەوڵدەدەین لە بەشەکانی داهاتوودا بەشێوەیەکی دەروونناسی وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە.

## ئامانجە پەسند وباشەکان و کارەکانی ڕۆژانە

دەرکەوتنی هەستی لێپرسراویەتی لەلای منداڵان لە کرداری کارزانیی دایک و باوکانەوە هەڵدەقوڵێت. ڕێگاکان ،بەتایبەت حەزو ویستی دایک و باوك بۆسەربەستکردنی منداڵان لە دەرککردن بە گشت هەستەکانی خۆیان هەڵدەقوڵیٚ، کارزانیش زیاترشارەزایی دایك و باوکانە لەرێنماییەکی پەسەندی ئەوهەستانە بۆ دەرکەوتنی لەدەروونی منداڵەکان، ئاشکرایە کەگرفتەکانی سەرێی ئەم دوو مەرجە لە ئەندازە بەدەرن:سەرەتا ئەوەیە کە دایك و باوکان و مامۆستایانی خۆمان بەپێی پێویست ئێمەیان ئامادە نەکردووە رووبەڕووی سۆزەکانی خۆمان ببینەوە، چونکە خۆشیان کەمتر توانیویانە لە بەرانبەر هەستە توندەکاندا خۆیان رابگرن هەرکاتیٚ رووبەڕووی سۆزەکانی منداڵانی خۆیان دەبوونەوە هەوڵیان دەدا ئەم سۆزانە لەبەرچاو نەگرن یان سەرکوت و پێماڵیان بکەن و بەردەوام پەنایان دەبردە بەر هێنانەوەی هەندیٚ رستەی لەم جۆرە کە هیچ کاریگەری و شوێنەوارێکی بەسەر بارودۆخەکاندا نەبوو:

بۆنکوڵی کردن لە سۆزەکان:(تۆخۆشت نازانیت چ قسەیەکی هەڵە دەکەیت، بڕوای تەواوم هەیە کە لە قوڵایی دڵتەوە هەست دەکەیت کەبرا بچووکەکەت خۆشدەوێت.)

بۆسەر کوتکردنی سۆزەکان:(ئەگەرجارێکی دیکە وشەی (لێی بێزارم) لەدەمت بێتەدەرەوە دڵنیابە زمانت دەبڕم، هەرگیزنابیٚ منداڵ هەستێکی وەهای هەبێت).

بچووککردنەوەی سۆزەکان:(تۆلەدڵەوە ڕقت لەبرا بچووکەکەت نابێتەوە، ڕەنگە زۆرت خۆشنەوێت، دەبیٚ لەوهەستانە گەورەتر بیت.)

ئەو دایك و باوکانەی ئەم جۆرە قسانە دەکەن نازانن کە سۆزەکان وەکو ڕووبارەکان وان و کەس ناتوانێت بیانوەستێنێت، بەڵکوتەنیا دەتوانریٚ لەریٚ لابدرێن. هەستوسۆزە بەهێزوتوندەکان هەروەکو ناوی رووباری(میسیسیپی)

(mississipi)*حاشـامەڵنەگرەو بـە ئامۆژگـاری وقـسەی لـۆژیکی ئـارام نابێتـەوەو*
هەوڵـدان بـۆ لەبـەر چـاو نـەگرتنیان واتـە گـومراکردن و لـەناوبردن و خراپـە لەگـەڵ کردنیان ،بەپێچەوانەوە دەبێ بوونیـان لەبـەر چـاو بگیرێـت و بەئـەقڵ و تـەگبیرەوە بەرەو شوێن ولایەنە کەم مەترسییەکانیان ببەین ،ئەگەر بـە باشـی بـەڕێوە بـبردرێن ڕەنگە هەروەکو خۆری ژیان نوقمی ڕووناکی وبەختەوەریمان بکـەن.ئەوانـە ئامـانجی بـەرزن وەلـێ مەسـەلەی سـەرەکی جـاریێ هـەروەکو خـۆی دەمێنێتـەوە: دەبـێ بۆپڕکردنـەوەی درزی نێـوان ئامانجـە پەسـندەکان وکارەکـانی ڕۆژانـە چ هـەنگاوێك بهاوێژین؟دەبێ لەکوێوە دەست پێبکەین؟

## بەرنامە نزیك و دوورەکان:

بۆدروستکردنی هەستی لێپرسراویەتی لەمنداڵاندا دەبێ چەند بەرنامەیەکی وا لەبەرچاوبگرین کە ئاوێتەیەکبن لە هەوڵ وتێکۆشانی هەنووکەیی، لە هەمانکاتیشدا تێکۆشانێکی بەردەوام بێت بۆ داهاتوو،دەبێ بەر لەهەمووشتێك گرینگییەکی خێرا بەو خاڵەبدەین کە پەروەردەکردنی خووڕەوشتی منداڵ پابەندییەکی تەواوی بەپەیوەندی ئێمەو منداڵەکانمانەوە هەیە، ناتوانرێت تایبەتمەندییە خوویی وکەسایەتییەکان بەقسەو ئامۆژگاری بۆ منداڵان بگوازرێنەوە، بەڵکودەبێ بە کردار ئەم تایبەتمەندیانەیان پێ پیشان بدەین. کەوایە هەنگاوی یەکەم لەدانانی بەرنامەیەکی دووروودرێژ بۆدروستکردنی هەستی لێپرسراویەتی لە منداڵدا ئەوەیە کە بڕیارو نەخشەیەکی ڕاستەقینە بۆ نواندنی حەزوئارەزوو وگرینگی پێدانێکی تەواو بە بیروهەستە دەروونییەکانی منداڵ دابڕێژین. نەك تەنیا لەبەر ڕووخسارە دەرەکییەکانی یاخیبوون و نافەرمانیی منداڵ نیگەران بین.

بەڵام چۆن دەتوانین لە چۆنییەتیی بیروهەستە دەروونییەکانی منداڵان ئاگاداربین؟ منداڵان خۆیان بۆکردنەوەی دەروازەی زمینیان کلیلە پێویستەکان دەخەنە بەردەستی ئێمە. بەومانایەی کە تارادەیەك هەستەکانی ئەوان لەقسەو ئاوازی گوفتارو جووڵەو ڕەفتاریان ڕەنگدەدلتەوە،بۆیەپێرین بەم بیرو هەستە دەروونیانەش دەبێ دروشمی ئێمە ئەوەبێت: (لێگەڕێ هەست بە حەزە دەروونییەکان و هەستەکانی بکەم! لێگەڕێ بۆی بسەلمێنم کەدرك بە هەستەکانی دەکەم ،لێبگەڕێ

ئەم زانیارییە بەبێ ڕەخنەو بەبێ رووشکێنی بە منداڵەکە بدەم.) کاتێ کە منداڵ بەخامۆشی یان بەنێوچەوانێکی گرژەوە لەقوتابخانەوە بۆماڵ دەگەڕێتەوە, یەکسەر لە چۆنییەتیی هەنگاو هەڵێنانیەوە درك بەوە دەکەین کە ڕووداوێکی ناخۆشی بەسەرهاتووە. بە پەیڕەوکردنی ئەو دروشمەی کە لەسەرەوە بۆ خۆمان دیاریمانکرد, نابێ بەشێوەیەکی رەخنەگرانە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین و رستەی لەم جۆرە بەکاربێنین:(بۆچی ئاوا مرچ ومۆنی؟) یان (ئەمە چ قیافەیەکە کە بەخۆت گرتووە؟) یان (چی رووی داوە, لە هاوڕێکەت تۆراوی؟) یان (دیسان چ کەتنێکی تازەت کردووە؟) یان (بڵێ بزانم ئەمڕۆ چی بووە؟)

لەبەرئەوەی کە ئێمە گرینگی بە کاردانەوە دەروونییەکانی منداڵ دەدەین. دەبێ لەو لێکدانەوانە بەدووربکەوینەوە کە تەنها دڵرەنجان و تووڕەیی دروست دەکەن ,نابێ لەوە زیاتر برینی بکولێنینەوە, بەپێچەوانەوە , دەبێ باوك بە یەکێك لەم رستانەی خوارەوە هاوسۆزی و هاودەردیی خۆی بۆ منداڵەکەی دەرببڕێت: (دەڵێی رووداوێکی ناخۆشت بەسەر هاتووە.) یان (دەڵێی ئەمڕۆ بەخۆشیت رانەبواردووە.) یان (واپێدەچێ رۆژێکی سەختت بەسەر بردبێ) یان (پێدەچێ کەسێك نارەحەتی کردبێت.) ئەم جۆرە رستانە بەنۆرەی خۆیان لەم پرسیارانەی خوارەوە باشترە:(چی بووە؟) (بڵێ بزانم چ رووداوێك رووی داوە؟). پرسیارەکانی دوایی پشکێنەرانەن لەکاتێکدا رستەکانی سەرووتر نیشانەی هاوغەمی ودرککردنی سۆزە دەروونییەکانی منداڵە, هەرگیز ناتوانرێ ئەم راستییە پەردەپۆش بکرێ کە منداڵ هەمیشە تایبەتمەندییە رەوشتییەکانی خۆی لەو ژینگەیە وەردەگرێت کە تیایدا دەژیت, ئەگەر لە شوێنێکدا بژی کە لەسەر بناغەی رەخنەگرتن دامەزرابێت, فێری هەستی لێپرسینەوە نابێت, بەڵکو بەپێچەوانەوە فێری ئەوە دەبێت کە چۆن ڕەخنە لە خۆی بگرێت وعەیب لەخەڵکی دابدۆزێتەوەو فێری ئەوە دەبێت کە لە دادوەری وحوکمدانەکانی خۆی بەشك و گومان بێت و لێهاتوویی خۆی بەکەم بگرێت و ئەوەندەش بڕوا بەبۆچوونەکانی کەسانی دیکەنەکات و لەهەمووشیان خراپترئەوەیە کە فێردەبێ چۆن لە ژینگەیەکی پڕ لە سەرزەنشت و عەیبگرتندا بژیت؟

## لە شەڕەوە بۆ ئاشتی

ئەو دایك و باوكانەی سەبارەت بە كاروباری ماڵەوەو بەرپرسیارییەكان لەگەڵ منداڵەكانی خۆیاندا لەشەڕێكی ئاشكرا یان نهێنیدان. دەبێ دان بەو راستییە دابنێن كە هەرگیز لەو شەڕەدا سەركەوتن وەدەست ناهێنن.

منداڵان بۆ بەرگریكردن توانای دانبەخوداگرتنیان زۆر لەئێمە زیاترە. گریمان كەئێمە لەشەڕێكدا سەریكەوین و لە سەپاندنی ویستی خۆمان بەسەر ئەوان سەركەوتن بەدەست بهێنین. رەنگە بۆتۆڵەسەندنەوە دەست بەهەڵچوون وخراپەكاری بكەن یان نارەحەت وبێ ئیرادە رابێن.

بۆسەركەوتن بەسەرمنداڵاندا تەنها یەك رێگا هەیە ئەویش بریتییە لەوەی دەستت بەدڵی رابگات. لە سەرەتادا ئەم مەسەلەیە نەكردەیی دێتە بەرچاو ،بەڵام لەڕاستیدا كارێكی دژوارەو دەتوانین بەدانبە خۆداگرتن و توندوتۆڵی بەباشی جێبەجێی بكەین.

دایك و باوكان بەم هۆكارانەی خوارەوە دەتوانن گۆڕانكاری پەسندو گونجاو لە منداڵدا دروست بكەن:

١ـ بەدڵسۆزی: كاتێ منداڵان هەست بكەن دایك و باوك گرینگی بە هەست و بیریان نادەن دڵرەنجاوو نارەحەت دەبن و لەم گرینگی پێنەدانە ئەو ئەنجامە وەدەست دێنن كە بۆ چوونەكانیان پێنەگەیشتوو و دەبەنگانەیەو خۆشیان شایەنی گرینگی پێدان و خۆشەویستی نین.ئەو باوك یان دایكەی بە وردی گوێ لەقسەكانی منداڵەكەی دەگرێت بۆی دەسەلمێنێت كە بۆ چوونەكانی بەنرخەو بۆ خۆشی شایەنی گرینگی پێدان و رێزگرتنە، هەر كە منداڵ هەست بەو جۆرە گرینگی پێدان و رێزلێنانەبكات هەست دەكات كەسایەتییەكی بەرزی هەیە،ئەمەش بڕوا بەخۆبوونی دەبزوێنێت هەتا بە شێوەیەكی كاریگەرتر لەگەڵ جیهانی رووداوەكان و خەڵكی دیكەدا رووبەڕوو بێتەوە.

٢ـ پێشگیری كردن لە (هێشووەكانی تووڕەیی): دەبێ دایكان و باوكان زۆر بە توندی خۆیان لەو رەخنەو لێكدانەوانە بەدوور بخەنەوە كە دەبنە هۆی دروستبوونی تووڕەیی ورەنجان وەهەتابكرێ خۆیان لە بەكارهێنانی ئەم هۆكارانەی خوارەوە بپارێزن:

سووككردن: تۆ مایەی سەرشۆڕیی قوتابخانەكەت و بە دبەختیی بنەماڵەكەتی!

جنێودان: دەبەنگ. بێ شعور. كەری بەستەزمان.

پێشبینی: تۆلەکۆتاییدا دەبیتە حەمباڵ! چارەنووست بەدبەختییە! ئاخیرەکەی تۆ لە زینداندا دەمریت!

هەڕەشەکردن:ئەگەر دەست لەم کارە هەڵنەگریت. باسی پارەی رۆژانەت مەکە.

تۆمەتبارکردن: تۆهەمیشەو بەر لەهەمووان دەست بەنانەوەی شەڕو ئاژاوەدەکەیت.

سەپاندنی گەورەیی: تۆلە هیچ ناگەیت! هەر قسە مەکە! لێگەڕێ من چارە نووست دیاری بکەم!

٣ – دەربڕینی بیرو بۆچوونی خۆت بەبێ هێرشکردن: ئەگەر دایك و باوکان لە کاتە دژوارەکاندا بە هەر شێوەیەك هەست و بیری خۆیان بەبێ سنور بەزاندنی کەسایەتی منداڵ و بەراستی رابگەیەنن, کاریگەریی و شوێنەوارێکی فراوانیان لە راستکردنەوەو چاکردنەوەی سەرسەختی و سەرپێچیی منداڵدا دەبێت.

(چاو بەبەشی دووەمدا بخشێنەوە.)

هەر لەگەڵ ئەوەی دایك و باوکان بەدڵسۆزی و وردییەوە گوێ لەقسەکانی منداڵەکانیان بگرن و بەبێ سستوسووککردن ڕاوبۆچوون و هەستەکانی خۆیان دەربڕن,یەکسەر وەرچەرخان وگۆڕانکاریەك لە بیرەکانی منداڵاندا دێتەدی و پاش ئەم گوێگرتنە کەشوهەوایەکی پڕ لە هۆگری و خۆشەویستی پەیدادەبێت, منداڵ لەدایك وباوکی نزیکتر دەبێتەوەو شوێنەواری گونجان و ئەدەب وهاوبیریی هاودەنگی بەشێوەیەکی هەستپێکراو لەمنداڵدا بەدیاردەکەوێ. ئاساییەکە ئەم گۆڕان و وەرچەرخانە یەکسەر پەیدانەبێت, وەلێ بەرەبەرە گۆڕانکاری لەبڕوای منداڵدا پەیدا دەکات.

دایکان وباوکان بەگرتنەبەری ئەم رێگا نوێیە لە هەلومەرجی فێرکردنی هەستی لێپرسراویەتیی منداڵان چەند هەنگاوێکی مەزن دەنێن, وەلێ بەتەنیا سەرمەشقیی بەس نییە,منداڵان بە هەوڵ و ئەزموونەکانی خودی خۆیان زیاتر گیانی لێپرسراویەتی بەهێز دەکەن وکاتێ دایکوباوك بەهۆی سەرمەشقبوونیانەوە رێگاو کەشوهەوایەکی گونجاو بۆ فێرکردن پەیدابکەن, ئەزموونی خودی منداڵەکە بە شێوەیەك پایەی ئەم فێرکردنە پتەودەکات کە بەرە بەرە دەبێتە بەشێك لەخووی منداڵ. لەبەر ئەوەی خاڵی زۆرگرینگ ئەوەیە دەستنیشانی ئەوە بکەین کە لەقۆناغە

جۆراوجۆرەکانی گەشەکردنی مندالدا دەبێ جۆرە لێپرسراویەتێکی فێر بکەین؟

## لێپرسراویەتی: مافی رادەربڕین و هەڵبژاردن

کاتێ مندالان لە دایکدەبن هەستی لێپرسراویەتییان لەگەڵدا لەدایك نابێت, هەروەها ئەم هەستە لەخۆیەوەو لە تەمەنێکی دیاریکراودا بەدەستنایەت. هەستی لێپرسراویەتی وەکوهونەری پیانۆژەنین, بەرەبەرەو بەدرێژایی سالانێکی دوورو درێژ وەدەستدێت وپێویستی بەراهێنانی رۆژانە هەیە لەدەربڕینی داوەری وهەڵبژاردنی رێگای چارەسەرێکی وا کە لەگەڵ تەمەن وهێزی تێگەیشتنندا بگونجێت.

## خۆپاراستن لە پێکداهەڵشاخان وچوارچێوەی دەسەلاتی لێپرسراویەتی

لەوانەیە فێرکردنی هەستی لێپرسراویەتی لەهەمان سالە سەرەتاکانی تەمەنی مندالەوە دەست پێبکات. بەبەخشینی مافی (رادەربڕین و هەڵبژاردن) دەربارەی مەسەلە پەیوەندیدارەکانی تایبەت بەخۆی هەستی لێپرسراویەتیی مندال گەشەدەکات. بەلام لێرەدا دەبێ بە تەواوی جیاوازی نێوان رادەربڕین و هەڵبژاردن بکرێ. لەهەندێ باردا لێپرسراویەتی بەتەواوی لەسەرشانی مندالانەو لەم کاتە خودی مندالە کەدەبێ مافی هەڵبژاردنی هەبێت. لە هەندێ باری دیکەدا لێپرسراویەتی چاودێری سوود و قازانج و سەلامەتیی مندال بە تەواوی لەسەر شانی ئێمەیە. لەدوا باردا دەبێ مندال تەنیا یەك مافی رادەربڕینی هەبێت نەوەك ماق هەڵبژاردن, ئەوە ئێمەین کەدەبێ لەجیات ئەو هەڵبژێرین و لە هەمان کاتیشدا دەبێ یارمەتیی مندال بدەین بۆپەسندکردنی ئەو رێگاچارەیەی کە نارەزایی پیشاندان قبوول ناکات. ئەوەی ئێستا گرینگییەکی گەورە وەدەستدەهێنێ لێك کردنەوەی ئەم دوولایەنەی لێپرسراویەتییە, مۆلەت بدەن چوارچێوەی ئەو دەسەلاتە دەستکردانە بەیەکەوە هەڵسەنگێنین کە پێکداهەڵشاخان و کێشمە کێش لەنێوان دایك و باوك لەلایەك و مندالەکان لەلایەکی دیکەوە زیاد دەکەن.

خۆراك: تەنانەت دەتوانرێ پرسیار لە مندالی دووسالانیش بکرێت کە ئایا حەزی لەنیو پەرداخە شیرە یان پەرداخێکی پڕ؟ دەتوانرێت مندالێکی چوار سالانە لەخواردنی پارچە سێویك یان سێوێکی تەواو سەربەست بکرێت , هەروەها مندالێکی شەش سالەش دەتوانێ بڕیار بدات کە ئایا حەزی لە هێلکەی نیوە کولاوە یان تەواو

کولاّو.دەبێ منداڵان لەبەردەم باری جۆراو جۆر دابنرێن تاکو خۆیان بتوانن بەئارەزووی خۆیان هەڵبژێرن. دەبێ دایک و باوک ئەم مەسەلانە دیاری بکەن و منداڵانیش هەڵبژێرن.

نابێ لەمنداڵێک بپرسرێت:(حەزدەکەیت بەیانیان چ بخۆیت؟) باشترە لێی بپرسرێت:(ئایا حەزت لە هێلکەی کوڵاوە یان هێلکەو ڕوون) یان (شیری گەرمت دەوێ یان سارد؟) (ئایا حەزت لەچایە یان قاوە؟) دەبێ دایک و باوک بەردەوام ئەم خاڵەیان لەبەرچاوبێت کە منداڵ بەرانبەر هەندێ مەسەلەی پەیوەندیدار خۆی لێپرسراوە. ئەو فەرمانبەرێکی جێبەجێکارنییە بەڵکو لەو بڕیارانەدا هاوبەشە کەوا ژیانی قاڵبرێژ دەکەن.دەبێ منداڵ لەشێوازی مامەڵەکردنی دایکوباوکی پەیامێکی ڕۆشن و ڕاشکاو هەڵبهێنجێت, بۆنموونە:(ئێمە بۆتۆ هەم چامان ئامادەکردووە وهەم شیروهێلکە. ئێستاش لەسەرتۆیە کە هەڵبژێریت).

زۆربەی جار کێشمەکێش دەربارەی خواردن بەهۆی ئەودایکانەوە پەیدا دەبێت کەزیاد لەئەندازە دەست دەخەنە نێو حەزو ئارەزووی کەسیی منداڵانیان. بۆنموونە :ئەم جۆرە دایکانە فشار دەخەنە سەر منداڵەکانیان کە هەندێ سەوزە بخۆن, زۆربەی جاریش (بەبێ هیچ بەڵگەیەکی زانستی) وتاروئامۆژگاری بۆمنداڵەکانیان دەدەن کە کامە سەوزە لە سەوزەکانی دیکەبۆ فلاّنە ئەندامی لەش سوودمەندترە، باشترە دایکان دەربارەی خواردن حەزی کەسیی خۆیان بەکار نەهێنن. بەڵکو دەبێ خواردنی جۆراوجۆرو باش بۆ منداڵەکانیان ئامادە بکەن و هەڵبژاردنی جۆری خواردن و ڕێژەی کەم و زۆریی خۆراکەکەش بەتەواوی بخەنە سەر شانی منداڵ, بەمەرجێک لە ڕووی تەندروستییەوە زیانی نەبێت. بەشێوەیەکی گشتی دەبێ بگوترێت کە خۆراك خواردن لە چوار چێوەی لێپرسراویەتییە.

جلوبەرگ: لەکڕینی جلوبەرگ بۆمنداڵان, لێپرسراویەتیی دایك وباوك لەچوارچێوەی دەستنیشان کردنی سنووری پێویستیی ئەوان ودابینکردنی گوژمەی جلکەکەدایە. بۆنموونە کاتێ کە دەچینە لای بەرگدروو دەتوانین چەندجۆرە جلوبەرگێکی وا هەڵبژێرین کە لەڕووی نرخەوە لەیەك ئاستدابن وپیشانی منداڵانی بدەین تاکو بە پێی ئارەزووی خۆیان هەڵبژێرن, بەم شێوەیە تەنانەت منداڵێکی شەش ساڵەش

دەتوانی لەنێوان ئەو جۆرانەی کە ئێمە پەسندمان کردووە سەربەست بێت ومافی هەڵبژاردنی هەبێت.
لەزۆربەی خانەوادەکاندا منداڵان لە کڕینی جلوبەرگی خۆیاندا هیچ جۆرە شارەزاییەك وەدەست ناهێنن و ئەم جۆرە منداڵانە لەکاتی پێگەیشتندا بەبێ یارمەتی ولێپرسراویەتیی ژن یان دایکیان ناتوانن یەك قاتەپۆشاك بۆخۆیان هەڵبژێرن. بەتایبەت بۆمنداڵانی گەورەتر دەبێ هەمیشە ئەم ئازادی و دەرفەتە هەبێت کە هەتابکرێت جلوبەرگی هاوشێوەی جلوبەرگی هاوڕێیانیان هەڵبژێرن. کەوانە کاتێ گشت قوتابیانی پۆلێك جلوبەرگی شینیان لەبەردابێت ئەگەر منداڵێك ناچاربکەین بەجلوبەرگی ڕەشەوە لە پۆلەکە ئامادەبێت،بەبێ هیچ هۆیەك منداڵەکە دەخەینە بەر نەشتەری گاڵتە پێکردنی هاوپۆلەکانی. دەبێ هەمیشە دایك و باوك ڕەچاوی ئەوە بکەن کە جلوبەرگ و پێڵاوی منداڵەکانیان لەگەڵ جلوبەرگ وپێڵاوی دۆست و هاوپۆلانی زۆر جیاواز نەبێت.

## *ئەرکەکانی ماڵەوە:

دەبێ دایك و باوکان لەهەمان ساڵی یەکەمی خوێندنی منداڵانی خۆیان ئاگایان لەو خاڵە بێت کە ئەرکەکانی ماڵەوە لە چوارچێوەی لێپرسراویەتیی منداڵ و مامۆستاکەیەتی. نابێ دایك و باوك هەرگیز لەپێناو ئەرکی ماڵەوە منداڵنیان سەرزەنشت بکەن تەنیا لەوکاتەدا نەبێت کەمنداڵ خۆی داوامان لێدەکات. نابێ هیچ کاتێك دەست بخەینەنێو ئەرکی قوتابخانەیانەوە. کاتێ دایك یان باوك لێپرسراویەتیی ئەرکی قوتابخانەی منداڵەکەی لە ئەستۆگرت. منداڵ ناڕەزایی پیشان نادات و بەرە بەرە لەسەرئەم دەستتێوەردان و یارمەتییە رادێت کە دواتر دایك و باوکان ناتوانن بەئاسانی لێی دەرباز بن و ڕەنگە ئەرکەکانی قوتابخانە لە دەست منداڵدا ببنە چەکێك بۆ سوود وەرگرتنی خراپ و وەرگرتنی ئیمتیازات لە دایك و باوکی. هەرکاتێ دایکان و باوکان لە ماڵەوە پەیوەندی و ئاوڕ لێدانەوەیەکی کەمتریان بەرامبەر بە وردەکارییەکانی ئەرکە قوتابخانەییەکانی منداڵنیان پێشان بدەن بەو پەڕی ڕوونی و بڕوا بەخۆبوونەوە بەوان بڵێن:(ئەرکی قوتابخانە تایبەتە

بەخۆت!) لەڕووداوە ناپەسندو تووڕەبوونەکانی نێو ماڵ کەم دەبێتەوەو ,لەجیاتی ئەوەجموجۆڵ و ئاسوودەیی خانەوادەیی زیاتر دەبێت. بەتایبەت لەساڵەکانی یەکەمی خوێندنی منداڵدا نابێ دەربارەی بەهاو گرینگیی ئەرکەکانی ماڵەوە زیدەڕۆیی بکرێ. ئەمڕۆ لە زۆربەی فێرگە نموونەییەکاندا ئەرکی ماڵەوە بەمنداڵان نادەن, دیارە قوتابیانی ئەوجۆرە فێرگانە هیچ پاشکەوتنێکیان نییە بە بەراورد لەگەڵ ئەو قوتابییە شەش حەوت ساڵەیەی کە بۆ جێبەجێکردنی ئەرکی قوتابخانە لە ماڵەوەدا فشار دەخاتە سەر مێشکی خۆی. بەهای سەرەکیی ئەرکی ماڵەوە ئەوەیە کە هەل بۆ منداڵ دەڕەخسێنێ بەپێی سەلیقەو ئارەزووی خۆی کار بکات. بۆ ئەوەی هێدمە بەم بەهایە نەگەیەنرێت, دەبێ ئەرکی ماڵەوە لەگەڵ توانای ئامادەیی منداڵدا بگونجێت. بەشێوەیەك کەبتوانێت بەبێ کۆمەك ودەستتێوەردانی خەڵکانی دیکە ئەنجامی بدات. ڕەنگە یارمەتیدانی راستەوخۆ تەنیا ئەوبیرە بخاتە مێشکی منداڵەوە کە بەتەنیاو بەبێ یارمەتیی خەڵکانی دیکە هیچی لەدەست نایەت لەکاتێکدا ڕەنگە هەندێ کات یارمەتی ناڕاستەوخۆ کاریگەریی هەبێت. بۆنموونە: دەبێ لەوە دڵنیابین کەمنداڵ دەتوانێ لەشوێنێکی ئارامدا کاربکات ومێزوکورسییەکەی باش بێت وئەو کتێب وسەرچاوە بەسوودانە وەربگرێت کەبۆئەنجامدانی ئەرکەکانی پێویستن, هەروەها دەبێ بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی بە پێی وەرزە جۆراو جۆرەکان لە هەڵبژاردنی گونجاوترین شوێن و کات کۆمەکی منداڵ بکرێت. ئاساییە لەپاش نیوەڕۆکانی بەهار یان پایز کە هەوا مامناوەندییە,سەرەتا خەیاڵی منداڵ دەچێتە سەر گەمەو یاری, پاشان ئەرکی قوتابخانەی لەکاتێکدا لەرۆژە ساردەکانی زستاندا ئەرکی قوتابخانە لەڕوانگەی ئەوەوە گرینگترە لە تەماشاکردنی بەرنامەکانی.T.V زۆربەی منداڵان لەکاتی ئەنجامدانی ئەرکەکانی قوتابخانەدا حەزدەکەن لەنزیك کەسێکی گەورە دابنیشن. ڕەنگە لەم جۆرە کاتانەدا بتوانرێت مۆڵەت بەمنداڵ بدرێت سوود لە مێزی موبەق یان ژووری نانخواردن وەربگرێت. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا نابێ دەربارەی شێوەی دانیشتن و پاکو خاوێنی و شێوەی دانانی کەرستەکانی کارپێکردن لەگەڵ منداڵدا دەمەتەقێ بکرێت, هەندێ منداڵ کاتێ نووکە قەڵەمێك دەجوون و سەریان دەخورێنن و کورسی

دەجولێنن باشتر کاردەکەن کاتێ ئێمە لەم بارەیەوە ڕاوبۆچوونی خۆمان پیشان بدەین و ڕەخنەیان لێبگرین،زیاتر دڵیان دەڕەنجێت وچالاکیی زەینیان کوێرتر دەبێت.نابێ بەپرسیاری جۆراوجۆرو هەڵەلێگرتن کاری منداڵان تێکبدرێت .تاکە دەستێوەردانی ئێمە دەبێ لەچوارچێوەی دڵدانەوە و بەهێزکردنی متمانە بەخۆبوونی منداڵەکە بێت ،دەبێ لە هەموو جۆرە کۆمەك ونەمرپێکردنێك دووربکەوینەوە ،ڕەنگە لەهەندێ حاڵەتدا بۆ ڕۆشنکردنەوەی خاڵێك یان ڕاڤەکردنی ڕستەیەك هاوکاری بکەین. بەڵام دەبێ خۆمان لەرادەربڕینی جۆراو جۆر بپارێزین و ئەم جۆرە ڕستانە: بەزارماندا نەیەن :ئەگەر زەینکوێرنەبایت ئەونەرکەت بە ئاسانی ئەنجام دەدا.(ئەگەر بەباشی گوێت لەمامۆستاکەت بگرتبایە. ئەرکەکەت بەباشی ئەنجام دەدا).

دەبێ بەمیهرەبانی وخۆشەویستییەوە یارمەتیی منداڵ بدەین و بەشێوەیەکی گشتی دەبێ زیاتر گوێ بگرین، نەك وتاری پڕ لەئامۆژگاریی بۆ بدەین. ئێمە ڕێگاکە دەستنیشان دەکەین، وەلێ ڕێبوارەکە لەگەیشتن بەمەبەستی خۆی سەربەست دەکەین. لەوانەیە بیروڕای دایك و باوك لەبارەی قوتابخانەو مامۆستا کاریگەریی لەبیروڕای منداڵەکەدا هەبێت لەهەمبەر ئەرکەکانی قوتابخانە.هەرکاتێك دایك یان باوك بەگشتی ڕەخنە لەمامۆستاوقوتابخانە نەگرن، بێگومان منداڵیش لەبەرانبەر ئەرکەکانی ماڵەوەدا بەپێی بیروڕای دایك و باوکی کاردانەوەی دەبێت، دەبێ دایکان وباوکان پێگەونرخی مامۆستا لەلای منداڵەکەیان بەهێزبکەن و،بۆدیاریکردنی ئەرکی ماڵەوە پشتیوانیی لەرێگاو رەوتی مامۆستا بکەن.کاتی مامۆستا توندوتیژ بێت، دەبێ دایك و باوکان تاپێیان دەکرێت دڵی منداڵەکەیان بدەنەوەو دڵسۆزیی خۆیان پێنیشان بدەن:(ساڵێکی دژوارە !کارەکەت زۆر قورسە) یان بەراستی کارەکەت زۆر ئاسان نییە) یان (وادیارە مامۆستاکەت زۆر توندوتیژە) یان(گوێم لێبووە کە زۆرپرسیار دەکات) یان (گوێم لێبووە بەتایبەت دەربارەی ئەرکەکانی ماڵەوە زۆرتوندوتیژە دڵنیام ئەم ساڵ کارت زۆر دەبێت.)

زۆر پێویستە سەبارەت بەئەرکەکانی ماڵەوە خۆمان لەتوندوتیژی بپارێزین:(ریجیی) (Reggie) سەیرکە! دەبێ لە هەموو پاش نیوەڕۆیەکدا هەندێك ڕێنووس بکەیت،

تەنانەت لە ڕۆژانی شەمە و یەکشەمەشدا دەبێ کاربکەیت. ئیدی نابێ گەمە بکەیت و سەیری تەلەفزیۆن بکەیت.
(روجەر) (Roger) دەبێ لەمەودوا لە ماڵەوە ئەرکی قوتابخانە ئەنجام بدەیت! باوکت دەیەوێ بخوێنیت! ئێمەحەزناکەین لەخانەوادەکەماندا کەسێکی نەخوێندەوار هەبێت.
هەڕەشەو سەرزەنشتکردن یەکێکە لەڕێگا باوەکانی پەروەردەو فێرکردن. لەبەر ئەوە خەڵکان بەگشتی واخەیاڵ دەکەن کە بیانەوێت ونەیانەوێت کاریگەری و شوێنەوارێکی دەبێت. کەچی لەراستیدا نەك هەر بەسوود نییە بەڵکو کاریگەری و شوێنەواری پێچەوانەی هەیە. بەم پێیە جگە لەتوندوتیژی وسەختیی بارودۆخەکەو تووڕەکردنی دایك و باوك ومندالْ هیچ کاریگەرییەکی دیکەی نییەو هیچ شوێنەوارێك بەجێناهێڵێت.
زۆربەی منداڵە شایستەو بەتواناکان وەك جۆرە یاخیبوونێکی نەستی لەبەرانبەر دایك و باوکیان لە قوتابخانە دووردەکەونەوەو ناخوێنن. بۆئەوەی هەر منداڵێك بەراست ودروستی گەشەبکات وپەروەردە بکرێ پێویستی بە وەدەستهێنانی هەستێکی تاکو جودای وا هەیە کە جیاواز بێت لەگەڵ هەستەکانی دایك و باوکی. کاتێ دایك و باوکان بەهۆی سۆزەوە زیاد لەئاستی خۆیان پابەندی بارودۆخی خوێندنی منداڵ بن، منداڵەکە واهەست دەکات کە دەستیان خستۆتە نێو ئازادی وسەربەخۆییەکەیەوە. کاتێ منداڵ بەهاوکاریی دایك و باوکییەوە بەبێ کەموکوڕی ئەرکەکانی ئەنجام بدات ونمرەی چاك وەدەست بهێنێت، لەلای منداڵەکە هیچ جۆرە بەهایەکی نییە. بەپێچەوانەوەشەوە تەنها لەوکاتەدا لە ئەنجامی کاری خۆی رازی دەبێت کە بەتەنیا خۆی ئەنجامی دابێت، بێگومان ئەمەش گرینگییەکی فراوان دەبەخشێت. منداڵ لەئەنجامنەدانی ئامانجەکانی دایك و باوکی هەوڵدەدات هەستی سەربەخۆخوازیی خۆی بسەلمێنێ. ڕەنگە بەم شێوەیە پێویست بوون بە هەستی سەربەخۆخوازی و کەسایەتیی تاك سەرەڕای ئەو هەموو فشارو ئاگادارکردنەوەی دایك و باوکیش منداڵ بەرەو کەوتن بەرێت. چونکە ڕۆژێك منداڵێك دەیگوت: (ئەوان دەتوانن من لەبینینی تەلەفزیۆن وخەرجیی ڕۆژانە بێبەش بکەن، بەڵام ناتوانن لەوەرگرتنی نمرەی چاك بە دوورم بخەنەوە) ئاساییەکە خۆدوور خستنەوە

لەخوێندن مەسەلەیەکی ئەوەندە سادەوئاسان نییە کەبەپێشاندانی توندڕەوی یان نەرمی لەبەرانبەر منداڵان چارەسەربکرێت, ڕەنگە ئەوفشارەی کەڕۆژانە زیاد دەکرێ بەرگری و یاخبوونی منداڵ زیاد بکات ,هەروەها ڕەنگە گرتنەبەری رێگای پشتگوێخستن وەهەق بەسەرنەبوون بتوانێت وا لەمنداڵ بکات هەست بەلێپرسراویەتی وپێگەیشتن نەکات.رێگای چارەسەری مەسەلەیەکی ئاواگرینگ نەئاسان و نەئەوەندە خێراشە, ڕەنگە هەندێ لەمنداڵان بۆ ڕووبەڕووبونەوەی دایك و باوك و وەدەستهێنانی رەزامەندیی دایك و باوکی لەپێشکەوتنی خۆی, لەجیات پاشکەوتنی خۆی پێویستی بە یارمەتیی دەروونناس هەبێت, ڕەنگە هەندێکی دیکەیان پێویستییان بەوە هەبێ لە لایەن بەخێوکارێکی شارەزای بواری دەروونناسیەوە سەرپەرشتی بکرێن ,بەڵام ئەوەی دەبێ لەبەرچاو بگیرێت ئەوەیە کەنابێ ئەم سەرپەرشتکارە دایك و باوکی بن. دەبێ ئەرك و ئامانجی ئێمە ئەوەبێت کەوا لە منداڵ بکەین بزانێ لەڕووی مافە کەسییەکانییەوە کەسێکە لە ئێمە جودایەو لە هەموو ڕوویەکەوە خۆی لێپرسراوی سەرکەوتن و کەسایەتیی خۆیەتی. کاتێ هەل بەمنداڵ دەدەین کە لە مەبەست و ئامانجەکانیدا خۆی بەمرۆڤێکی سەربەخۆ بزانێت,بۆ ژیان و خواست و ویستەکانی دەست بەوەدیهێنانی هەستی لێپرسراویەتی دەکات.

## * وانەکانی مۆسیقا :

کاتێ منداڵێك ئامێرێکی مۆسیقا دەژەنێت, دایك و باوکی درەنگ یان زوو ئەم رستە زۆر ئاساییەی لێدەبیستن: (ئیترمن نامەوێ پرۆڤە بکەم), لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم جۆرە بێ ئارەزووییەی منداڵ لە بەژەنیاربوون ناتوانرێ رێگا چارەیەکی ئاسان بدۆزرێتەوە. هەندێ دایك و باوك هەر لەگەڵ بیستنی ئەم رستەیە زەحمەت و ئازاری وانە زۆرەملێیەکانی فێربوونی مۆسیقای سەردەمی منداڵیی خۆیان وەبیر دێتەوەو بڕیاردەدەن جگەر گۆشەکانی خۆیان لەم جۆرە ئەشکەنجەیە رزگار بکەن و لە پێشە خۆیان ئەو بەڵگەیە دەهێننەوە کە فێربوون یان فێر نەبوونی مۆسیقا پەیوەندی بەخودی منداڵەوە هەیە. لایەنی سەرپەرشتی هەمیشە تایبەتە بە دایك و باوك و

لەژێر ڕکێفی ئەوانە، بەڵام ژەنینی ئامێرێکی مۆسیقی بەشێکە لە لێپرسراویەتی مندال. هەندێ دایك و باوك بەغەمو داخەوە ئەوە دەهێننەوە یادی خۆیان کە چۆن لەسەردەمی منداڵیداو لەگەڵ بێ ئارەزوویی ئەوان لە بەرانبەر مۆسیقادا بەناچاریی درێژەیان بەراهێنان داوەو شتێك فێربوون. بۆیە بڕیار دەدەن بەهەر نرخێك بێت منداڵەکانیان ببنە ژەنیار, تەنانەت پێش ئەوەی منداڵانیان بێنە وجود,ئامێرە مۆسیقییەکەی دیاری دەکەن وهەر لەگەڵ ئەوەی توانی دەنگێك لە پیانۆ دەربهێنێت یان لێو بە شمشاڵەوە بنێت, ناچاری دەکەن بخوێنێت. فرمێسك و شەڕوهەراو ناڕەزاییە توندەکانی مندال هیچ کاریگەرییەکی نابێت وبەهەربەهایەك بێت ناڕەزایی وبەرگری منداڵەکە تێکدەشکێنن و هەمیشە بڕیارو دەستوری دایك و باوك یەکجاری و ڕاشکاوە:(ئێمە پارە دەدەینە مامۆستا, تۆش بتەوێ ونەتەوێ دەبێ مەشق بکەیت)لەم هەلومەرجانەدا ڕەنگە مندال هەندێ کات سەرکەوتن وەدەسبهێنێ وەلێ لە هەموو بارەکاندا ئەم سووربوون و پێداگرتنە لەسەر دایکی نموونەیی بە گران دەوەستێت,بەتایبەت کاتێ ئەنجامەکە پاش پێکدا هەڵشاخان و کێشمەکێشی بەردەوامی نێوان دایك و باوك و منداڵەکە وەدەستدێت. لەسەردەمی منداڵیدا باشترین ئامانجی فێربوونی مۆسیقا ئەوەیە کە زەمینەیەکی یارمەتیدەر بۆ پێشاندانی هەستەکانی مندال فەراهەم دەکات ئەگەر ژیانی منداڵێك چەندین بێبەشی باڵی بەسەردا بکێشێت و, هەلومەرجی دڵتەنگیی توند بەسەریدا زاڵبێت,دەبێ ڕێگایەك بدۆزێنەوە تاکو ئەم هەموو غەم و ناخۆشییە بڕەوێنێتەوە, بۆ ئەم مەبەستەش مۆسیقا یەکێکە لەباشترین ڕێگاکانی ڕزگاربوون لە سۆزە توندو ئازاربەخشەکان, بەو مانایەی کەتووڕەیی ئارام دەکاتەوەو دلخۆشی و بزاڤ ڕێکدەخات و بە شێوەیەکی هەستپێکراو ناڕەحەتی و تووڕەیی کەم دەکاتەوە.

بەگشتی دایك و باوك ومامۆستایان وا سەیری فێربوونی مۆسیقا ناکەن, بەڵکو بە بڕوای زۆربەیان مۆسیقا هونەری ژەنینی ئامێرێکە و ئاساییەکە ئەم بڕوایە هاوکات بێت لەگەڵ هەڵسەنگاندن یان ڕەخنەگرتن لەشارەزایی وتوانای مندال وئەنجامی ئەمە بۆ زۆربەی خانەوادەکان ڕۆشنە, بەومانایەی زۆربەی کات مندال هەوڵدەدات لەدرێژدان بەوانەکەی دوور بکەوێتەوە یان ناکۆکی لەگەڵ مامۆستاکەی پەیدا بکات

وخۆی لەژەنینی ئامێری مۆسیقا بەدووربخاتەوە. لەزۆربەی ماڵەکاندا پیانۆیەکی کلیلدراو یان شمشاڵێکی لەکەنار کەوتوویان کەمانجەیەکی تۆز لێنیشتوو تەنیا یادگاریی هەوڵە بێ بەرهەم و ئارەزووە بابردووەکانی دایك و باوکە بێ ئومێدەکانە کەبەبێ هۆ هەوڵیاندلوە وا لەمنداڵەکەیان بکەن فێری مۆسقاببێت.

دەبێ دایك و باوك لەم بارەیەوە چ ڕێگایەك بگرنە بەر؟ ئەرکی دایك و باوك ئەوەیە کە مامۆستایەکی میهرەبان و دڵسۆز هەڵبژێرن, واتا مامۆستایەك نەك تەنیا مۆسقا بزانێت بەڵکو لەرووی دەروونناسیەوەش یەك بەیەك قوتابییەکانی بناسێت. تەنیا مامۆستایە کە دەتوانێت هانی قوتابی بدات مۆسیقای خۆشبوێت وحەزی ژەنیاربوونی لە دەروونیدا بوروژێنێت, تەنیا ئەوەکە دەتوانێت بەم کلیلە دەرگاکانی پێشکەوتن بەرووی فێرخوازە نوێیەکاندا بکاتەوە. ئەرکی سەرەکیی مامۆستا ئەوەیە کەبتوانێت وا لەمنداڵەکە بکات ڕێزی لێبگرێت و خۆشیبووێت و پشتی پێببەستێت. هەرکاتێك لەڕێگایەکدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا هەرگیز ناتوانێت لەفێربووندا پێشکەوێت. منداڵ هەرگیز ناتوانێت مۆسیقای خۆشبووێت,ئەگەر ڕقی لەمامۆستاکەی بێتەوە. ئاوازی سۆزی دڵی مامۆستا زیاتر ڕەنگدانەوەی بەسەر دەروونی منداڵ دەبێت لە ئاوازی مۆسیقیی ئامێرەکە.

بۆجڵەوگیرکردنی هەر جۆرە پێکدا هەڵشاخان و کێشمەکێشێك. دەبێ مامۆستا ودایك و باوکی منداڵ دەربارەی هەندێ بنەمای سەرەکی هەماهەنگییان هەبێ, هەندێ لەو بنەمایانەش بەم شێوەیەی لای خوارەوەیە.

١ـ نابێ بەبێ ئاگادارکردنەوەی پێشتر, واتا رۆژێك بەر لەڕاهێنان دەست لەوانەکانی مەشق بکێشرێتەوە.

٢ـ هەرکاتێك بڕیاردرا دەست لەوانەکە هەڵبگیرێت, دەبێ خودی فێرخوازەکە ئاگاداری مەسەلەکە بێت نەك دایك و باوك.

٣ـ بۆچاکردنەوەی ئەو پاشکەوتنانەی کە بەهۆی دەست لە مەشق هەڵگرتن تووشی منداڵەکە بووە, دەبێ منداڵ لە دیاریکردنی وانە بەهێزکارو نۆژەن ئامێرەکان ئازاد بکرێت.

لەبەرچاوگرتنی ئەم بنەمایانە دەبێتەهۆی ئەوەی لەدواساتی دەست هەڵگرتنمان

لەوانەکان خۆمان بەدوور بخەینەوەو گیانی سەربەخۆیی و لێپرسراوی منداڵ بەهێزبکرێت. هەروەها منداڵ لەوە دڵنیا دەکاتەوە کە گەرچی گرینگی بەوەدەدەین فێری مۆسیقا بێت, بەڵام بەرلەوەی گرینگی بە فێر بوونی ئەوەبدەین زیاترگرینگی بە هەست و بیری دەدەین و پێوەی پابەندین.

نابێ منداڵ بە هۆی مەشق سەرکۆنە بکرێت , هەروەها ناشبێت بەردەوام بەها گرانەکەی ئامێری مۆسیقاو فیداکاریی باوك بۆ کرینی ئامێرەکە بەچاوی دابدرێتەوە. ئەم جۆرە گوزارشتانە هەستی دڵشکان و کەموکوڕی لەلای منداڵ دروست دەکات, کەمترین کاریگەریی ئەرێیی دروست ناکات لەوەی منداڵەکە مۆسیقای خۆشبوێت .

دەبێ دایك و باوکان لە پێشبینیکردنی تواناو بلیمەتیی منداڵانی خۆیان لەبواری مۆسیقا بە دووربکەونەوە. نابێ هەرگیز ڕستەی ئاوا بەکار بهێنن:

- تۆ سەلیقەو توانایەکی سەیرت هەیە بەڵام بەو مەرجەی بەکاریانبهێنێت.
- تۆ دەتوانی ببیتە لیۆناردبرنشتاینی (LEONARD BERNSTEI)ی دووەم بەومەرجەی هەوڵ بدەیت. ڕەنگە منداڵ بۆ پاراستنی ئەم ئارەزووە بێ سنوورانەی دایك و باوکی خۆی چاو لەتاقیکردنەوەی توانا ڕاستەقینەکەی خۆی بپۆشێت. ڕەنگە دروشمێکی لەم جۆرە لەلای دروست بێت:(هەرکاتێ تاقیکردنەوە لەبەرچاونەگرم باشتر دەتوانم دایك و باوکم لەخەیاڵە شیرین و فریودەرەکانی خۆیان بهێڵمەوە.) کاتێ منداڵ زیاتر هاندەدرێت و ستایش دەکرێت واخەیاڵ دەکات کە لەلایەن دایك و باوکیەوە درك بە گیروگرفتەکانی کراوەو بۆتە جێگای گرینگی پێدانیان.

(ڕۆزلین) (ROSLYN)ی (٦) ساڵە دەبوایە لەکۆڕسی سێیەمی مەشقی پیانۆدا وانەیەکی نوێ فێربێت. بەو مانایەی کە بتوانێت بە دوودەست هەشت نۆتەی یەك (ئۆکتاڤ)ی(OCTAVE) بژەنێت.

مامۆستا بەشەرمەزارییەکی زۆرەوە چۆنییەتی ژەنینی پێ نیشان دەدات و دواترپێیدەڵێت:(دەبینی چەندئاسانە؟ ئێستا تۆتاقیبکەرەوە).ڕۆزلین بەدوودڵی وناڕەحەتییەوە پەنجەکانی خۆی جووڵاند, وەلێ هەرچەندە زیاترهەوڵی دا کەمتر دەیتوانی لاسایی مامۆستاکەی بکاتەوەو سەرکەوتنی وەدەست نەدەهێنا ,لە

ئەنجامدا بەبێ هیوایی و ناڕەحەتییەوە دەچێتە ماڵەوە.لەکاتی مەشقدا دایکی ئاوای پێگوت:(ژەنینی هەشت نۆتە بە یەکدەست ئەوەندە ئاسان نییە و ژەنین بەدوودەست لە ژەنینی بەیەك دەست دژوارترە). ڕۆزلین بێدرەنگ پشتگیری لەڕاوبۆچوونی دایکی دەکات وکاتێ سەرلەنوێ مەشقی دەکردەوە بەدانبە خۆداگرتن و هێواش بەجوانی پەنجەکانی دەجولاندەوەو ئاوازێکی راست ودروست دەهاتە بەرگوێ.

دایکی دەڵێت: (دەبینم پەنجەکانت بە دروستی دەجولێنی و ئاوازەکەش راست ودروستە).

(ڕۆزلین) وەڵامدەداتەوە:(کارێکی قورسە!), ئەو ڕۆژە لەکاتی دیاریکراو زیاتر درێژە بەمەشق دەدات. بەدرێژایی هەفتە ئەوەندە مەشق دەکات تاکو بەبێ کەمترین کەموکوڕی وانەکە فێربێت .دەرککردن بە گیروگرفتەکانی منداڵ کاریگەریی باشتری هەیە لەپێدا هەلکوتن و رادەربڕین و چارەسەرە حازربەدەست و یەکسەرەکان.

## * خەرجیی ڕۆژانە:

لەماڵ و خانەوادەکانی ئەمڕۆدا, دەبێ خەرجکردنی پارە وەکو سوود وەرگرتن لە خواردن وجلوبەرگ فێری منداڵان بکرێت, لەبەرئەوەی ئەویش ئەندامێکی خانەوادەیە ,نابێ خەرجیی ڕۆژانە وەك خەلاتێك لە پاداشتی ڕەوشتباشی و بەخشینی دەستهەق بۆئەنجامدانی کارێکی ماڵەوە حسێبی بۆبکرێت و لێکبدرێتەوە.

بەڵکو بەخشینی خەرجیی ڕۆژانە ڕێگایەکی پەروەردەییەو ئامانجی تایبەتی هەیە و ئەم ئامانجەش بریتییە لە فێرکردنی ڕێگای سوودوەرگرتن لەپارە بەقبولکردنی لێپرسراوی و هەڵبژاردنی شایستە. لەبەرئەوە راوبۆچونی دەرەوەی ئاستی شێوەی سوود وەرگرتن لە خەرجیی ڕۆژانە دەبێتەهۆی لادان لەئامانجە سەرەکیەکە,تەنیا ئەوەندە بەسە کەبارەکانی سوود لەپارەوەرگرتن وەك خەرجیی هاتووچۆو نانخواردنی نیوەڕۆو کتێب و کەلوپەلی نووسین و شتی دیکە پێشتر دیاری بکرێت.

کاتێ منداڵ بەرێکی گەشەدەکات,دەبێ بڕە پارەی خەرجیی ڕۆژانەی زیادبکرێت تاکو بتوانێت خەرجیی زیاتری خۆی وەك مافی ئەندامیەتی لەیانەکان وخەرجی گەشت وسەیران و شتی دیکەی پێ دابین بکات.دوورنییە منداڵ بەخراپی سوود

لەخەرجیی رۆژانە وەربگرێت, هەندێ لە مندالآن بەباشی پارە خەرج ناکەن, واتا لەماوەیەکی کەمدا پارە بەبادەدەن.دەبێ لەم بارانەدا لەسەر بنەمایەکی بازرگانی گفتوگۆی لەگەڵدا بکرێت و هەوڵبدرێت هەماهەنگی و گونجانێکی هاوبەش بهێنرێتەدی.لە زۆربەی ئەوبارانەی کەمندالێ توانای پاراستنی پارەی نییە, باشترە خەرجی رۆژانە دابەش بکرێت و لەهەفتەیەکدا دوو یان سێ جاربدرێتە مندالێ. لەهەمان کاتیشدا نابێ خەرجیی رۆژانە وەك هۆکارێك بۆ فشارو ناچارکردن و کونترۆلکردنی مندالێ سوودی لێوەربگیرێت یان لەکاتی رق وشەرو کێشەدا لەسەری ببردرێت, بە پێچەوانەشەوە لە کاتی خۆشرەوشتی و لێرازیبووندا زیادبکرێت .خەرجیی رۆژانەی گونجاو و ئاقلآنە چییە؟,بۆئەم پرسیارە وەلآمێکی نێودەوڵەتی نییە.دەبێ خەرجیی رۆژانەی مندالێ لەگەڵ گوژمەو دەرامەتی ئێمەدا بگونجێت. جگە لەوەی دەبێ خەرجیی رۆژانەی گشت قوتابیان لەبەرچاو بگرین. نابێ زیاد لە سنووری توانای خۆمان خەرجیی رۆژانەی مندالێ دیاری بکەین. هەرکاتێ مندالێ نارەزایی پیشاندا دەتوانین بەوپەری هاورێیتییەوە بەلآم بە خۆشەویستییەوە پێیبلێین: (زۆر حەزمان دەکرد برە پارەیەکی زۆرترمان بۆ خەرجیی رۆژانەت تەرخان بکردبوایە, بەلآم بە داخەوە دەرامەت و بودجەی ئێمە دیاریکراوە). ئەم جۆرە قسەیە زۆر باشترە لەوەی ئێمە هەوڵێ بدەین بروا بە مندالێ بهێنین کە لە راستیدا پێویستی بە خەرجییەکی زۆرتر نییە.رەنگە پارەش وەکو هێزوتوانا لەدەست کەسێکی ئەزموون نەدیتە بەئاسانی بچێتە قالبی خراپ سوود لێوەرگرتنەوە .نابێ خەرجیی رۆژانە لە ئاستی پێویستیی مندالێ تێپەرێنێت واتا نابێ پارەیەکی زۆری بدرێتێ, لەسەرەتادا وا باشترە خەرجییەکی رۆژانەی دیاریکراو بەس بێت و دواتر بەرەبەرە سەر لەنوێ چاوی پێدا بخێشینرێتەوە, چونکە بەخشین و دیاریکردنی پارەی زۆر بەچاکەی مندالێ تەواو نابێت. دەبێ ئەو کاتە خەرجیی رۆژانەی مندالێ دیاری بکرێت کەوا بچێتە قوتابخانەو بزانێ پارە حیساب بکات و بتوانێ بۆ یەکەی بچووکتر وردی بکاتەوە. دەبێ هەمیشە مەرجێکی سەرەکی لەبەخشینی پارە لەبەرچاوبگیرێت. روونکردنەوەی ئەوەی کە هەرکاتێ مندالێ دەست بە خەرجیی رۆژانەی خۆی بگرێت و کەمخەرجیی بکات, جا لە هەفتەیەکدابێ

یان له مانگی دیاریکراو پاشکەوتە کە بۆ خۆیەتی و ئەو لە خاوەنداریەتی پارەکە یان لە هەڵگرتنی لە حیسابی هەفتە یان مانگی داهاتووی خۆی سەربەستە، کاریگەرییەکی باشی دەبێت بۆ هاندانی منداڵەکە.

## *هاوڕێیان و هاوگەمەکان:

هەمووومان ئەو راستیەمان قبووڵە کەوا باشترە منداڵانمان خۆیان هاوڕێ بۆ خۆیان هەڵبژێرن. ئێمە بڕوامان بە ئازادی هەیەو دژی ئەوەین هۆشداریی بەمنداڵان بدەین وئاگاداریان بکەینەوە، دەشزانین کە کۆمەڵگای ئازادانە یەکێکە لەبنەماکانی ژیانی دیموکراسیەت.لەگەڵ ئەوەشدا زۆر جار روو دەدات کە منداڵێك(هاوڕێیانی) بهێنێتەوە ماڵەوە ،بەتایبەت ئەو هاوڕێیانەی دەبنە جێگای ڕق ونەفرەتی خانەوادە.رەنگە ئێمە زۆر کەیفمان بەمنداڵی لاف لێدەرو فشەکەر نەیەت یان دڵی منداڵەکانمان دەڕەنجێنین چونکە هاوڕێیەتی کەسانی درۆزن وقسەچین دەکات.وەلێ مادامەکێ رەوشت و رەفتاریان بەو شێوەیە نییە کە هەرگیز نەتوانرێت بەرگەی بگیرێت، واباشترە پێش ئەوەی بچینە نێومەسەلەکەوە، دان بەخۆدابگرین ودەربارەی ئەم هەڵبژاردنە لێوردبوونەوەو چاوخشاندنەوەیەکی پێویست ئەنجام بدەین.بۆهەڵسەنگاندنی هەڵبژاردنی هاوڕێ لەلایەن منداڵانمانەوە چ پێوەرێکمان لەبەردەستە؟دەبێ هاوڕێیان کاریگەری و شوێنەواری بەسوودو چاککاریان بەسەر یەکتریدا هەبێت. منداڵ هەمیشە پێویستی بەوە هەیە ئاوێتەی ئەو کەسایەتییە جۆراوجۆرانە بێت کە تەواوکەری کەسایەتیی خۆی بێت. چونکە بۆنموونە منداڵێکی گۆشەگیر پێویستی بەوە هەیە لەگەڵ ئەو هاوڕێیانە تێکەڵ بێت کە کۆمەڵایەتین و منداڵێکی ترسنۆکیش پێویستی بەهاوڕێیەتی کردن و تێکەڵ بوونی کەسانی سەربەخۆترە، دەبێ منداڵێکی ترسنۆك دۆستایەتی لەگەڵ منداڵانی ئازاددا بکات ،هەروەها ئەو منداڵەی سیفاتی کۆرپەیەکی ساوای هەیە دەبێ سوودێکی زۆر لە دۆستایەتیکردنی هاوگەمە پێگەیشتووەکانی وەربگریت، ئەومنداڵەی زۆر خەیاڵپڵاوی دەکات پێویستی بەتێکەڵاو بوونە لەگەڵ منداڵانی واقیع بینتر، منداڵێکی تووڕەو شەڕاوی بەهۆی تێکەڵاوبوون بە منداڵێکی بەهێزتر وەلێ گونجاوتر بەشێوەیەکی کاریگەر دێتە سەر رێگای راست. دەبێ ئامانجی ئێمە ئەوەبێت بەهۆی ئامادەکردنی

زەمینەی تێکەڵاوبوونی منداڵان بەکەسایەتیە جۆراوجۆرەکان هۆکاری چاککردنەوەی کەموکوڕییەکانیان ئامادەبکەین.دەبێ تاپێمان دەکرێ هەوڵی ئەوە بدەین کە منداڵەکانمان تێکەڵی ئەو منداڵانە نەبن کە لە رووی کەسایەتییەوە چوونیەکن .

بۆ نموونە دوومنداڵ کە هەردووکیان (تووڕە وشەڕاوی) وئەهلی سنووربەزاندن و دەستدرێژیبن بەهۆی تێکەڵبوون لەگەڵ یەکتریدا جارێکی دیکە ئەنجامێکی پێچەوانە وەدەست دەهێننەوە. دوومنداڵی شەڕخواز بەهۆی تێکەڵاوبوون و هاوڕێیەتیکردنی یەکتری جارێکی دیکە بەشێوەیەکی یەکجارەکی شەڕخوازتر دەبن.دەبێ بەتایبەت نەهێڵین منداڵانمان هاورێیەتی لەگەڵ ئەو منداڵانەدا بکەن کە ئارەزووی خراپەکارییان هەیە. لەبەر ئەوەی ڕەنگە ئەم منداڵانە بەهۆی ئەزموونەکانی خۆیانەوە چ لەقوتابخانە چ لەچوارچێوەی ماڵەوە ببنە سەرمەشق وجێگای لاساییکردنەوەی منداڵ.چاودێری کردنی منداڵ لە دیاریکردنی هاوڕێیانی خۆی کارێکی زۆر هەستیارودژوارە دەبێ ئێمە تاپێمان دەکرێ منداڵەکانمان لە هەڵبژاردنی هاوڕێیانی خۆی ئازادبکەین و لێپرسراویەتی خۆمان لەم رووەوە تەنیا بەوە سنووربەند بکەین کە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هانی منداڵ بدەین هاوڕێی بەسوود هەڵبژێرێت.

## * بەخێو کردنی گیاندارە ماڵییەکان:

کاتێ کە منداڵێك بەڵێن دەدات چاودێریی ئاژەڵێکی ماڵی بکات, تەنیا نیازپاکیی خۆی پێشان دەدات و نایەوێ شارەزایی خۆی بەئێمە پێشان بدات. ڕەنگە منداڵێك پێویستی بەگیاندارێکی ماڵکیراو هەبێت و زۆریشی خۆشبوویێت, بەڵام بەدەگمەن هەڵدەکەوێت بتوانێت وەکو پێویست چاودێریی بکات. ناتوانرێت لێپرسراویەتیی پاراستنی ژیانی گیاندارێك بەتەنیا بخرێتە سەرشانی منداڵ. بۆ پێشگیری لەهەرجۆرە رەنجاندن و پێکداهەڵشاخانێك لەنێوان منداڵ و دایك و باوك باشتر وایە دایك و باوکان هەمیشە بزانن کە لە بەخێوکردنی ئەو گیاندارەی کە جێگای حەزو خۆشەویستیی منداڵە, منداڵەکە پشکێکی گەورەی هەیە.ڕەنگەمنداڵ لەگەمەکردن لەگەڵ گیاندارێکی ماڵی خۆشەویستی پێببەخشێت و سوودێکی گەورە ببینێت. هەروەها ڕەنگە لە هاوبەشیکردن بۆبەخێوکردنی گیاندارێکی ماڵی دەرەنجامێکی

ئەرێیی وەدەست بهێنێت, بەڵام دەبێ هەمیشە لێپرسراویەتی چاودێریکردنی سەلامەتی و ژیانی گیاندارەکە لەسەر شانی گەوران دابێت.

## رستەکانی ئارەزوو مەندکردن و گیانی سەربەخۆیی

دایکو باوکێکی باش هەمیشە وەکو مامۆستایەکی باش تێدەکۆشن زیاتر و زیاتر رازیبوونی منداڵ وەدەست بهێنن وبەگشتی لەیارمەتی دانی منداڵ بۆ هەڵبژاردنی هاوڕێ و سوود وەرگرتن لە وزەی کەسیی خۆیان هەست بەدڵخۆشی و شادومانییەکی فراوان دەکەن, ئێمە دەتوانین لەگفتوگۆکردن لەگەڵ منداڵان رستەی وا بەکاربهێنین لە بڕوا بوونی ئێمە لەمەڕ هەڵبژاردنی بڕیارو نەخشە عاقڵانەکەی ئەوانەوە سەرچاوەی گرتبێ. لەبەر ئەوە کاتێ وەڵامی دەروونیی ئێمە بۆداواکاری و خواستەکانی منداڵ (بەڵێ) یە دەتوانین رازیبوونی خۆمان بەشێوەیەك پێشان بدەین کەهەستی سەربەخۆ خوازیی منداڵ تێر بکات. ئەمەش چەند نموونەیەکە بۆ شێوەی گوتنی بەڵێ:

ـ هەرکاتێ خۆت حەزبکەیت....

ـ ئەگەر خۆت زۆر حەزت لێبێ.

ـ ئەوە تۆی کە دەبێ لەم بارەیەوە بڕیاربدەیت.

ـ بڕیاردان بەتەواوی لەسەر شانی تۆیە. یان ئەرکی تۆیە ئەگەر تۆ پەسەندی بکەیت منیش قبوڵمە.

وەکو روون و ئاشکرایە وەڵامی وشك و بریشکی (ئا) منداڵ دڵخۆش دەکات. بەڵام رازاندنەوەیەکی کورتی ئەم بەڵێیە لە بەرانبەرئەم رازیبوونە دڵخۆشی و شادومانیی منداڵ زیاتر دەکات ,چونکە وا هەست دەکات کە خۆی بڕیار دەدات و ئەم هەستە دەبێتە هۆی بەهێز کردنی متمانە بەخۆکرنی منداڵەکە.

## بەشی پێنجەم:
## ڕێککاری: ئازادی و لێپرسراویەت

- ئەنجامەکانی گومان و دوودڵی لەجیهانی ئەمڕۆدا.
- پێویستییە سۆزییەکانی دایك و باوك و ستەمکاریی منداڵان.
- ڕێگا پێدان.
- شێوازە نوێیەکان: چەندڕێگایەکی نوێ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەست و جوولەکانی منداڵان.
- ڕێککاری و ئاراستەکردن: لەرابردوو و ئێستا دا.
- سێ ناوچەی ڕێککاری و ئاراستەکردن.
- هونەری دیاریکردنی پاڵنەرە پڕ لە مەترسییەکان.
- مەسەلەکانی ڕێککاری و ئاراستەکردن وجموجۆڵە جەستەییەکان.
- بەهێزکردنی ڕێککاری و ئاراستەکردن.
- هەرگیز نابێت منداڵ لە دایك و باوکی بدات.
- لێدان لەسمتی منداڵان.

## ئەنجامەکانی گومان و دوودڵی لەجیهانی ئەمڕۆدا

دەربارەی ڕێکخستن و ئاراستەکردنی منداڵان چ جیاوازیەك لەنێوان باپیرانمان وخودی ئێمەدا هەیە؟ باپیرانی ئێمە بەردەوام لە پەروەردەو فێرکردنی منداڵاندا هێزو دەسەڵاتیان پێشان دەدا لەکاتێکدا ئەگەر ئێمە بمانەوێ هەر هەنگاوێك لەم ڕێگایەدا بهاوێین ڕووبەڕووی گومان و دوودڵی دەبینەوە. تەنانەت باپیرانمان لەو کات و بارانەی لە هەڵەشدا بوون بەبڕوابەخۆبوون و دڵنیاییەوە پرۆسەی پەروەردەییان بە ئەنجام دەگەیاند, لەکاتێکدا ئێمە تەنانەت دەربارەی هەڵبژاردنی ڕێگای دروستی پەروەردە کردنیش بەگومان ودوودڵییەوە هەنگاو دەنێین.ئەم گومان ودوودڵییە دەربارەی چۆنییەتی پەروەردەکردنی منداڵانی ئەمڕۆ لەکوێوە سەرچاوە دەگرێت؟هەموومان دەربارەی (فرۆید) (froued) و دەروونناسی وچارەنووسە پڕ لە مەترسییەکانی قۆناغی فەوتێنەری منداڵی گوێمان لەهەندێ قسە بووە.ئێمە گشتمان بەردەوام لەم دوودڵیەدا دەژین نەوەك هێدمەیەك بە ژیانی

منداڵانمان بگەیەنین, ئەم نامەیەی ژێرەوە کەلەلایەن دایکێکەوە نووسراوە و بۆمن ڕەوانە کراوە بەتەواوی ئەم ڕاستییە دووپات دەکاتەوە:

(زۆربەی کات بۆ من زۆر دژوارە کە کارلێکراوی و هەستەکانی خۆم بەقسە دەرببڕم،ڕەنگە بتوانم بەنووسین ئەوشتە ڕاڤەبکەم کە شوێنەوارێکی قووڵ لەدڵمدا بەجێدەهێڵێ، ئەگەر هەرکاتێ شتێکم بەنەگوتراوی وازلێهێنا، دەزانم تۆخۆت لەمیانی ڕستەکانەوە پەی پێ دەبەیت ,سوپاسی تۆدەکەم کەهاتیە کلیسای ئێمەوەو لەگەڵ چەنددایك و باوکێکدا گفتوگۆت کردو گوێت لێڕاگرتین.گەرچی دەربارەی پەروەردەو فێرکردن زانیارییەکانی ئێمە بە ئەندازەی تەواو نەبوون تاکو بەپێی پێویست سوود وەربگرین. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا خاڵێك لە قسەکانی تۆدا کاریگەرییەکی فراوانی بەسەر مندا هەبوو. کاتێ گوتت هیچ دایك و باوکێك حەزناکەن بەئەنقەست هەنگاوی وەها باوێن کە لە ڕووی سۆزییەوە منداڵەکەیان بێزار بکات, بەڵکوهەندێ کات بەهۆی بێ ئاگاییەوە هەنگاوی وەها دەنێن کەزیان بە منداڵەکەیان دەگەیەنێت.

هیچ یەکێك لە ئێمە بەئەنقەست هەنگاوی وەها ناوێت کە لەڕووی دەروونی و ڕەوشتی وسۆزییەوە زیانی بۆمنداڵ هەبێت، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئێمە زۆر بەمان بەبێ هۆ منداڵەکانمان ئازار دەدەین. هەندێ کات لە دڵەوە دەگریم لەبەرئەوەی بەبێ بیرکردنەوە شتێکم بەرانبەرمنداڵەکانم کردووە یان گوتوومە. لەخودای گەورە دەپاڕێمەوە کەجارێکی دیکەمن لەهەنگاوی ئاوا زاڵمانە بپارێزێت..ڕەنگە هیچ کاتێك ئەم هەڵانە دووبارە نەبنەوە.بەڵام شتێکی خراپترهاتۆتە جێگای هەنگاوە زاڵمانەکانم.بەومانایەی کە دەترسم وپەشیمانم.ئەم ترس وپەشیمانییەش گیانم دەکرۆژێت, چونکە وادەست دەکەم منداڵەکەمم بەدرێژایی ژیانی خۆی تووشی بەخترەشیی کردووە).

هیچ کەسێك ناتوانێت دەربارەی هاوڕێیەتی و پاکخوازیی ئەم دایکە کەمترین دوودڵی بخاتە نێودڵی خۆیەوە، بەڵام هەرکاتێك ئەو لەجیاتی هەستکردن بەگوناهکاری ئاگاداری وزانیارییەکی زیاتری لە پەروەردەکردنی منداڵدا هەبێت, بۆمنداڵەکە زۆر زۆر سوودمەنترە. دەتوانرێت دایکێکی ئاوا بەودایکە بچوێنرێت کەکاتێ دەستێکی

شکاو دەبینێت دەقیژێنێت و یان کاتێ خوێن دەبینێ بێهۆش دەبێت.ئێمە چاوەڕێی کارزانی وکەمە دڵسۆزییەکی پزیشکین،نەك بەزەیی پێداهاتنەوەیەکی زۆرو گریەوزاری. هەروەها دایك و باوکان دەتوانن پێنە گەیشتن و کەموکوڕیی رەوشتیی منداڵان بەرێگایەکی نیوەپیشەیی وەربگرن،ئەگەر زیاد لەپێویست خۆی نەکەوێتە نێوداوی سۆزەوە، زۆربەی مەسەلە رێککارییەکان وناراستەکارەکان هەر لەخۆیانەوە چارەسەردەبن. بەپێچەوانەوەشەوە ئەگەر ئەم مەسەلانە بەتووڕەیی وخێراییەوە وەربگرین،ڕەنگە ئاقیبەتی سەختوناسازگاری وابێنێتە ئاراوە کە بەدرێژایی ساڵانێکی دووروودرێژ دایك و باوك و منداڵان نوقمی بەختڕەشیی بکات.

## پێویستییە سۆزییەکانی دایك و باوك و ستەمکاریی منداڵان:

دەبێ دایك و باوك منداڵەکانی خۆیان خۆشبووێت،بەڵام هیچ منداڵێك پێویستییەکی یەکسەری بەوە نییە کە دایك و باوکی لە هەموو چرکەیەکدا سۆز و خۆشەویستیی خۆیانی پێ پێشان بدەن.ئەودایك و باوکانە بەتەواوی هەڵەن کە بە بیانووی مانابەخشین بە ژیانی خۆیان یان پاراستنی ئاسوودەیی خانەوادەیی بەرانبەرمنداڵەکانی خۆیان لە هیچ شتێکدا درێغیان نییەولەترسی دڵرەنجان و دڵشکان و لەدەستدانی خۆشەویسیتی منداڵەکە تەنانەت دەسەڵاتی ماڵەوەشی پێ دەسپێرن، لەبەر ئەوەی منداڵەکان بە زانینی تینوویەتیی دایکان و باوکانیان بۆ خۆشەویستی ،بەردەوام بە خراپی سوود لەم تینوویەتییە وەردەگرن و وەك ستەمکارە دیکتاتۆرەکانیان لێدێت و دەبێ هەموو ئەندامانی خانەوادە وەك نۆکەرێکی ئەلقە لەگوێی ئەوانبن. زۆربەی منداڵان باش لەوە گەیشتوون کاتێ کە بە خۆشنەویستن هەڕەشە لەدایك و باوکیان دەکەن ئەوەی دەیانەوێت بەدەستی دەهێنن. هەرکاتێ شتێکیان بووێت چەکەکەی خۆیان بەکاردەهێنن:

(ئەگەر ئاواوئاوا نەکەیت ئیدی تۆم خۆشناوێت)، بەم شێوەیە دایکان و باوکان بەردەوام هەست دەکەن کە لەژێر هەڕەشە دان. زۆربەی دایکان و باوکان زۆر دەکەونە ژێر کاریگەریی قسەکانی منداڵ، بۆیە دەپاڕێنەوەو تکادەکەن و هیوای ئەوە لە منداڵ دەخوازن کە هەمیشە ئەوانی خۆشبووێت، بە سپێشاندانی

خۆشەویستییەکی زیاتر بە منداڵ و وەدیهێنانی گشت داواکارییەکانی، تێدەکۆشن بەتەواوی جێگای خۆیان لەنێو دڵیدا بکەنەوە.

ڕێگا پێدان بەڕەڵاکردن: چ جیاوازییەك لەنێوان مۆڵەتپێدان و جڵەو بەرداندا هەیە؟ ڕێگا پێدان بریتییە لەو ڕەوشەی کە لەسەر بناغەی بچووکیی منداڵ بنیادنراوەو قبوڵکردنی ئەو ڕاستیەیە کە (منداڵ منداڵە) و، ناتوانێ بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ کراس وچاکەتەکەی بە خاوێنی رابگرێت و منداڵ ڕاکردنی پێ باشترە لەهێواش ڕۆیشتن، لەلای منداڵ فەلسەفەی بوونی دەرەخت پێدا هەڵگەڕانییەتی و سوودی سەرەکی ئاوێنە لاسایکردنەوەیە بەهۆی ئاوێنەکەوە.

بناغەی پرەنسیپی ڕێگاپێدان بەمنداڵان لەسەرقبوڵکردنیان وەك بوونەوەری خاوەن ماف بنیادنراوەو مافی خۆیانە هەموو جۆرە هەستوو ئارەزوویەکیان هەبێت، دەبێ ئازادیی هەبوونی ئارەزوو لەلای منداڵ ڕەهاو بێ سنوور بێت و دەبێ هەموو هەست و خەیاڵ و بیروخەون وخواستەکانی بەپێی ئەم پرانسیپەوە قبوڵ بکرێن و جێگای ڕێزبن و بەهۆی هۆکارە پێویستەکانەوە ئازادانە پێشان بدرێن.بەڵام نابێ ڕەوشت و ڕەفتاری شەڕ خوازانە و زیانبەخش ڕێگای پێبدرێت و هەرکاتێ شوێنەوارەکانی بەدیار کەوتن دەبێ دایك و باوك دەست بخەنە نێویەوە و شەپۆڵە خرۆشاوەکانی سۆز بەرەو ڕێرەوە بێ مەترسییەکان ببردرێن. ئەم ڕێرەوانەش بریتین لە وێنەکێشان، نیشانەشکێنی،بڕینەوەبەمشارو، مشتبازی لەمرۆڤە پەڕۆینەکانی هاوبەژنی منداڵ و، نووسینی شیعرو چیرۆکە تاوانبارییەکان و هتد. بەشێوەیەکی گشتی دەتوانرێت بگوترێت ڕێگاپێدان بریتییە لە قبوڵکردنی ڕەوشت و خەیاڵکردن لەهەمان کاتیشدا بتوانرێت سۆزە توندەکانی منداڵان بخرێنە نێوڕێڕەوە بێ ئازارەکان، لەکاتێکدا جڵەوبەردان بریتیە لە ڕێگادان بەهەنگاوە نەخوازراوو ناپەسندەکانی منداڵ، ڕێگاپێدان دەبێتە هۆی پشتبەخۆبەستن و زیادبوونی توانای منداڵ لەپێشاندانی بیروهەستەکانی خۆی لە کاتێکدا بەڕەڵاکردن دەبێتە هۆی نیگەرانی ودوو دڵی و زیادکردنی پێشبینییەکانی منداڵ بۆبەدەستهێنانی ئەو تایبەتمەندییانەی کە ناتوانرێن بەدەست بهێنرێن.

*** شێوازە نوێیەکان: چەند رێگایەکی نوێ بۆ رووبەڕوو بوونەوەی هەست و و رەفتارەکانی منداڵان:-**

هەلومەرجی سەرەکیی شێوازی نوێی ئاراستە کردن و رێککاری,جیا کردنەوەی نێوان ئارەزوو و جووڵەو رەفتارەکانە .ئێمە بۆجووڵە و بزاوتەکان سنورێك دادەنێین لەکاتێکدا هەرگیز نابێ ئارەزووەکان سنوور بەند بکەین.

مەسەلە ئاراستەیی و رێککارییەکان بەگشتی دووبەش لە خۆدەگرن:هەست وهەڵچوونە پڕ لە تووڕەییەکان رەفتارە پڕ لە تووڕەییەکان کە دەبێ بەرێگایەکی جیا لەوی دیکەبەرێوەببرێن و هەریەشێك لەهەست و هەڵچوونەکانی منداڵ بەتەواوی دیار بکرێن و هۆکارەکانی پێشاندانی هەستەکانیشیان فەراهەم بکرێن ,لەکاتێکدا دەبێ زۆربەی جارجووڵەو بزاوتەکان سنووربەندو راست بکرێنەوە, رەنگە هەندێ کات دەستنیشانکردنی هەستەکانی منداڵ بۆ لادانی رووبەڕوو بوونەوەو پێکدا هەڵشخان خۆی لە خۆیدا بەس بێت:

دایك:دەڵێی ئەمرۆ تووڕەیت!

کوڕ: دیارە کە تووڕەم.

دایك: لەدەروونی خۆتدا هەست بە ناڕەحەتییەکی زۆر دەکەیت.

کوڕ: ڕاستە.

دایك: لەیەکێك تووڕە بوویت؟

کوڕ: بەڵێ لە تۆ تووڕەم.

دایك: بە من بڵێ بۆچی لە من دڵگیریت؟

کوڕ: لەبەر ئەوەی منت نەبردە پارکی منداڵان وەلێ (ستیڤ) (steve)ت برد.

دایك: هەڵبەتە تۆ لەم شتە تووڕەبوویت, مەرجت لەگەڵدا دەکەم ئاوات بەخۆت گوتووە:(دلیکم ستیڤی لە من خۆشتردەوێت .)

کوڕ: ڕاستە.

دایك: ئایا بەراستی هەندێ کات وا بیردەکاتەوە؟

کوڕ: وایە!

دایك: کوڕم گوێبگرە!کاتێ هەستێکی وا باڵت بەسەردادەکێشێ وەرەو مەسەلەکە

بە من بلێ.

دەبێ لەهەندێ باری دیکەدا سنوورێك بۆجوولەو بزاوتەکانی منداڵ دیاری بکرێ.

کاتێ کە (سام) (SAM)ی (٤) ساڵە دەیویست دەمی پشیلەکەی هەڵزڕێنێ تاکو بزانێ چی لەناودایە،حەزی پشکنینە زانستییەکەی ئەوی بەڕەوا زانی بەڵام بە بڕوا بەخۆبوونەوە رەفتارە ناپەسندەکانی (سام)ی جڵەوگیرکرد وگوتی: (دەزانم کە حەزدەکەی بزانی چی لەناودایە،بەڵام نابێ دەمی پشیلە هەڵبزڕێنرێت. لێگەڕێ بزانم ئایا دەتوانم وێنەیەك پەیدابکەم تاکو بەهۆیەوەپیشانت بدەم ناودەمی پشیلە چی تێدایە ؟).

کاتێ دایکی تید(ted) بینی کەوا تیدی پێنج ساڵە لەسەر دیواری ژووری پێشوازیدا وێنە دەکێشێ ئەوەندە تووڕەبوو کە دەیویست لێی بدات, وەلێ هەستی بەپەشیمانی کردوو لەجیاتی ئەمە ئاوای پێگوت:(تید! سەردیوارجێگای وێنە کێشان نییە. دەبێ لەسەر کاغەز وێنە بکێشرێت. وەرە ئەم سێ پەڕە کاغەزە بگرە تاحەزدەکەی وێنە بکێشە!). ئەوکات دەستی بە پاککردنەوەی دیوارکرد . (تید) ئەوەندە کەوتە ژێر کاریگەریی لێبوردنی دایکی یەکسەر گوتی: (دایە زۆرم خۆشدەوێیت!)

ئەم شێوە مامەڵەیە بە ڕەفتاری دایکێك لە ماڵێکی دیکە دا بەراورد دەکەین:

دایك: (چیدەکەی؟ نازانم چارەم لەگەڵ تۆ دا چییە؟ نابێ بزانیت کە نابێ دیوار پیس بکرێت؟) یان (دەبەنگ فەوتام لە دەستت! کاتێ باوکت هاتەوە باسی ئەم شاکارە تازەیەی تۆی بۆدەکەم ئەوکاتە ببینە چۆنت تەنبێ دەکات).

## ڕێککاری و ئاراستەکردن: لەرابردوو وئێستادا

جیاوازییەکی گەورە لەنێوان ڕێککاری وئاراستەکردنی رابردوو وئێستادا هەیە.لەرابردوودا لە رووی ڕێککاری و ئاراستەکردنی منداڵانەوە دایك و باوکان هەوڵیان داوە جوولە نەخوازراوو ناپەسندە کانی منداڵ جڵەوگیر بکەن, بەڵام گرنگییان بەهۆی پەیدابوونی ئەم جوولە و بزاوتە ناپەسندانە نەدەدا.

زۆربەی جار سنووربەندکردنەکان لە چوارچێوەی تووڕەیی و هەڕەشدا بەدیار

دەکەوتن و بەردەوام مۆرکێکی توندڕەوانەو پڕ لە سستوسوککردنیان هەبوو. جگە لەمانە،ئاگادارکردنەوەو هۆشدارییەکانی ڕێککاری و ئاراستەکردن لەوکاتەدا ئەنجام دەدران کە منداڵ کەمترتوانای بیستنی هەبوایە و قسەی وا بەکاردەهات کە بەسەدان جار بەرگری و ڕووبەڕوو بوونەوەی منداڵەکەی زیاتردەکرد.زۆربەی جارمنداڵ دەرنجامێکی وای لەم ڕێککاری وئاراستەکردنەدا بەدەست دەهێنا کە جوولە تایبەتییەکەی شایستەی ڕەخنەوئاگادارکردنەوە نەبووە.بەڵکو زیاتر بۆ ئەوە ئاگادارکراوەتەوەو هۆشداریی دراوەتێ چونکە مرۆڤێکی باش نەبووە.بەڵام ئێستا,ڕێککاری وئاراستەکردنی منداڵ لەسەر بناغەی ئاوڕ دانەوەو گرینگی دان بە هەستوو ڕەفتارەکانی منداڵەوە بونیادنراون. دایك و باوکان ڕێگا بەمنداڵ دەدەن (لەچەند هەلومەرجێکدا کەدواتردەبێتە جێگای گرینگی پێدان وباسکردن و لێوردبوونەوەی ئێمە) دەربارەی هەستەکانی خۆی قسە بکات, بەڵام سووربن لەسەر ئەوەی کە جوولە و ڕەفتارە ناپەسند و نەخواستراوەکانی سنوور بەند بکەن و بەرزەفتی بکەن. ئەم دیاریکردن وسنوور بەندکردنە بەشێوەیەك ئەنجام دەدرێت کە عیزەتی نەفسی دایك و باوك ومنداڵ بریندار نەکات,جگە لەمەش,سنور بەندکردنەکان لایەنی دکتاتۆریانە و ئالۆزیەکی نییە, بەڵکو لەگشت ڕوویەکەوە پەروەردەیی و کەسایەتیسازە. لەهەمووی گرینگتر ئەوەیە ئەم دیاریکردن و سنوور بەندکردنانە بەبێ زۆرلێکردن و پێشاندانی تووڕەییەکی فراوان ئەنجام دەدرێت. دڵشکاندن و ڕەنجاندنی منداڵ پێشبینی و درك دەکرێت, نابێ سەر لەنوێ ئاگادار بکرێنەوە و هۆشدارییان بدرێتێ ئەگەر هاتوو حەزیان بەم سنوور بەندکردنانە نەبوو.

کاتێ ڕێککاری و ئاراستەکردن بەم شێوەیە بێت,ڕەنگە منداڵ بخاتە سەر ئەو باوەڕەی بە ئارەزووی خۆی ئەوە بە پێویست بزانێت کە هەندێ ڕەفتارو جوولەی سنووربەند بکرێت و جڵەوگیرکردنی هەندێك ڕەفتارو جوولەی خۆی قبووڵ بکات. لەم ڕووەوە ڕەنگە هەندێك جار ئەو ئاراستەکاری و ڕێککارییەی دایك وباوك ئەنجامی دەدەن هەر لەخۆیەوە پەیدابێت ومنداڵ بە پەیڕەوکردنی ڕەوشت و ڕەفتاری دایك وباوك بەرەبەرە فێردەبێت کە چۆن ڕەفتارو ڕەوشتی خۆی چاکبکاتەوە.

## سێ ناوچەی ڕێککاری و ئاراستەکردن:

منداڵان پێویستیان بەوە هەیە کە بە شێوەیەکی ڕاشکاو و ڕۆشن ڕەوشتی پەسندو

ناپەسەندیان پێبناسێنرێت ,کاتیٚ ئاگایان لەسنووری جوولەو رەفتارو هەنگاوە ڕێپێدراوەکان بێت هەست دەکەن دڵنیاو دڵارامترن, بەپێی ڕوونکردنەوەکانی دکتۆر (فرێتز ریدلD.R FRITZ REDIL) دەتوانرێت بگوترێت کە ڕەوشتی منداڵ سیٚ ناوچەی هەیە ئەوانیش سەوزو زەردو سوورن. ناوچەی سەوز ڕەوشتە پەسەندو ڕێگاپێدراوەکانە , واتا ئەو ناوچەیەیە کە بەوپەڕی ویست وحەزو شادومانییەوە تیایدا بەمنداڵ دەڵێین بەڵیٚ.ناوچەی زەرد ئەو ڕەوشتانە دەگرێتەوە کە ناپەسندو نەخوازراون, بەڵام ڕەنگە بەهۆیەکی تایبەتییەوە بتوانرێت لێی ببووردرێت و ڕێگای پێبدرێت. بۆ نموونە دەتوانرێت بەم بارانەی خوارەوە ناو ببرێن:

١ـ لادانە سەرەتاییەکان:

ئەو شوفێرەی کەتازە سووکانی شوفێریی گرتووە,هەرکاتێك ئاماژەمان بۆیکرد کەدەبیٚ بەلای راستدا بشکێنێت و, کەچی ئەو بەرەو لای چەپ بشکێنی, نابیٚ مۆڵەتی بدرێتیٚ. ئەم هەڵەیە بەئومێدی چاکبوونەوەو راستکردنەوەی ئایندەیی شایانی لێبووردنە.

٢ـ ئەولادانانەی بەهۆی هەلومەرجە نائاساییەکانەوە ڕوودەدەن:

ئەو بارانەی کە تایبەتی و نائاسایین وەکو ڕووداو، نەخۆشی، نیشتەجێبوون لە شوێنێکی نوێدا، جودابوونەوە لە هاوڕێیان و, مردن و تەڵاق لەخانەوادەدا دەبێتە هۆی ئەوەی کەچاو لەهەندیٚ کەموکوڕی ڕەوشتی منداڵ بپۆشرێت, ئەم چاوپۆشینە لە لەبەرچاوگرتنی هەلومەرجە دژوارەکاندا پێویستی بەچەند یاسایەکی پیادەکراوی نویٚ هەیە. ئێمە ناڵێین ئەم رەوشتە پەسندە, لەراستیدا رێبازی ئێمە بەباشی باس لەوە دەکات کە ئەم ڕەوشت و ڕەفتارە دەبیٚ تەنیا بەهۆی پەیدابوونی هەلومەرجە نائاساییەکانەوە لێی ببووردرێت و ڕێگای پێبدرێت.

ناوچەی سووریش ئەو ڕەوشت و رەفتارانە دەگرێتەوە کە بەهیچ شێوەیەك رێگایان پێنادرێت و دەبیٚ جڵەوگیری لیٚ بکرێت. رەوشت و ڕەفتارە رێگا پێنەدراوەکان بریتین لەو ڕەوشت و رەفتارانەی کە سەلامەتی و خۆشگوزەرانیی خانەوادە دەخەنە مەترسییەوەو هێدمەیەکی گەورە بە بنەماگیانی و مادییەکانی دەگەیەنن. هەروەها ئەو ڕەفتارو ڕەوشتانەش لەخۆدەگرێت کە لەرووی یاسایی و رەوشتی و

کۆمەلایەتییەوە قەدەغەکراون .بەهەمان ئەو ئەندازەیەی کە ڕێگاپێدان لە ناوچەی سەوزدا گرینگیی هەیە, بەهەمان ئەندازەش قەدەغەکرنی جووڵەو ڕەفتار لەناوچە سوورەکاندا مەسەلەیەکی ژیانییە. کاتێك مۆڵەت بە منداڵێك دەدرێت دەست کاریی ڕێگا پێنەدراو بکات, دوودڵی و ناڕەحەتییەکەی رووەو زیادبوون دەڕوات، کوڕێکی بچووکی هەشت ساڵە کەمۆڵەتی پێدرابوو لەکاتی بەرێدا ڕۆیشتنی پاسێکدا خۆی بەپشتەوەی وەبکات, دایکی بەوە تاوانبار دەکرد کە خۆشیناوێت و بە ئاوازێکی ڕەخنەگرانەوە ئاوای بەدایکی دەگوت:(ئەگەر بەراستی منت خۆشبوویستبایە هەرگیز ئامادە نەدەبوویت ڕێگا بەمن بدەیت خۆم بخەمە نێو مەترسیی مردنەوە.), کوڕێکی دیکە باوەڕی وابوو باوکی ئەوەندە پابەندی ژیانی ئەونییە چونکە مۆڵەتی پێدابوو چەقۆیەکی دوگمەداری هەبێت. کوڕێکی دیکە بەسەختی لە دایك و باوکی ڕەنجابوو چونکە لەچوونە نێو گەمە دڕندانەکەی هاوڕێیانی جلەو گیریان نەکردبوو کە لە تاقیگەی زانستی ئەنجامیان دابوو وبەسەختی ئازاریان دابوو. بەشێوەیەکی گشتی: کاتێك منداڵان ئەو ئارەزووانە پیادە دەکەن کە لەلایەن کۆمەڵگاوە بە ناپەسند لەقەڵەم دراون، ڕووبەڕووی دژوارییەکی فراوان دەبنەوە. ئەرکی دایك و باوکە یارمەتیی منداڵ بدەن لەهەوڵدان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەو کۆنترۆڵ کردن و زاڵبوون بەسەر ئەم سۆز و پاڵنەرە تێکدرانە ,ئەم یارمەتیدانەش زیاتر لەسەر بناغەی دیاریکردنی ئەم سۆزو پاڵنەرانەیە کە لە نێو خودو دەروونی منداڵدا بوونیان هەیە, لە ڕاستیدا دایك و باوك جگە لە جڵەوگیر کردنی ڕەفتارە مەترسیدارەکان بەم دیاریکردنە پەیامە هێماییەکانیشیان بەمنداڵ دەگەیەنن بەو مانایەی: نابێت لەسۆزو پاڵنەرە مەترسیدارەکانی خۆت بترسیت. من لێناگەڕێم لەسنووری دیاریکراو تێپەڕبێت...دڵنیابەو مەترسە.

## * هونەری دیاریکردنی پاڵنەرە مەترسیدارەکان:

دیاریکردنی سۆزو پاڵنەرە زیانبەخشەکان وەك گشت بنەما پەروەردەییەکان ئەنجامی وەدەستهاتووەو پەیوەندیی تەواوی بەچۆنیەتیی بەکارهێنانی هۆکارەوە هەیە.دەبێ سنووربەندکردنی ڕەمەك وسۆزە مەترسیدارەکان بەشێوەیەك ئەنجام بدرێت کە منداڵ بەشێوەیەکی راشکاوانە درك بەم دووخاڵە بکات: —

ئەلف: ڕەفتارو رەوشتی ناپەسند و نەخوازراو چییە؟

با::چ رەفتارێك لەجیاتی ئەو رەفتارە ناپەسندو نەخوازراوانە دابنێنن؟ بۆنموونە :دەتوانرێت ئاوا بەمنداڵ بگوترێت: (تۆنابێ قاپە پەلەکان بهاوێژیت. بۆلەجیاتی ئەمە تۆپ ناهاوێژیت؟) یان دەتوانرێ بەزوبانێکی راشکاوانەتر راوبۆچوون دەربېردرێت:(قاپە پەلەکان بۆ هاوێشتن دروستنەکراون. تۆپ بۆهاوێشتن درووستکراوە.),(نابێ بەمشتەکۆڵە لێدان لە براکەت مشتەکۆڵە فێربیت, بەهۆی بووکۆکە پەڕۆینەکانەوە مشتەکۆڵە فێردەبیت). باشترە دیاریکردنەکان و سنوردانانەکان هەمیشە تەواوبن نەك ناتەواو,بۆ نموونە: جیاوازییەکی زۆر لەنێوان ئاوپرژاندن یان نەرژاندن بەدەمووچاوی خوشکدا هەیە. هەرکاتێ بە ناتەواوی سنور بۆئاوپرژاندن دیاری بکرێت بێگومان گرفتی زیاد دروست دەکات. بۆنموونە ئەگەر بە منداڵ بڵێین: (دەتوانیت کەمێك ئاو بەخوشکت دابکەیت بەمەرجێك زۆری تەرنەکەیت) بێ چەندوچۆن شەڕوهەرایەکی گەورە بەرپا دەبێت. ئەم قسە لێڵ و نائاشکرایە منداڵ لە هەڵبژاردنی بڕیاردا دوو دڵ دەکات, چونکە بۆ بڕیاردان بنەمایەکی رۆشنی لەبەردەستدا نییە.

دەبێ سنووری جووڵەوکرداری منداڵ بەیەکجارەکی دیاریبکرێت و منداڵ لەم دیاریکردنەدا یەك دەرەنجامی بکەوێتە دەست: (ئەم قەدەغەکردنە یەکجارییەو بەهیچ بەهایەك ناتوانرێ لێی پاشگەز ببنەوە), کاتێك دایك و باوکێك دڵنیانین لەوەی کەدەبێ چی بکرێت؟!.باشترە هیچ هەنگاوێك نەهاوێن,بەڵکو دەبێ بیر لەوە بکەنەوەلە دیاریکردنی سنوور بۆ جووڵەو رەفتاری منداڵان شێوازو رێگای خۆیان رۆشن بکەنەوە. ئەو باوکەی یان ئەو دایکەی تووشی دوودڵی ببێت,لەچاڵی بێبنی لێوردبوونەوەو بەلگەهێنانەوەو ئامارەپێکردن سەرگەردان دەبن و بێ ئەرکو

فەرمان دەمێننەوە.ئەو سنوورەی کە بە دوودڵی و ناشارەزاییەوە دیاریدەکرێت, لە ڕاستیدا جۆرە بەرەنگار خوازیەك دروست دەكات وپاڵ بەمنداڵەوە دەنێت بەرگری بکات و تووشی دەمەقاڵێیەکی وایان دەکات کە هیچ یەکێك لە هەردوولایەن ناتوانن تیایدا سەرکەوتن وەدەست بهێنن, بە لەبەرچاوگرتنی گشت لایەنەکان دەبێ سنوورێکی هاوتاو میانڕەوو ئاقڵانەی وا دیاری بکرێت کە ڕەنجان و دڵشکانی منداڵ بگەیەنێتە ئاستێکی کەمترو پارێزگاری لەعزەتی نەفسی بکات و دەبێ چۆنییەتی دیاریکردنەکە بڕوا پێهێنەربێت ,نەك منداڵ بەهۆیەوە هەست بە سست و سووکبوونی خۆی بکات ,جگە لەمەش، دەبێ (دیاریکردن) بۆ ڕەفتارو جوولەیەکی دیاریکراوبێت نەك چەندین ڕەفتارو جوولەی جۆراوجۆر و ,ماوەیەکی درێژ بگرێتەوە. هەوڵی دایك و باوك بۆ چاکسازیی گشت جوولە ناپەسندەکانی منداڵ ڕووبەڕووی شەپۆلەراو بەرگرییەکی توندی منداڵەکە دەبێتەوە. لێرەدا دەربارەی دیاریکردنێکی نەشیاوو نەگونجاوو ناپەسند نموونەیەك دەهێنینەوە.ئەنی (ANNIE)کچێکی (٨) ساڵەیە لەگەڵ دایکی چوونە فرۆشگایەك, کاتێ دایکی سەرقاڵی کڕین بوو,(ئەنی) بەرەولای بەشی کەلوپەلەکانی گەمەکردن ڕۆیشت وبە ئارەزووی خۆی سێ بووکوڵەی هەڵبژارد ,کاتێك دایکی گەڕایەوە (ئەنی) بەهێواشی لێی پرسی:

(دەتوانم کامە لەو بووکوڵانە بکڕم؟) لەبەر ئەوەی دایکی بۆ کڕینی جلوبەرگ پارەیەکی زۆری خەرجکردبوو, حەزی نەدەکرد زیاتر شت بکڕێت, لەبەر ئەوە بەتووڕەییەوە گوتی :(دیسانەوە کەلوپەلی گەمە؟ ئەوەندەت کەلوپەلی گەمە هەیە کە خۆشت نازانیت چیان لێبکەیت هەرچیەکت بەرچاو بکەوێت دەتەوێ! کاتی ئەوەیە حەزەکانت کەم بکەیتەوە!) ,پاش چەند ساتێك دایکی پەی بە تووڕەبوونە بێ ماناو لە ناکاوەکەی خۆی بردبوو. هەوڵی دا دڵی منداڵەکەی بداتەوەو بە کڕینی ساردەمەنییەك توندتیژییە بێجێیەکەی خۆی چاکبکاتەوە, بەلام ئەم هەنگاوە هیچ کاریگەرییەکی لەخاوکردنەوەی نێوچەوانە گرژەکەی (ئەنی) دا نەبوو.

کاتێ منداڵێك شتێکی دەوێت بەلام ئێمە نازانین داواکارییەکەی بهێنینەدی. دەبێ بەلای کەمەوە ئەو شادومانییەی بهێڵینەوە ئارەزووی هەبوونی شتەکە لەدڵی خۆیدا پەروەردەبکات. بۆیە واباشتربوو دایکی (ئەنی)ئاوای پێگوتبایە: (تۆحەزدەکەیت

چەند دانەیەك لەم بووكۆڵانە بهێنیتە ماڵەوە!چەند حەزم دەكرد تەواوی ئەم بووكۆڵانەت بۆ بكڕم كەلەم بەشەدا هەن، وەلێ بەداخەوە ئەمڕۆ بۆ كڕینی بووكە شووشە پارەم نییە تەنیا (١٠) سنتم هەیە كە تۆ دەتوانیت یان قەڵەم ڕەشكەرەوە یان تۆپێكی بچووكی پێبكڕیت. بڵێ بزانم حەزت لە كامەیانە قەڵەم ڕەشكەرەوە یان تۆپ؟).

ڕەنگە ئەنی قەڵەم ڕەشكەرەوە كەی هەڵبژاردبوایە و بەم ڕێگایە ڕووداوەكە كۆتایی دەهاتوو دایكی بە خۆشەویستییەوە دەیگوت:(وەرە ئەنی! بڕۆ قەڵەم ڕەشكەرەوەكە بكڕە!)، یان بەپێچەوانەوە لەوانە بوو ئەنی دەستی بەگریان و توندخوویی بكردبایە، بەڵام لە هەردووباردا دایك بەتوندی سوور بوایە لەسەر ئەوەی كەدەبێ منداڵەكەی یەكێك لەم دووشتانە هەڵبژێرێت و لەبەرانبەر ویستی منداڵەكە بەهیچ شێوەیەك چۆكی دانەدابوایە ڕەنگە دووبارە جەخت لەسەر گرینگی دانی خۆی بۆ خواستەكانی منداڵەكەی دووپات بكاتەوە. بەڵام هەرگیز ئامادەنەبوایە سنوورە دیاریكراوەكە ببەزێنێت و تەنیا بەگوتنی رستەی لەم جۆرە وازی بهێنابوایە: (دەبینم زۆرت حەز لە بووكۆڵەیە! ئەزیزم ئەم جوولەو ڕەفتارانەت بەهۆی حەزە توندەكەتە بۆ كڕینی بووكەشووشە، وەلێ چەند بەداخەوەم كە ئەمڕۆ ناتوانم بووكۆڵەت بۆ بكڕم. بۆ سنووردارکردنی رەفتارو و ڕێگادان بەمنداڵ ڕێگای جۆراوجۆر هەن ڕەنگە هەندێك كات ئەم چوارهەنگاوەی خوارەوە كاریگەر بن.

١ـ باوك یان دایك ئارەزووو خواستی منداڵ بەراست دەزانێت و بەزمانێكی سادە دەڵێ: (زۆرحەزت لێبوو ئەمشەو بچیتە سینەما).

٢ـ ئەوكات بەوپەڕی ڕاشكاوییەوە سنووری كارێكی تایبەت دیاری دەكات :(بەڵام بەرنامەو ڕێورەسمی ماڵی ئێمە ئەوەیە كە نابێ لەكاتی خوێندندا بچیتە سینەما) .

٣ـ دواتر بەلای كەمەوە چەند ڕێگایەك بۆ وەدەستهێنانی بەشێك لەخواستەكانی منداڵ پیشان دەدات: (تۆ دەتوانیت شەوانی شەمە و یەكشەمە كە بەیانییەكانی ئەم ڕۆژانە قوتابخانەت نییە بچیتە سینەما).

٤ـ ئەوكات یارمەتیی منداڵ دەدات بۆ پێشاندانی ئەم ڕەنجان و دڵشكانەی كە بە شێوەیەكی یەكجارەكی بەهۆی ئەم ناڕەزاییەوە دێتە كایەوە:(ڕاستە كە تۆ بەرانبەر

ئەم ڕێورسمەیماڵەوە ئەوەندە دڵخۆش نیت).
(حەزدەکەیت ئەم ڕێوڕەسمە هەر بوونی نەبووایە.)
(زۆرحەزدەکەیت هەموو شەوێك بچیتە سینەما.)
(بڕوای تەواوم هەیە کاتێك ژن بهێنێت و منداڵتان ببێت ئەم جۆرە ڕێوەرسمە لە ماڵی خۆتاندا پیادە ناکەن).
هەمیشە پێویست و کرداری نییە کە دەربارەی ئەم سنووردانان و دیاریکردن و نەگونجان و سەر پێچیانە لێکدانەوە بکەین، هەندێك کات پێویستە لەسەرەتاوە سنوور دیاری بکەین و دواتر هەستەکانی خۆمان دەرببڕین. کاتێك منداڵێك بەردێك هەڵدەگرێتەوە تاکو بۆ خوشکەکەی بهاوێژێت. دەبێ دایك ئاوای پێبڵێت:(بەرد بۆخوشکەکەت نەهاوێژیت!بەرد لە درەختە کەبگرە!) دواتر دەتوانێت بچێتە سەر هەستەکان و هەندێ ڕێگای بێ ئازاری دەربڕینی هەست و سۆزەکانی پێ پیشان بدات: (ڕەنگە تۆ زیاد لە سنووری خۆی لە خوشکت تووڕەبیت و تەنانەت لەدڵی خۆتدا رقیشت لێی ببێتەوە, وەلێ بەهیچ شێوەیەك نابێ ئازاری پێبگەیەنیت!)
(ئەگەر دڵت بخوازێت دەتوانیت بەردەکە بەرەو درەختەکە بهاوێیت و وابیر بکەیتەوەو وای بهێنینە پێش چاوی خۆت کە درەختە کە خوشکی تۆیە).
(تەنانەت ئەگەرحەزبکەیت دەتوانیت وێنەی رووخساری خوشکەکەت لەسەر کاغەز یان لەسەر درەختەکە بکێشیت و بەرد لەوێنەکە بگریت, وەلێ نابێت بەهیچ شێوەیەك لە خوشکت بدەیت) دەبێ سنوور بەشێوەیەکی وەها دیاری بکرێت کە هێدمە بەعزەتی نەفسی منداڵ نەگەیەنێت و بەشێوەیەکی گشتی تادەکرێ لە ئاماژەکردن بەکەسایەتیی منداڵ خۆبەدووربخرێت.
ڕستەی(کاتی کرانەوەی قوتابخانە قەدەغەیە بچیتە سینەما), لەرستەی (تۆدەزانیت کەکاتی دەوامی قوتابخانە نابێ بچیتە سینەما) کەمتر رەنجان و دڵشکانی منداڵ دروست دەکات.ڕستەی (لەکاتی خەوتن) زۆر ئاسانتر لەرستەی (تۆ هێشتا زۆر بچووکیت کە زۆربەبێداری بمێنێتەوە!زووبخەوە) لەلایەن منداڵەوە قەبووڵ دەکرێت.ڕستەی (ئیدی ئەمڕۆ کاتێکی زیاترمان بۆبینینی تەلەفزیۆن نییە), بەچەندین پلەباشتر لەرستەی (ئەمڕۆبەپێی پێویست سەیری تەلەفزیۆنت کردووەو,

بیکوژێنەوە) بۆمنداڵ جێگای قەبوڵکردنە.
فەرمانی(نابێ جنێوبەیەکتری بدرێت) باشتر لەفەرمانی (تۆنابێ جنێوبە ئەو بدەی ) جێبەجێ دەکرێت.
کاتێك کەشتێك پیشان دەدرێت سنووری دیاریکراوو پەیوەندیدارەکەی شتەکە لەلایەن منداڵەوە باشتر قبووڵ دەکرێت. بۆنموونە رستەی (کورسی بۆدانیشتنە. نەك بۆوەستان لەسەری) بەچەندین پلە باشتر لە رستەی (نابێ مرۆڤ لەسەر رووی کورسیبوەستێ)دەکەوێتەبەردڵان. فەرمانی (قالبە دارینەکان بۆ گەمەکردنن نەك بۆ هاوێشتن) باشتر لەفەرمانەکانی وەك(قالبەکان مەهاوێ!) یان (منیش ناتوانم رێگات پێ بدەم کەقاڵبە دارینەکان بهاوێی چونکە مەترسیدارە) لەلای منداڵانەوە جێبەجێ دەکرێت.

## مەسەلەکانی رێککاری و ئاراستەکردن و جموجۆڵە جەستەییەکان

زۆربەی مەسەلەکانی رێککاری و ئاراستەکردن کە دەربارەی منداڵان دێنە پێشێ، لەدیاریکردن و سنوور بەندکردنی چالاکییە جەستەییەکانیانەوە سەرچاوە دەگرێت، رۆژێ چەندین جارفەرمانی لەم جۆرانەیان بەسەردا دەدەین:(پێمگوتی رامەکە!ناتوانیت وەکو کوڕێکی ئاسایی بەرێگادا برۆیت؟). (ئەوەندە هەڵبەزو دابەزمەکە). (راست دانیشە!). (.نازانم بۆچی لەسەر یەکپێ دەوەستیت! مەگەر تۆ دوو پێت نییە؟) .
(باش بەرێگادا برۆ! دەکەویت وپێت دەشکێت).
ناتوانرێت چالاکیی جەستەیی منداڵان زیاد لە ئاستی خۆی سنوور بەند بکرێت. ساغ و سەلامەتیی دەروونی و جەستەیی منداڵان وادەخوازێت کە رابکەن،بازبدەن، بچنەسەر درەخت،بەردەوام لەچالاکیدابن. نیگەرانی دەربارەی ئەوەی کە نەوەك منداڵ جلوبەرگ و کەلوپەلی خۆی پیس و خراپ بکات زۆر بەجێیە, بەڵام نابێ ئەم نیگەرانییە جێگیرەوەی نیگەرانی لە سەلامەتیی خودی منداڵان بێت. لەبەر ئەوەی دولتر لەلایەن منداڵانەوە بەشێوەی سنوور بەزاندن وشەڕخوازی و زێدەرۆیی لە کاروچالاکییەکانی سەرهەڵدەدات.
دابینکردنی هەلومەرج ودەوروبەرێکی گونجاو بۆ ئازادکردن و خەرجکردنی وزەو

هێزە زیادەکەی مندالآن لە میانی چالاکییە ماسولکەییەکانەوە یەکێکە لەمەرجە سەرەکییەکانی بەهێزکردنی گیانی رێککاری وئاراستەکردنێکی پەسەندی مندالآن و، ژیانێکی باشتر بۆ دایك وباوکان فەراهەم دەکات،کە بەداخەوە دایك و باوك وەکو پێویست نازانن چەندە گرنگە.

## بەهێزکردنی رێککاری و ئاراستەکردن

کاتێك کە هەستەکانی دایك و باوك دەربارەی سنووربەندکردنی جوولەو کارەکانی مندالّ بەتەواوی روون و ئاشکرایەو بەزمانێکی نەرموو خۆشەویستانەوە بۆ مندالّ روون دەکرێتەوە, بە گشتی مندالّ پەیرەوی دەکات. لەگەلّ هەموو ئەمانەشدا مندالّ ماوە ماوە یاسامان پێشێل دەکات و لەسنووری دیاریکراو دەردەچێت، لەبەر ئەوەی زۆربەی جار ئەم مەسەلە گرینگە لەشێوەی پرسیار دێنە پێشیّ کە ئەگەر مندالّ سنووری دیاریکراوی بەزاند دەبێت چی بکرێت؟ لەم بارەدا بنەمای پەروەردەو فێرکردن وا دەخوازێت کەدایك و باوك بەرێگاو مامەلّەیەکی هاورێیانە وەلیّ زۆر جدی پێی خۆیان لەسەر ئەوە دابگرن کە دەبێت مندالّ رەچاوی ئەو سنوورە بکات کە بۆی دیاریکراوە.نابێت دایك وباوك لەکاردانەوە بەرانبەر بەومندالّەی سنووری دیاریکراوی بەزاندووە,پەنا بەرنە بەر وتاردان و ئامۆژگاری و ئاماژەو بەلّگە هێنانەوە دەربارەی پێویستی یان لەبەر چاونەگرتنی سنووری بڕیار لەسەردراو درێژ دادڕی بکەن , هەروەها نابێت جارێکی دیکە بۆ راڤەکردنی هۆی سنوور دیاریکردنەکە وتاربدەن. هیچ سوودی نییە ئەوە بۆمندالّێك راڤە بکەین کە بۆچی نابێت لەخۆشکەکەی بدات, بەلّکو تەنیا ئەوەندە بەسە بەگوێیدا بچرپێنین کە (نابێت مرۆڤ لێی بدرێت) هەروەها نابیّ دەربارەی ئەوەی کە نابێت شووشە بشکێنرێت بچینە سەر دوانگە،بەلّکو ئەوەندە بەسە بەمندالّ پێشان بدەین کە :(شووشە بۆشکاندن نییە).کاتێك مندالّێك سنوورێکی دیاریکراو دەبەزێنێت, نوودلّی وسەرگەردانییەکەی زیاددەکات, چونکە لەچاوەڕوانیی کاردانەوەی دایك و باوك و گوێیاداندایە. لەم بارەیەوە نابێت شلّەژانی مندالّەکە زیاد بکرێت. هەر کاتێك دایك یان باوك زیاد لەسنووری خۆیان قسەیان کردوو وەعزیان دا, لاوازیی خۆیان پیشان دەدەن. لەکاتێکدا لەم جۆرە ساتانەدا دەبیّ هێزی خۆیان پیشان بدەن،چونکە

منداڵ لەم جۆرە ساتانەدا بۆ زاڵبوون بەسەر ڕەمەك و دەروونی خۆی بەبێ شەرمەزاری، پێویستی بەیارمەتی و كۆمەكی پێگەیشتووان و گەورانەوە هەیە.
لەم نموونەی خوارەودا كاردانەوەی ناپەسندو ناتاقڵانەی دایكێك ڕووندەكەینەوە كاتێك منداڵەكەی سنوورە دیاریكراوەكەی بەزاندووە.
دایك: (دەڵێی نیازت وایە تا بەتەواوی تووڕەم نەكەیت ئارام نەگریت,؟! زۆر باشە,(بەسەریدا دەنەڕێنیت) ئیدی بەسە! دەبێ ئەوەندەت لێبدەم تاكو هەناسەت دەوەستێت!ئەگەرجارێكی دیكە ببینم شتێك ڕابووەشێنیت قیامەت هەڵدەستێنم.ئەو دایكە لەجیاتی هەڕوگیف دەیتوانی بەشێوەیەكی كاریگەرتر ناڕەزایی و تووڕەیی خۆی دەربڕیبوایە.بۆ نموونە, ئاوای بگوتبایە:(من لەبەرانبەر ئەم بارودۆخەدا ناتوانم دانبە خۆمدا بگرم) یان (ئەم ڕەفتارانەت تووڕەم دەكەن), یان (ئەم شتانە بۆ هاوێشتن نین) (دەبێ تۆپ بهاوێژیت.),لەوكاتەی دایك و باوك هەوڵ دەدەن منداڵەكەیان سنوورێكی دیاریكراو لەبەرچاوبگرێت, دەبێ ئاگایان لەوەبێت كە دەربارەی جیاوازیی بڕوا وسەلیقە لەگەڵ منداڵەكەیان دەست بەگفتوگۆنەكەن.
ئورسۆلا(Ursula) لە گۆڕەپانی وەرزشدا: حەزدەكەم لێرە بمێنمەوە بەم كاتە زووە نایەمەوە ماڵەوە حەزدەكەم كاتژمێرێكی دیكە گەمەبكەم.
باوك: دەزانم حەزدەكەیت كاتژمێرێكی دیكە بمێنیتەوە وەلێ بەتۆم گوت كەدەبێ بچینەوە ماڵەوە.
ڕەنگە قسەو رادەربڕینێكی وەها دوو ئەنجامی وای هەبێت كە هەردووكیان ناپەسند و نەخوازراوبن: ئەویش ملكەچكردنی منداڵ یان ملكەچكردنی باوكیەتی, مامەڵەیەكی باشتر لەسەر ئەوە بونیاد دەنرێت كە لەجیاتی هەوڵدان بۆ سەپاندنی دەسەڵات وهێز بەسەرمنداڵەكە دەبێ قسەو رایەكانی باوك ئارەزووی منداڵ لەمانەوەی لەگۆڕەپانی وەرزشدا لەخۆبگرێت: بۆنموونە باوكەكە دەیتوانی ئاوابڵێت:(دەزانم زۆر حەزدەكەیت لێرە بمێنیتەوە,تەنانەت ئامادەیت كاتژمێرێكی دیكە لێرەدا گەمە بكەیت, وەلێ بەداخەوە, دەرەنگەودەبێ بگەڕێینەوە ماڵەوە), هەركاتێك پاش یەك دوودەقیقە (ئۆرسۆلا) هەر سووربێ لەسەرمانەوە،دەبێت باوك دەستی بگرێت و،لەگۆڕەپانی

وەرزشـدا بیهێنیتـەدەرەوە.لـەلای منـدالْ کردارچـەندین جارلەقـسەو ئامۆژگـاری کاریگەرترە.

## هەرگیز نابێت مندالْ لەدایك و باوکی بدات:

هەرگیز نابێت مۆڵەت بەمندالْ بدرێت لە دایك و باوکی بدات. ئەم جۆرە هێرشە جەستەییانە هەم بۆ مندالْ و هەم بۆ دایك و باوکی زیانبەخشە،پاش ئەوەی مندالْ لەدایك و باوکی دەدات لەترسی تۆڵە خوازیی ئەوان دەشلەژێت و دەترسێت، پاش ئەوەی دایك و باوکیش بەدەستی مندالەکەیان لێدان دەخۆن تووڕەو تۆڵەخوازدەبن. کاتێك دایك وباوك بە شێوەیەکی ڕەها نایەڵن مندالەکانیان لێیان بدەن, مندالەکانیان لەهەستکردن بە کەموکوڕی و دڵەڕاوکی دەربازدەبن. هەروەها ئەم قەدەغەکردنە بۆ درێژەدان بەسۆزو خۆشەویستی بەرانبەر بەمندالان زۆر پێویستە ,دایکێك دەستی خۆی بەرەو مندالەکەی خۆی درێژکرد کە دەیویست لەقاچەکانی بدات و پێیگوت:

(دەتوانیت کەمێك لەدەستم بدەیت, بەلام مافی ئەوەت نییە ئازارم پێبگەیەنیت)

زۆر بەجێیە کە یەکسەر بەدایکێکی وا پێشان بدرێت کە: (خانم!ئەوەندە سست مەبە, ئەگەر تۆ لەویدەیت چەندین جار زیانی کەمترە لەوەی کە ئەو لە تۆ بدات), دەبێت لەم جۆرە بارانەدا دایك یەکسەر ڕێگا بەمندالەکەی نەدات وئاوا فەرمانی پێبدات: (دەست لەم ڕەفتارانەت هەلگرە !تۆ بەهیچ شێوەیەك مافی ئەوەت نییە لەمن بدەیت), یان (هەرکاتێك لەمن تووڕە بوویت دەتوانیت لەلای من باسی راوبۆ چوونی خۆت بکەیت!).

لەهیچ بارێکدا و بەهیچ شێوەیەك نابێ مۆڵەت بەمندالْ بدرێت لەرووی دایك و باوکیدا دەست بەرزبکاتەوە. دەبێ پەروەردەو فێرکردنی دروست لەسەر بنەمای رێزگرتنی هاوبەش و بەرابەری نێوان دایك و باوك و مندالەوە دابرێژرێت. بەبێ ئەوەی دایك و باوك چاو لە مافی رابەرایەتیی خۆیان بپۆشن. کاتێك دایکێك بە مندالەکەی دەلێت کە :(دەتوانیت کەمێك لێبدەیت وەلێ ئازار نەگەیەنیت), مندالْ والێدەکات کە شتێکی دەست نیشانکراو و زۆر دژوار تاقیبکاتەوە، بەو مانایەی هەولدەدات چۆنییەتیی قەدەغەکردنەکە تاقیبکاتەوە و جیاوازیی نێوان بەگاڵتە

لێدان و لێدانی بەڕاستی دەست نیشان بکات.

## لێدان لە سمتی منداڵ:

ئەگەر چی لێدان لە سمتی منداڵ بە کارێکی قێزەون و ناپەسند دادەنرێت، کەچی لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا تاکو ئێستاش یەکێکە لە بەکارهاتووترین هۆکاری باو بۆ ملپێکەچکردنی منداڵ.

زۆربەی جار دایک و باوک لەوکاتەدا پەنادەبەنە بەر ئەم دوو هۆکارە کە هۆکارەکانی وەک هەڕەشەو ئامۆژگاری بێبەرهەم بن. وەکو باوە ئەم هۆشداری و تەمبێکردنە بەبێ بڕیاری پێشینەیی لەمیانی تووڕەیی و لەو کاتەدا بەکاردێت کە جامی ئارامیی دایک و باوک لەسەری بڕژێت. ئێستاکەش زۆربەی دایک و باوکان سوود لەم هۆکارە وەردەگرن، چونکە تائەندازەیەک خرۆشان و هەڵچوونی تووڕەیی لەدڵی دایک و باوکدا کەم دەکاتەوەو بۆ ماوەیەکی کەم منداڵ ئارامدەکاتەوەو بەشێوەیەک زۆربەی دایک و باوکان دەڵێن: (کەمێك هەوا گۆڕکێ دەکەین). مادامەکێ لەهەندێك باردا لێدان تا ئەندازەیەك شوێنەواری یەکسەری هەیە، بۆچی زۆربەی کات ناڕەحەتی دەخاتە دڵمانەوە؟، بۆچی ئێمە هەمیشە بەرانبەر بە دەرەنجامی تەنبێکردن و هۆشداریی جەستەیی هەست بە گومان و دوودڵی دەکەین؟ وەکو باوە ئێمە لە بەکارهێنانی هێزو توندوتیژی ناڕەحەتین و بەردەوام بەخۆمان دەڵێین:(دەبێ بەبێ چەندوچۆن بۆرامکردنی منداڵ هۆکاری باشتر لە تەمبێکردن وهۆشداریی جەستەیی بوونی هەبێت).

کەی هۆشداری و تەمبێکردنە جەستەییەکان ، شوێنەوارێکی ناپەسندو نەخوازراو لە دەروونی منداڵدا بە جێدەهێڵن ، بەو مانایەی کە ڕێگاو شێوازە ناپەسندەکانی هۆشداری و تەنبێکردنی جەستەیی ئەوان فێردەکات و بانگەوازێکی ئاوایان بۆدەکات: (هەرکاتێك تووڕە بوویت دەست بوەشێنە!).

لەجیاتی ئەوەی لە پێناو ڕزگار بوون لە هەست و سۆزە دڕندانەکانی خۆمان بۆ دۆزینەوەی چەند ڕێگایەکی شارستانیتر هۆشی خۆمان بەکار بهێنین ،منداڵان فێری یاسای جەنگەڵ دەکەین. یەکێك لە ناشرینترین لایەنەکانی هۆشداری و تەنبێکردنی

جەستەیی ئەوەیە کە شوێنەوارێکی زۆر خراپ لە پەروەردەکردنی ویژدانیی منداڵدا بە جێدەهێڵێت. لێدان خواردن، زۆر زوو هەستی کەموکوڕی وگوناهکاریی منداڵ لادەبات. بەم رێگایە کاتێك سزای بە دڕەفتاریی خۆی وەرگرت بۆ دووبارە کردنەوەی رەفتارەکە لەهەموو روویەکەوە خۆی بەئازادو هەڵبژێر دەزانێت.
بەقسەی (سەلما فرێبێرگ SELMA FRAIBERG) منداڵان (حسێبێکی تایبەتکراو) بۆ بەدڕەوشتیی خۆیان دەکەنەوەو ئازادانە دەست بە شەڕ خوازی و بەدڕەفتاری دەکەن و هەریەکێك لەبارەکانی بەدڕەوشتیی خۆیان لە ستوونی (قەرزداری) خەڵکانی دیکە بەرانبەر بەخۆیان جێگیرو تۆماردەکەن ,تاکو بەشێوەیەکی هەفتانە یان مانگانە بەلێدان خواردن قەرزی خۆیان وەردەگرنەوەو هەموو کاتێك بە ئەنقەست پاڵ بە دایك و باوکیانەوە دەنێن تاکو دەست بە لێدانیان بکەن و بۆ ئەوەی هەقدەستی بەدڕەوشتییەکەیان لەسنووری باو تێنەپەڕێت و ,دایك و باوکیان قەرزەکەیان زوو بدەنەوە.دایك و باوکان لەم بارەیەوە دەڵێن:(هەندێك کات منداڵان خۆیان داوادەکەن لێیان بدرێت).
منداڵێك کە داواکاریی تەنبێکردن و هۆشداری دەبێت، بۆ زاڵبوون بەسەر هەستی گوناهکاری و تووڕەیی خۆیان پێویستیان بەکۆمەکی گەوران هەیەو نابێ وا خەیاڵبکرێت کە بەراستی خوازیاری لێدان خواردنن. لەم بارانەدا ئەرکی دایك و باوك ئەوەندە ئاسان نییە, هەندێك کات دەتوانرێت بەگفتوگۆکردنێکی ئاشکرا دەربارەی شەڕخوازی و هەستی خۆ بەکەمگریی منداڵان کەمبکرێتەوە. لە هەندێك باری دیکەدا دەبێت خواستەکانی منداڵ بەبێ رەخنەلێگرتن قەبوڵ بکرێت. لەکۆتاییدا دەبێت سنوورێك بۆکارو جووڵەو رەفتارەکانی منداڵ دابنرێت.
ئەوکاتە دەتوانن نیازمەندی و سۆزەکانی منداڵ بخەینە نێو رێرەوی دروست و بێ ئازارو سەلامەتتر. ئەو رێژەی کە بۆ دەربڕینی تووڕەیی وهەستی گوناهکاری رێگای باشتر لەبەر دەستی منداڵاندابێت و لەجیات ئەم رێگایانەش دایك و باوکیش بۆ دیاریکردنی ئازادی و رێگا پێدانی منداڵانیان چەندرێگایەکی باشتریان دۆزیەوە, بەبێگومان بەشێوەیەکی هەستپێکراو کەمتر پێویستیان بە تەمبێکردن و هۆشدارییە جەستەییەکان دەبێت.

# بەشی شەشەم
# یەك رۆژ لەژیانی منداڵ

- بەیانی باش.
- کاتەکانی پەلەیی.
- خواردنی بەرچایی: بەبێ وانەگوتنەوەی رەوشتی.
- جلوبەرگ پۆشین و: هەرا لەسەر بەستنی قەیتانی پێڵاو.
- چوون بۆ قوتابخانە.

- گەڕانەوە لە قوتابخانە.
- گەڕانەوەی باوك بۆ ماڵەوە.
- کاتی خەوتن.
- نابێت دایکان و باوکان بۆ چوونە دەر
ەوە مۆڵەت لە منداڵەکانیان وەربگرن.
- تەلەفزیۆنی رووت ومردوو.

لەم سەردەمەی ئێستادا دایکان وباوکان رۆڵی پاسەوانێکی توندوتیژ دەگێڕن و بەردەوام منداڵان لە هەنگاونان بەرەو هەرجۆرە گەمەو شادومانی و خۆشڕابواردن و سەرگەرمییەك بەدوور دەخەنەوەو لەبەرانبەریشدا هەر خواستێکی منداڵ بە(نە) وەڵامدەدەنەوە: نابێت پەنجە بمژرێت، نابێت دەست بۆ ئەندامی زاوزێ ببردرێت، نابێت پەنجە لە لووت وەربدرێت، و گەمەی پێبکرێت، نابێت بەدەنگی بەرز قسە بکرێت، نابێت بەدەنگی بڵند فن بکرێت و هتد...بەم شێوەیە مەدەنییەتی ئەمڕۆ تانەوپەڕی بەرانبەر منداڵان ساردو سڕو ستەمکەرە. لەجیاتی مەمکی نەرمی دایك ئێسکی ڕەقوتەقو مەمەی شیریان دەخەنە نێودەمەوە، لە جیات شوێنێکی گەرمو نەرمی نووستن کۆمەڵە پارچەیەکی کۆن و وسارد و سڕیان دەخەنە بەردەست و بەردەوامیش داوای بێبەش بوون و چاوپۆشینیان لێدەکەن. گومانی تێدا نییە کە هەرکاتێك بڕیار لەسەر ئەوەبێت منداڵ ببێتە تاکەکەسێکی کۆمەڵایەتی، حەز بکەن و حەز نەکەن دەبێت بەچەندین بێبەشی وسنوربەندکردنی پێویست رازیبن. بەڵام نابێت دایك و باوکان لە رۆلگێڕانی پاسەوانی شارستانی ڕێگای زێدەڕۆیی بگرنەبەر، چونکە لەم بارەدا دڵڕەنجان و رکابەرییەتی و گێرەشێوێنی لەدڵی منداڵانی خۆیاندا پەیدادەکەن.

## بەیانی باش:

بێدارکردنەوەی ئەو منداڵەی کە دەبێت هەر لەگەڵ سپێدەوە بچێتە قوتابخانە نابێت تەنیا بخرێتە سەر شانی دایك. منداڵ لە بەرانبەر ئەو دایکەی کە خەوی لێحەرام

دەكات و خەونەكانی لیٚ تێكو پێكدەدات هەست بەدڵشكان و ڕەنجان دەكات. ئەو لە بەرانبەر ئەو دایكە ترسێكی زۆری هەیە كە وەكو (ئەجەل)ی هەڵواسراو دێتە ژوورەكەی و پەتووەكەی لەسەر لادەدات و فڕێی دەداتە كەنارێك و بەشێوەیەكی فەرماندەرانە فەرمان دەدات :(هەڵسە!درەنگە). لەلای منداڵان بێداربوونەوە بە دەنگی كاتژمێرێكی زەنگدار بەچەندین جار لەدەنگە ئاگاداركەرەوەكەی دایكی باشترە.

(ئیڤۆن YVOUNE) ی (٨) ساڵە بەیانیان بەزەحمەت لە خەو هەڵدەستا. هەموو سپێدەیەك هەوڵی دەدا چەند دەقەیەك زیاتر لەناو جێگای نووستن بمێنێتەوە. دایكی ماوەیەك بە میهرەبانی وماوەیەك بەتوندوتیژی هەوڵی دەدا لەو خووە ڕزگاری بكات, وەلیٚ هەرچەند زیاتر هەوڵی دەدا كەمتر بەمەست دەگەیشت. (ئیڤۆن) وەكو جاران درێژەی بەخووەكەی خۆی دەداو، بەزەحمەت لەسەر جێگای نووستن بڵند دەبۆوەو لەكاتی خواردنی بەرچاییدا رووترش بوو و بەردەوام درەنگ دەگەیشتە قوتابخانەو, گفتوگۆی رۆژانەی دایكی دەربارەی ئەم مەسەلەیە بۆ هەردووكیان ماندووكەرو ئازاربەخشبوو. لە پڕ ئەم مەسەلەیە بەشێوەیەكی سەرسوڕهێنەر چارەسەر بوو كاتێك ئیڤۆن وەكو دیاری كاتژمێرێكی زەنگداری كارەبایی لەدایكی وەرگرتوو هەگبەی كردەوەو یاداشتێكی تێدابوو كە ئەمە ناوەڕۆكەكەی بوو:(پێشكەش بە (ئیڤۆن)ی ئەزیزم كە حەزناكات بەیانیان خەڵكانی دیكە لەخەو بێداری بكەنەوە.. ئێستا دەتوانێت بەخۆی و بە ئارەزووی خۆی هەركاتێك بیەوێت بێداربێتەوە. دایكی قوربانی بێت.) (ئیڤۆن) لەسەر سوڕماندا مایەوەو بەرانبەر ئەم داهێنانەی دایكی زۆر خۆشحاڵ بوو و لێی پرسی:(چۆنت زانی كە من حەزناكەم خەڵكانی دیكە بێدارم بكەنەوە؟)

دایكی زەردە خەنەیەكی كردوو گوتی:(وام پێشبینی كرد!)

بۆسبەی بەیانی كاتێك زەنگی كاتژمێرەكە دەنگی دایەوە دایكی ئیڤۆن ئاوایگوت :(ئەزیزم. هێشتا زۆر زووە بۆچەند دەقیقەیەكی دیكە ناخەویت؟) (ئیڤۆن) لە نێو شوێنی نووستنەكە هاتە دەرەوەو ئاوایگوت:(نەخێر بۆ دەوامی قوتابخانە درەنگدادێت.) .نابێت ئەو منداڵە بە تەنبەلٚ لەقەڵەم بدرێت كە ناتوانێت بە ئاسانی

لە خەو بێدار بێتەوە. هەروها نابێت ئەو مندالەش بە سماقفرۆش بانگبکرێت کە لەکاتی بێدار بوونەوەدا دەمبەخەندەو شادنییە. هەروەها نابێت ئەو مندالەی کە سپێدان چاپووك و بەجمووجۆڵ نییە ببێتە جێگای گاڵتە پێکردن و تانەو تەشەر. لە جیات ئەوەی دایك و باوك گفتوگۆ و بێزبازی بکەن, باشترە مۆڵەتیان پێبدەن دە دەقیقە زیاتر سوود لە خەوی شیرینی سپێدە و خەونەکانی خەو و بێداری وەربگرن، بۆ گەیشتن بەم مەبەستەش ئەوەندە بەسە زەنگی کاتژمێرەکە چەند دەقیقەیەك زووتر لەکاتی بێدار بوونەوەی منداڵ دەنگی لێدەربێت. لەجیات ئەوەی راوبۆچوونەکانی ئێمە دەربارەی سەلامەتیی منداڵ تووڕەیی و رەنجان و نیگەرانی لە دەروونی منداڵدا دروست بکات,دەبێت لە گیانی ئەودا شوێنەواری ئارامیە خشوو جمووجۆڵ دروستکەری هەبێت:

(دەڵێی ئەمڕۆ دژوارە بێدار بیتەوە !) یان (درێژبوون لە نێو جێگای نووستن و خەون بینین زۆر بەلەزەتە !), یان (دەتوانیت پێنج دەقیقەی دیکە بخەویت). ئەم جۆرە قسانە سپێدە پڕ لە جموجۆڵ دەکات و دەبێتە هۆی فەراهەمکردنی ژینگەیەکی گەرموگوڕی پڕ لە خۆشەویستی. بە پێچەوانەوەشەوە، راوبۆچوون و قسەی هاوشێوەی ژێرەوە بەبێ گومان ژینگەیەکی ساردوسڕی لافاوی دروست دەکات: (هەڵسەوە تەنبەڵی بێسوود) ,یان (مافی ئەوەت نییە یەك دەقیقەی دیکە لە نێو جێگادا بمێنیتەوە !), یان (هەزار رەحمەت لەریپ ڤان وینگل(٢).) هەروەها قسەی وەك :(بۆچی تاکو ئێستا لە نێو جێگا هەڵنەستاویت؟) یان (ئایا تەنبەڵیت.), یان (ئایا هەست بەئازار دەکەیت؟), یان (سەرت دێشێت؟), یان (لێگەڕێ سەیری زمانت بکەم.) ئەم بیرانە دەخاتە زەینی منداڵەوە کە رێگای راکێشانی خۆشەویستی و سەرنجی دایك و باوك, بەرێگای خۆ نەخۆشخستنەوە دێتە دی . هەروەها لەوانەیە وا خەیاڵ بکات کە هەرکاتێك نکۆڵی لە بوونی ئەو هەموو تەنبەڵیە بکات,دایکێك دەرەنجێنێت کە رۆژانە سۆزو خۆشەویستیی بەسەردا دەبارێنێت وناچاری دەکات لەلای خزم وناسیاواندا دان بە تەنبەڵییەکەی ئەودا بنێت.

## کاتەکانی پەلەیی:

کاتێك منداڵێك پەلەی هەیە، تائەوپەڕی توانا هەوڵدەدات سوود لە کات وەربگرێت. زۆربەی جار کاتێك گەورەکان بۆ پەلەکردن فشار دەخەنە سەر منداڵ، بەرگری دەکات و لەجیات پەلەکردن بەهێواشی کاردەکات و هەوڵدەدات بەم ڕێگایە یاخیبوون و ناڕەزایی خۆی لە بەرانبەر فشاری ئەو کەسانە پێشان بدات کە بەبێ گفتوگۆکردن لەگەڵی، بەرنامەو کاتیان ڕێکخستووە.

دەبێت بۆ پەلەکردن لە منداڵ بەدەگمەن فشاربەکاربێت. لەجیاتیدا دەبێت هەلێکی تەواوی پێبدرێت و بۆ ئامادەبوون لە شوێنی دیاریکراودا ئازاد بکرێت. بۆنموونە دەتوانرێت بگوترێت:(پاسی قوتابخانە دەخولەکی دیکە دەگات.) یان (کاتژمێر شەشە سینەما دەست بە پەخشکردنی فلیم دەکات. ئێستا کاتژمێر پێنجە) یان (کاتژمێر هەشت نانی ئێوارە دەخۆین ئێستا کاتژمێر هەفتو نیوە.) یان (تا پانزە خولەکی دیکە میوانەکانت بەدیار دەکەون).

مەبەست لەم ئاگادارکردنەوانە ئەوەیە کە لە منداڵ بگەیەنین بەوپەڕی دڵنیاییەوە لە چاوەڕوانیی ئەوەدان تاکو لە شوێنەکەدا ئامادەبێت.

## خواردنی نانی بەیانی (بەرچایی): بەبێ وانە گوتنەوەی رەوشتی

کاتی بەرچایی خواردن کاتێکی گونجاو نییە تاکو فەلسەفەو ئوسوڵ و ڕەوشتی کۆمەڵایەتی تیادا فێری منداڵ بکرێت. بەڵکو تەنیا کاتێکی گونجاوە بۆ فەراهەم کردنی کەشوهەواو ژینگەیەکی پڕ لەم جموجۆڵ و خواردنی خۆراکێکی ئاسایی لە موبەقدا. بەشێوەیەکی گشتی نابێت لەکاتی خواردنی نانی بەیانیدا گفتوگۆی دووروودرێژ بکرێت، زۆربەی جار دایك و باوك و منداڵان خەواڵو و بێزەوقن ، ڕەنگە قسەیەکی بچووك ببێتە هۆی بەرپاکردنی شەڕوهەرایەکی گەورە.(بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی خواردن چاو بە بەشی چوارەمدا بخشێنەوە).

## پۆشینی جلوبەرگ و هەرا لەسەر بەستنی قەیتانی پێڵاو:

هەرلەگەڵ کازیوەی بەیاندا لە زۆربەی ماڵەکاندا لەسەر بەستانی قەیتانی پێڵاوو شێوەی پۆشینی جلوبەرگی منداڵ شەڕو هەرا بەرپایە. باوکێك دەیگوت: (کاتێك دەبینم کوڕەکەم قەیتانی پێڵاوەکانی نەبەستاوە، لەتووڕەییاندا ئیمان لە کەللەمدا نامێنێت، دەمەوێت بزانم ئایا باشترە ناچاری بکەم قەیتانی پێڵاوەکانی ببەستێت

یان لێگەڕێم بەهەمان کەمتەرخەمی وگوێپێنەدانەوە درێژە بەڕێگا بڕین بدات. با وایدابنێین کەلەم جۆرە پێڵاو لەپێکردنانەدا چێژ وەردەگرێت، بەڵام ئایا نابێت بۆ پەیداکردنی گیانی لێپرسراویەت لە دەروونی ئەودا بەلای کەمەوە وایلێبکەم قەیتانەکانی پێڵاوەکانی بەتوندو تۆڵی ببەستێت.) بەڕای من باشترە فێرکردنی لێپرسراویەتی بە بەستنی قەیتانی پێڵاو نەبەستینەوەو بۆ جڵەوگیرکردنی ڕوودانی دەمەقاڵێ و گفتوگۆ لەگەڵ منداڵ باشترە پێڵاوی بێقەیتانی بۆ بکڕین یانیش بەبێ درێژدادڕی و لێکدانەوە قەیتانەکانی پێڵاوەکانی بۆ ببەستن و دڵنیابین کە درەنگ یان زوو منداڵەکە فێری بەستانی قەیتانی پێڵاو دەبێت. نابێت منداڵان وەکو لۆردە کۆنەکانی ئینگلستان بچنە قوتابخانەو زۆر پابەندی پاك ڕاگرتنی جلوبەرگەکانیان بن. ئازادیی منداڵ بۆ ڕاکردن و بازدان و تۆپتۆپێن لە هەموو ڕوویەکەوە لەپێش پاکڕاگرتنی جلوبەرگەوەدێت.کاتێك منداڵێك بە جلوبەرگی پیسەوە لەقوتابخانە دەگەڕێتەوە, دەبێت دایکی ئاوای پێبڵێت:(دەڵێی ئەمڕۆ جموجۆڵێکی زۆرت هەبووە! ئەگەر حەزدەکەیت جلوبەرگت بگۆڕیت, جلوبەرگێکی پاك لەنێو دۆڵابدا ئامادەیە). هیچ سوودی نییە بەچاوی منداڵ دابدەینەوە کە چەندە شەپرێو و پیسە و ئێمە بەچ گیان دەرچوون ودەردەسەرییەك جلوبەرگی دەشۆین و ئوتووی دەکەین.

دەبێت بەخێوکارێکی واقعبین ئەوە بزانێت کە نابێت هەستی لێپرسراویەتی و خۆ بەپاك ڕاگریی منداڵ بخرێتە پێش گەمەو جموجۆڵەکانییەوە، بەپێچەوانەوە, دەبێ گشت دایك وباوکێك بەر لەهەموو شتێك ئەوە باش بزانن کە ناتوانرێ جلوبەرگی منداڵ بۆ ماوەیەکی دوورو ودرێژ بە پاکژی بمێنێتەوە, گوتنی ڕستەی: (دوو تاخم جلوبەرگی هەرزان بشۆ و لەبەرکە بۆ دەروونودروستیی منداڵ کاریگەرترە لەدوازدە وتاری زانایانە سەبارەت بە پاکو خاوێنی.

## چوون بۆ قوتابخانە:

ئەگەری ئەوە زۆر هەیە کە منداڵ هەر لە بەرە بەیانەوە بەهۆی پەلەیی و کەمی کاتەوە لە بیر بکات کتێب یان چاویلکەی یان سەبەتەی خۆراك یان جزدانی پارە لەگەڵ خۆی ببات. لەجیات ئەوەی بچینە سەر ئوانگەو وتار دەربارەی زیانەکانی

لەبیرچوون ونەبوونی گیانی لێپرسراوی بدەین، باشترە شتە لەبیرکراوەکەی بدەینەوە. بۆمنداڵ رستەی (وەرە چاوێلکەکەت هەڵگرە) سوودمەنترە لە رستەی: (بەحەزرەتم رۆژێك ببینم شتێك لەبیرنەکەیت)، رستەی (کیسەی خۆراکەکەت هەڵگرە)، زۆرباشترە لەرستەی: (ئەوەندە فەرامۆشکاری ئەگەر سەرت بەشانەکانتەوە نەبوایە ئەویشت لەبیر دەکرد). منداڵ لەبەرانبەر رستەی (وەرە ئەمە جزادانی پارەکەتە) زیاتر هەست بەرازیبوون دەکات نەك لەبەرانبەر رستەی تانەو تەشەرداری:(ئەگەر پارەت لەگەڵ خۆت نەدەبرد تاعەسرێ بە برسیەتی دەمایتەوە).

نابێت پێش رۆیشتنی منداڵ بۆ قوتابخانە وتارو وەعزی بۆ بدرێت. رستەی (رۆژباش!) بەچەندین جار لەرستەی :(ئینشاللا هیچ کەتنێکی دیکە ناکەیت) باشترە. رستەی: (کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆ دەمەوێت بتبینم)، بەچەندین جار لەرستەی (ئومێدوارم لەپاش تەواوبوونی وانە وەك سەگی پێسووتاو لەکۆڵانەکاندا نەسوڕێیتەوە!) باشترە.

## گەڕانەوە لە قوتابخانە:

کاتێك منداڵ لەقوتابخانە دەگەڕێتەوە زۆر بەجێیە بۆ پێشوازی لێکردنی، دایکی لە ماڵەوەبێت و لەجیات ئەوەی پرسیاری بێ سوودی وەك (قوتابخانە چۆن بوو؟) یان (ئەمڕۆ چ کارێکت کرد) لێبکات، کە بەگشتی منداڵ وەڵامی لێلێ وەك (خراپ نەبوو) و یان (هیچ)ی دەداتەوە، باشترە پرسیاری وابکات کە گرنگی پێدانی دایکەکە بەرانبەر ئەو رووداوە ناپەسند و ناڕەحەتییە گریمانەییانە بسەلمێنێت کە لەقوتابخانەدا بەسەری هاتووە ،وەك: (لەقیافەت رادیارە کە رۆژێکی دژوارت بەسەربردووە)، یان (مەرجت لەگەڵدا دەکەم کەهیچ سەبرو ئارامت نەبوو تا رۆژ بەکۆتا بگات)، یان (لە گەڕانەوەت بۆ ماڵەوە خۆشحاڵیت) .کاتێك منداڵ لەقوتابخانە دەگەڕێتەوەو دایك ناتوانێت بۆ پێشوازی لێکردن لەماڵەوە بمێنێتەوە. ئەوا زۆربەی دایکان و باوکان بۆیەتەو هێشتنەوەو مکومکردنی پەیوەندیی خۆیان و منداڵەکانیان سوودێکی تەواو لەپەیامی نووسراو وەردەگرن، لەبەر ئەوەی لەلای ئەوان ئاسانترە بە نووسین پەیوەندیی خۆشەویستی و گرنگیدانیان لە بەرامبەردا دەرببڕن.

ژمارەیەکی دیکەی دایك و باوکیش پەیامی خۆیان بەهۆی ریکۆردەرەوە تۆماردەکەن بەشێوەیەك منداڵ دەتوانێت دووبارە گوێی لە پەیامی دایك و باوکی بێتەوە. بەشێوەیەکی گشتی ئەم پەیامانە لەئاسان کردنەوەو پتەوکردنی پەیوەندیی نێوان دایك و باوك ومنداڵ دەرەنجامێکی پەسندو باشی هەیە.

## گەڕانەوەی باوك بۆماڵەوە:

کاتێك کە شەوانە باوك دەگەڕێتەوە ماڵەوە پێویستی بە ماوەیەکی وا هەیە بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو ئارامییە لە دەست چووەی بۆ بگەڕێتەوە کە بەهۆی گرفتەکانی دەوروبەری لەدەستی داوە. هەروەها ئەوماوە وەرچەرخێنەرە زەمینە بۆ باوکەکە خۆش دەکات کە بتوانێت بەگرفت و مەسەلەکانی ماڵەوەش ڕابگات. هەر لەگەڵ ئەوەی باوکەکە پێی خستە نێودەرگا نابێت بارانی سکاڵاو پێویستییە جۆراوجۆرەکانی بەسەردا ببارێنرێت. بەڵکو بەپێچەوانەوە نۆشکردنی شلەمەنییەکی ئاسایی، دوشێکی گەرم، خوێندنەوەی نامە خانەوادەییەکان, چاوخشاندن بەگۆڤارە تازەکان و بەتایبەت (خۆ دوور خستنەوە لەپرسیارکردنی جۆراو جۆرو لە باوکەکە) لە پەیداکردنی کەشوهەوایەکی ئارام و زیادکردنی خۆشخۆیی و نەرمی ودڵڕفێنی ژیانی خانەوادەیی کاریگەریی فراوانی هەیە. منداڵانیش هەر لەقۆناغی بچووکی تەمەنی خۆیانەوە فێردەبن کاتێك باوك هاتەوە ماڵەوە پێویستی بە ماوەیەکی کورتی ئارامی و حەسانەوە هەیە, نانخواردنی ئێوارە باشترین هەلە بۆ گفتوگۆی خانەوادەیی و بۆ هاندانی منداڵ بەرەوبیرکردنەوە. دەتوانرێت سوود لە سفرەی نانخواردنی ئێوارە وەربگیرێت. دەبێ دەربارەی شێوەی نانخواردنی منداڵ و چۆنیەتیی خۆراکەکە ئاماژەیەکی کورت بکرێت و بەپەیڕەوکردنی شێوازی کۆنی گفتوگۆ قسەو باس لەسەر شتە سەرنج ڕاکێشەکاندا بکرێت.

## کاتی خەوتن:

لەزۆربەی ماڵەکاندا، بەردەوام مەسەلەی خەواندنی منداڵان هۆی دروستکردنی شەڕو هەراو دەمەقاڵێی نێوان دایك و باوك و منداڵانە. منداڵان حەزدەکەن تاپێیان دەکرێت زیاتر بەبێداری بمێننەوە, لە کاتێکدا دایکان و باوکانیان سوورن لەسەر

ئەوەی کە منداڵانیان زووتر بخەون. دایکان لە تووڕەییان لەژێرلێوەوە پرتەوبۆڵە دەکەن و منداڵان بەهەزاران فرۆفێڵ هەوڵدەدەن لەدەستی دایکان و باوکانیان هەڵبێن و دەست بەگەمەو سەرگەرمی و رابواردن بکەن.

ئەو منداڵانەی کە دەچنە قوتابخانە, بۆ خەوتن پێویستیان بەیارمەتیی دایک و باوک هەیە, دەتوانرێت بە گفتوگۆیەکی خۆشەویستانە و نهێنی و پەنهان لەگەڵ منداڵان سوودێکی زۆر لەکاتی خۆ ئامادەکردن بۆ خەوتن وەربگیرێت. منداڵان لەم ساتانەی نێوان خەوو بێدریدا زۆر حەزدەکەن لەگەڵ دایك و باوکیاندابە (تەنیایی) کات بەسەرببەن. هەرکاتێك دایك و باوك بۆ گوێگرتن لەقسەکانی منداڵ سەبرو ئارامی پیشان بدەن، منداڵ بیرو ئارەزوو و ئومێدەواری و دڵترساوییەکەی خۆی لەلای ئەوان باس دەکات، ئەم پەیوەندییە نزیکە، شڵەژانی منداڵ لادەبات و خەوی ئاسایی و ئارام دەکات. هەندێك لەمنداڵانی گەورەتریش حەزدەکەن لەکاتی خەوتندا گفتوگۆ لەگەڵ دایکان و باوکانیاندا بکەن. دەبێت ئەو حەزەیان تێربکرێت و نابێت دایك و باوك لە هەمبەر قسەو راوبۆچوونە منداڵانییەکانی منداڵانیان گاڵتەیان پێبکەن. دەبێت بتوانرێت بۆ منداڵە گەورەترەکان کاتەکانی خەوتن بگۆڕدرێت. بەگشتی منداڵانی گەورەتر دەبێت کاتژمێر هەشت و یان (نۆو دە) بخەون ,دایك و باوك دەتوانن کاتە وردەکانی خەوی منداڵان لەنێوان ئەم کاتانە دیاریبکەن ,ئەگەر منداڵێك پێش ئەوەی بچێتە سەرپێخەف بڵێت: لەبیرم کرد بچمە گەرماو یان بڵێت پەرداخە شیرێکم دەوێت, نابێت ڕەخنەی لێبگیرێت. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هەر کاتێك منداڵ دووبارە داوا لەدایکی بکات لەگەڵیدا بچێتە ژووری خەوتن, دەبێت دایکی ڕاشکاوانە پێی پیشان بدات کە: (دەزانم حەزدەکەیت زیاتر لەگەڵت بمێنمەوە, وەلێ ئێستا کاتی گفتوگۆکردنی من وباوکتە.) دەبێت منداڵان هەمیشە ئاگایان لەوەبێت کە هەندێك پەیوەندی و کات و شوێنی وەها هەیە کە دەبێ ئەوان لەدەرەوەی بازنەی ئەم پەیوەندی و کات و شوێنانەدا بن.

## نابێت دایك و باوکان بۆ چوونە دەرەوە مۆڵەت لە منداڵەکانیان وەربگرن:

لە هەندێك ماڵدا منداڵان بەرە بەرە بڕیاری هاتووچۆی دایك و باوکی خۆیان دەکەوێتە دەست. چونکە هەرکاتێك دایك و باوك بیانەوێت شەوێك لەماڵەوە بچنە دەرێ ,دەبێت مۆڵەت لەمنداڵانی خۆیان وەربگرن. زۆربەی دایك و باوکان بەهۆی ناڕەزایی منداڵانیان لەچوونە سینەماو شانۆ بێبەشن.بەڵام دەبێت هەمیشە دایك و باوکان ئاگاداری ئەو خاڵەبن کەهیچ پێویستیان بەوە نییە مۆڵەتی چوونە دەرەوەو بەرنامەڕێژیی شێوەی ژیانی خۆیان بخەنە دەستی منداڵەکانیان. ئەگەر لەکاتی چوونە دەرەوەی دایك و باوك منداڵێکیان هەبێت لەدوویان بگریەت, نابێت سەرکۆنە بکرێت, وەلێ لەهەمان کاتدا ناشبێت بەپێی حەزو ئارەزووی منداڵەکە ڕەفتار بکرێت. ئێمە درك بەو حەزەی منداڵ دەکەین کە پێی خۆشە لەگەڵ ئێمە بێتەدەرێ نەك لەباوەشی دایەنێکدابێت, بەڵام هیچ پێویست ناکات بۆ چەند کاتژمێرێکی خۆشڕابواردن و هەواگۆڕی داوای مۆڵەتی لێبکەین: ئەگەر بینیمان لەکاتی چوونە دەرەوەمان منداڵێك لە دوامان دەگریەت, دەبێت بە ئاوازێکی مکوڕەوە ئاوای پێبڵێین: (دەزانین حەزدەکەیت ئەمشەو لەماڵەوە نەچینە دەرەوە. کاتێك ئێمە لەماڵەوەنین بەردەوام هەست بە تەنبەڵی دەکەیت و دەتەوێت ئێمە لەلات بین، وەلێ دەبێت ئەمشەو بچینە سینەما (یان بچینە سەردانی هاوڕێیان). یان لەڕستوراندا نانی ئێوارە بخۆین).

نابێت گرینگی بەناڕەزاییو هەڕەشەکانی منداڵ بدرێت, دەبێت وەڵامی ئێمە هەمیشە مکوڕو وەلێ خۆشەویستانە بێت: (حەزدەکەیت ئێمە لەگەڵ تۆدا بین, وەلێ بڕیارمانداوە شەوێ لەگەڵ هاوڕێیانمان لە دەرەوە کات بەسەر ببەین.

## تەلەفزیۆنی: ڕووت ومردوو:

گفتوگۆدەربارەی ڕۆژێك لە ژیانی منداڵ بەبێ ئاماژەکردن بەکاریگەریی تەلەفزیۆن لەسەر ڕەوشت و ڕەفتاری کامڵ نابێت. منداڵان حەز بەبینینی تەلەفزیۆن دەکەن و لەخوێندنەوەی کتێب و گوێگرتن لە مۆسیقا و گفتوگۆ بەباشتری دەزانن. منداڵان بۆ پێشکەشکاری بەرنامە تەلەفزیۆنییەکان بینەری زۆر پەرۆش و تامەزۆرن و, زۆر زوو دەچنە ژێر کاریگەریی سرووش و پەیامەکانیانەوەو باوەڕ بە پڕوپاگەندە بازرگانییەکانیش دەکەن و بە ئاسانییەکی سەرسوڕهێنەر فێری شیعری (کرچوکاڵ)

دەبن و بەردەوام دروشمە تەلەفزیۆنییەکان دووبارە دەکەنەوە. جگە لەمەش چاوەڕوانییەکی زۆریان لە بەرنامە تەلەفزیۆنییەکاندا نییەو ئەوەندە بە گرنگییەوە ناڕواننە لایەنە داهێنەری و هونەرییەکانی بەرنامەکانەوە ,هەمیشە حەزدەکەن سوارەتفەنگدارەکان ببینن ,بۆیە منداڵان چەندین کاتژمێرو هەندێك کات لەچەندین رۆژی بەدواییەکدا هاتوودا سەیری دیمەنەکانی کوشتن و هێرش بردنەکان دەکەن و یان گوێ لە شیعرە کرچوکاڵەکان و پڕوپاگەندە بازگانییەکان دەگرن.

دایکان و باوکان لەمەڕ تەلەفزیۆن دوو بڕوایان هەیە,لەرووییەکەوە دڵخۆشن کە تەلەفزیۆن منداڵان سەرقاڵ و ئارام دەکات، بەڵام دەربارەی ئەو زیانە نیگەرانن کە تەلەفزیۆن بەچاوو زەینی منداڵانی دەگەیەنێت. دەربارەی کاریگەریی و شوێنەواری تەلەفزیۆن لەسەرچاودا , شارەزایان دووپاتیدەکەنەوە کە تەماشاکردنی تەلەفزیۆن هیچ زیانێك بە چاو ناگەیەنێت. تەنانەت لەوبارانەی کە ماوەیەکی زۆریش درێژە بکێشێت. بەڵام ناتوانرێت دەربارەی شوێنەواری تەلەفزیۆن لەسەر کەسایەتیی منداڵان بەیەکجاری ڕاوبۆچوون دەربېڕدرێت. لەم بارەیەوە بڕوای پسپۆڕان دژ بەیەکەو. ئێستاش ئێمە ئاماژە بەچەند راو بۆچوونێك دەکەین:

١ـ تەلەفزیۆن سوود بەمنداڵان دەگەیەنێت لەبەر ئەوەی دیمەنەکانی (لێدان و کوتان) و دلێرییەکان منداڵان لەپاڵنەرو سۆزو هەڵچوونە دوژمنکارییەکان دەرباز دەکات.

٢ـ تەلەفزیۆن زیان بەمنداڵان دەگەیەنێت. ئەوان بەرەو شەڕخوازی و تووڕەیی و توندوتیژی دەبات و لەبەرانبەر ئازارە مرۆییەکاندا هەستی ئەوان کەم دەکاتەوە.

٣ـتەلەفزیۆن کاریگەریی بەسەمنداڵانەوە نییە,کەسایەتیی و بەها رەوشتیەکانیان بەدەست دایك و باوك و مامۆستایانەوە قاڵبڕێژدەبێت,نەك بەهۆی وێنەکانی سەر شاشەی تەلەفزیۆن.

بەڵام ئەم پسپۆڕانە دەربارەی خاڵێك کۆك و هاوبڕوان بەو مانایەی هەموویان دوو پاتیدەکەنەوە کە تەلەفزیۆن بەشی زۆری کاتەکانی منداڵ داگیر دەکات و، ئەوکاتەی منداڵان لە تەماشاکردنی تەلەفزیۆندا بەسەری دەبەن زۆر لەوکاتە زیاترە کە لەگەڵ دایکان و باوکانی خۆیان بەسەری دەبەن. ئەگەر بەرنامەی نمایشە هەوەسبزوێن و دیمەنەکانی شەڕو شەڕ خوازیی تەلەفزیۆن لایەنی سەرگەرمی و خۆشڕابواردنی هەبێت، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا نابێت ئەوە لەیاد بکرێت کە منداڵان

لە چالاکییە ئەرێنییەکانی دیکە بەدوور دەخاتەوە. لەهەندێك ماڵدا مۆڵەت بەمنداڵان دەدرێت لەپشووی کۆتایی هەفتەدا تەماشای تەلەفزیۆن بکەن, لە هەندێك ماڵی دیکەشدا منداڵان دەتوانن تەنیا هەندێك لەو بەرنامانە ببینن کە لەلایەن دایك و باوکیانەوە بەباش دەزانرێت و پەسند کراون. ئەوان بڕوایان وایە کەدەبێت تەلەفزیۆنیش وەکو دەرمان بەرێژەی دیاریکراو و لەکاتی گونجاودا سوودی لێوەربگیرێت.

ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەی ئەو دایك و باوکانە لەزێدەبووندایە کە هەستدەکەن نابێت هەڵبژاردنی بەرنامەکان بەتەنیا بخرێتە سەر شانی منداڵ، ئەوان لەو بڕوایەدان کە نابێت دیمەنەکانی مرۆڤکوژی و خراپەکاری، لەنێو ماڵەکانی خۆیاندا منداڵانیان بخەنە ژێرکاریگەرییە ناپەسندەکەی خۆیانەوە.دایك و باوکان مافیان هەیە کەمنداڵانی خۆیان لەبینینی دیمەنی هەوەسبزوێن و سێکسی و کوشتن و هێرش بەدووربخەنەوەو بیانپارێزن. تادەتوانرێت دەبێت منداڵان لەدیمەنی ترسێنەرو ئەوفلیمانە بەدووربخرێنەوە کە تیایاندا زۆر گۆیی و توندوتیژی و شەڕخوازی دەبێتە جێگای ستایش و مەدح و سەناوە.

# بەشی حەوتەم

# ئیرەیی

- سروشتی دەردناك.
- ڕووداوی ناپیرۆز.
- دەربڕینی ئیرەیی: لەڕێگای قسەکردن یان هاوشێوە جۆراو جۆرەکاندا.
- ئەو هەلومەرجانەی کە دەبنە هۆی بەهێزکردنی ئیرەیی.
- شەڕکردن لەگەڵ ئیرەییدا.

## سروشتی دەردناك:

ئیرەیی نێوان براکان پێشینەیەکی مێژوویی و داخداری هەیە. یەکەمین مرۆڤکوژی

که لەمێژووی دێریندا قسەی لەسەرکراوە, کوژرانی (هابیل)ە بەدەستی (قابیل)ی برای. هۆی ئەم خراپەکارییە چاودێریی کێبڕکی ئامێزی نێوان دووبرابوو. یەعقوب تەنیا بەهۆی جێهێشتنی ماڵی خۆی و ونبوونی لەکیشوەرێکی بێگانەدا توانی لەکوژران بەدەستی (عساو)ی برای رزگاربێت و کوڕانی یەعقوب لەدڵەوە ئەوەندە ئیرەییان بە یوسفی برابچکۆلەی خۆیان دەبرد تاکو زۆر بە توندی خستیانە نێو چاڵێکی مارو دواتریش ئەم حوکمەیان گۆڕی بە کۆیلایەتییەکی هەتاهەتایی و ئەویان فرۆشتە کاروانێك کە لە بیاباندا گوزەریاندەکرد.تەورات دەربارەی چۆنیەتی و ریشەی ئیرەیی چیدەڵێت؟ لەهەموو ئەم بارانەدا هەستی ئیرەیی پێبردن بەهۆی بە چاکترزانین و خۆشویستنی زیاتری یەکێك لە منداڵان لەنێو رێزی منداڵەکانی دیکە پەیدابووە: (قابیل) بۆیە براکەی خۆی کوشت چونکە خودا دیاریی (هابیل) ی قەبوڵکردو گرینگی بە دیارییەکەی ئەو نەدا. (عساو) بۆیە ئیرەیی بەبراکەی دەبرد، چونکە دایکیان یەعقوبی پێ باشتر بوو لە عساو و باوکی ناچارکرد وازی لێبهێنێت، یوسفیش بەهۆی ئەو هەلومەرجانەوە بووە جێگای ئیرەیی پێبردنی براکانی, چونکە باوکی یوسفی لە گشت منداڵەکانی دیکەی خۆشتردەویست. وجلوبەرگێکی ڕەنگینی پێبەخشیبوو لە بەرانبەر کارە ناپەسندەکانی ئاگاداری نەدەکردەوە و تەنبێی نەدەکرد.

منداڵان حەزدەکەن گوێیان لەو چیرۆکانە بێت کە باس لە ئیرەیی وتۆڵەسەندنەوە دەکەن ,بابەتی ئەو چیرۆکانە سەرنجیان رادەکێشێت و چەند پاڵنەرێك دەخاتە دڵیانەوە و زیاتر لایەنگری ستەمکارن نەك ستەملێکراو.

## ڕووداوی شووم

منداڵان بە پێچەوانەی دایکان و باو کانیانەوە دەربارەی بوونی ئیرەیی لە خانەوادەدا هیچ جۆرە دوودڵییەکیان نییە. ئەوان زۆر زوو لەمانای ئیرەیی دەگەن و دەربارەی چۆنیەتیی مامەڵەکردن لەگەڵ ئیرەیی زانیارییان هەیە. بەبێ ئاوڕدانەوە لەچۆنییەتی ئامادەیی زەینیی منداڵ بۆ قەبوڵکردنی (زراسکێك)[1], دەبێت بە باشی ئەوە بزانن کە لەدایکبوونی خوشکێك یان برایەکی تازە لەلای گشت منداڵاندا

هەستی ئیرەیی و غەمباری پەیدادەکات. هیچ ئافرەتێك ئامادە نییە کە ماڵ و ژیانی خۆی لەگەڵ دوژمنەری مێردەکەی دابەش بکات. هیچ خانمێکی ماڵەوە ناتوانێت خۆی بە هاوشانی خزمەتکاری ماڵەوەی بزانێت, بەم شێوەیە هەمیشە ئیرەیی و رکابەری بە بەشێك لە ژیان دەژمێردرێت. خۆپاراستن و سەرگەردان مانەوە لەپەیدا بوونی ئیرەیی لەنەزانینیەکی زیانبەخش و ترسناك سەرچاوە دەگرێت. لە دایکبوونی منداڵی دووەم لەژیانی منداڵی گەورەتردا یەکەمین بەشی پەیدابوونی پەرێشانی و قەیرانی کتوپرە، لەبەر ئەوەی بەهۆی ئەم پێشهاتە کتوپڕەوە ڕێرەوی ژیانی منداڵە گەورەکە دەگۆڕێت و بۆ دۆزینەوەی ئاراستەی ژیانی و دیاریکردنی شێوازی نوێ پێویستی بە یارمەتیی دایك و باوکە، بۆیە لەجیاتی ئەوەی تەنیا بە پێشاندانی خۆشەویستی و دڵدانەوەی دەست هەڵبگرین, دەبێت زانیاری دەربارەی چۆنییەتیی هەستە راستەقینەکانی پەیدابکەین. لەوکاتەی هەواڵی لەدایکبوونی زراسکێك بەمنداڵێك رادەگەیەنرێت دەبێ لە روونکردنەوەی دووروودرێژ و پێشبینیی ساختە و قەڵپ بە دووربکەوینەوەو خۆمان لەقسەو رادەربڕینی وەك ئەمەی خوارەوە بپارێزین:(ئەوەندەم تۆ خۆشدەوێت, ئەوەندە چاك وژیکەڵەیت بۆیە من و باوکت بڕیارمان دا منداڵێکی وەکو تۆمان هەبێت. تۆ ئەم منداڵە تازەیەت خۆشدەوێت. لە هەمان کاتدا منداڵی تۆشە, شانازی پێدەکەیت و لەهەمان کاتدا هاوگەمەیەکی چاکت بۆ پەیدا بووە.)

ئەم قسەو روونکردنەوەیە نەراستەو نە بڕواپێهێنەریشە, لەبەرئەوە لەوانەیە بەپێچەوانەی پێشبینیی و چاوەڕوانیی دایك و باوك منداڵ ئەم ئەنجامە ماقوڵترەی خوارەوەی لەلا گەڵاڵە بێت: (ئەگەر بەڕاستی منیان خۆشبویستبایە منداڵێکی دیکەیان نەدەهێنایە سەر دونیا. دیارە دڵیان بەمن خۆش نییە بۆیە بڕیاریان داوە من بەمۆدیلێکی تازە بگۆڕنەوە.)

منداڵ بەزەحمەت ئامادە دەبێت سۆز و خۆشەویستیی دایکانەی دایکی لەگەڵ یەکێکی دیکەدا دابەش بکات.بە پێی تێگەیشتن وئەزموونی منداڵ ، دابەشکردن واتا قەناعەتکردن بەکەمتر, ئەم دابەشکردنی سۆز و خۆشەویستییە وەکو دابەشکردنی سێوێك یان قومە شەربەتێکە لەگەڵ یەکێکی دیکەدا.

دابەشکردنی سۆزو خۆشەویستی دایك لەگەڵ برا یان خوشکی نویّ خۆی لەخۆیدا بەئەندازەیەکی تەواو شڵەژان و پەرێشانی دروست دەکات. بۆیە ئەگەر دایکوباوك وا پێشبینی بکەن کە منداڵ دڵی بە پەیدابوونی منداڵی نویّ خۆشدەبێت, هەڵەیەکی گەورە دەکەن,چونکە مەسەلەی پەیدابوونی منداڵێکی دیکە لە دەرەوەی تێگەیشتن ولۆژیکی منداڵەوەیە. لەبەر ئەوە, کە بەرە بەرە قۆناغی سکپڕیی دایك بەرەو پێشتر دەڕوات, بەدحاڵیبوونی منداڵەکە توندتر دەبێت. ئەو دەبینێت گەرچی منداڵەکە هێشتا نەهاتۆتە سەر دونیاوە، کەچی بەشی زۆری کاتەکانی دایکی داگیر دەکات و دایکی کەمتر لە جاران گرینگی پێدەدات و زۆربەی جاریش دایکی پاڵکەوتوو و تەنبەڵە و یان هەست بە ماندووییەتی دەکات و دەیەوێت بحەسێتەوە، تەنانەت ئیدی ئەو ناتوانێت لەلای داوێنی دایکیشی دابنیشێت چونکە لەژێرەوەدا هەراسانکارو زەحمەتبەخشێك خۆی حەشارداوە, وەلێ ئاشکراکردنی ئەوە لەلای منداڵ زۆر ئاسانە.

## ئاساندنی هەراسانکاری نویّ

دەتوانرێت لەدایکبوونی منداڵی نویّ بەبیّ ئارەزوومەندکردنی منداڵ و (زاروزارپێکردن) بە منداڵ رابگەیەنرێت. بۆ نموونە تەنیا ئەوەندە بەسە ئاوای پێبڵێین: (بۆ خێزانی ئێمە منداڵێکی تازە زیاد دەبێت.) بەچاوپۆشی کردن لەکاردانەوەی خێرای منداڵ، ئێمە دەزانین کە لەدوای ئاگاداربوون لەو هەواڵە کۆمەڵێك پرسیارو دڵەڕاوکێی پاشوەگەڕ دڵی دادەگرێت. خۆشبەختانە ئێمە وەکو دایك و باوك دەتوانین یارمەتییەکی کاریگەری منداڵ بدەین لەبڕینی ئەم قۆناغە قەیرانی و وەرچەخێنەرە ناخۆشانەی کەوا بەسەری دادێت.

هیچ شتێك ناتوانێت ئەم راستییە بگۆڕێت کە لەدایکبوونی منداڵێکی تازە، هەڕەشەیەکە لەئاسایشی منداڵی پێشوو. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئاستی کاریگەریی ئەم پێشهاتە لەگۆڕینی رەوشت و رەفتاری منداڵ وابەستەییەکی تەواوی بەکارزانی و تێگەیشتنی ئێمەوە هەیە. بۆنموونە ئەم نموونەیەی خوارەوە کەلەپەڕاوی یادگاری (ڤیرجینیائێکسلین) (VIRGINIAM.AXLINE)

دەرهاتووە, یەکێکە لە زیانبەخشترین نموونەکانی ناساندنی زراسك بە منداڵەکەی پێشوو: (کاتێك کە جۆن هاتە سەر دونیا، باوکم منی بردە لای تاکو بەمنی پیشان بدات. ئێستاش کە ئێستایە رووخسارە سوورەکەی منداڵەکەم لەیادە کە لە باوەشی دایکم دابوو ,ئێستاش قسەکانی باوکم لە گوێمدا دەنگدداتەوە کە دەیگوت: (دەبێ ئێستا زیاتر و زیاتر باش و خۆشرەوشت بیت لەبەر ئەوەی ئێمە بووینە خاوەنی منداڵێکی دیکە, ئیدی تۆ تاقانەی دایە و بابەنیت ولەمرۆ بەدواوە بوویتە خاوەنی برا لەو ماڵەی کەپێشان منداڵێکی تێدابوو ئێستا دوومنداڵی تێدایە) وا خەیاڵدەکەم لەو رۆژەوە بەدواوە سەرتاپای ژیانی من لەپێناو ئەوە تەرخانکرا کە بە هەر نرخێك بێت براکەم بخەمە ژێر تیشکەوەو ژیانی لێبکەمە دۆزەخ).

بەپێچەوانەوە,ئەم نموونەیەی ژێرەوە نموونەیەکی ئاقڵانەی (ناساندنی) زراسکە بەمنداڵە گەورەترەکە.

کاتێك کە (ڤێرجینیا) (VIRGINIA) لەتەمەنی پێنج ساڵیدا زانی دایکی سکپڕە. لەخۆشییان دەستی بە (هەڵبەزو دابەزکردبوو) بیروڕایەکانی خۆی دەربارەی ژیان لەگەڵ برای ئایندە، لە دیمەنێکی جوانی پڕ لە خۆرو گوڵ وێنە کێشا. بەڵام دایکی ئەم رایە تاك لایەنەی ڤێرجینیای دەربارەی ژیانی گریمانەیی نوێ ستایش نەکردوو منداڵەکەشی بۆ ئەم جۆرە ژیانە ئارەزوومەند نەکرد ,بەڵکو بەلە بەرچاو گرتنێکی هاوڕێیانەوە, راستییەکەی بۆ منداڵەکە روونکردەوەو پێیگوت: (هەندێك کات بەپێکەنینت دەخات، وەلێ هەندێ کاتیش هەراسانت دەکات. هەندێك جار دەگریەت و ئیمان لەکەللەی هیچماندا ناهێڵێت, پێخەفە تەڕو کۆنەکەی خۆی پیس دەکات و هەندێك جاریش بۆنی ناخۆش دەردەکات و دەبێت دایە بیشوات و، خواردنی بداتێ و چاودێریی بکات. لەوانەیە هەست بکەیت کەوازیان لەتۆ هێناوەو تۆیان پشتگوێ خستووە, ئەگەری ئەوەش هەیە ئیرەیی پێببەیتو تەنانەت دوور نییە ئاوا بەخۆت بڵێیت:(ئیدی دایە منی خۆشناوێت بەڵکو ئێستا سۆزوخۆشەویستی دەبەخشێتە منداڵە تازەکە) ,هەرکاتێك ئەم هەستە باڵی بەسەردا کێشایت,بەدڵنیاییەوە وەرە لای من و هەست و سۆزی خۆت بۆ من باس بکە، تاکو زیاتر خۆشەویستیت پێببەخشم, بەم شێوەیە نیگەرانیت نامینێت و بڕوای تەواو وەدەست دەهێنێت کە هەمیشەو لە هەموو

*بارێکدا تۆم خۆشدەوێت). هەندێك دایك و باوك لەبەکارهێنانی ئەم جۆرە قسانە سوودڵن و دەترسن (بیری ترسناك) لەزەینی منداڵدا جێگیر بکەن.* بەڵام ئەم دایك و باوکانە دەبێت بزانن کە ئەم بیرانە بۆ منداڵ تازە نین و بەبێ گومان قسەکانمان سوود بە حاڵیان دەگەیەنن, چونکە لەراستیدا رەنگدانەوەیەکی هەستەکانی ئەوانەو منالآن لە هەستی خۆ بەکەمگری دەپارێزێت و بۆ پەیوەندی و هۆگری خۆشەویستیی قووڵ هانیان دەدات.راستە منداڵ لەکاتی لەدایکبوونی زارسکدا هەست بە تووڕەیی و غەم و ئازارو رەنجان دەکات، بۆیە باشترە بەدەنگێکی بەرز نارەحەتییەکانی خۆی رابگەیەنێت، نەك لەناوەوەی خۆیدا بیشارێتەوە چونکە لەم بارەدا زیانێکی گەورە بەخۆی و دایك و باوکی دەگەیەنێت.

## دەربڕینی ئیرەیی؛ لەرێگای قسەکردن یان هاوشێوە جۆراو جۆرەکاندا

کاتێك منداڵآن هەستی ئیرەیی لەناوەوەی خۆیاندا دەشارنەوەو ئاشکرای ناکەن, شوێنەواری ئەم ئیرەییە لەشێوەی وێنەی گۆڕاودا لەبەد رەوشتی و بەدڕەفتاریی ئەوانەوە بەدیار دەکەوێت. چونکێ کاتێك منداڵێك لە دڵەوە بەرانبەر براکەی هەست بە رەنجان و غەم و ناخۆشی دەکات، وەلێ لە پێشاندانی هەستی خۆی قەدەغە کراوە، لەوانەیە خەون بەوەوە ببینێت کە براکەی لەپەنجەرەی نهۆمی دەیەمەوە خستۆتە خوارەوە، رەنگە لەبینینی ئەم خەونە ئەوەندە بتۆقێت کە بە قیژەو هاوارەوە لە خەو راپەڕێو تەنانەت لەوانەیە بەرەو پێخەفی براکەی رابکات تاکو دڵنیایی پەیدابکات کە ئایا هەنووکە زیندووە یان نا. لەوانەیە ئەو لە زیندوو بوونی براکەی ئەوەندە نوقمی هەڵچوونی شادیهێن و شادومانی ببێت کە دایك و باوکی لەبەرانبەر ئەم هەستی ئارامی و پەرۆشی و خۆشەویستییە بێ سنوورەی منداڵەکە لە بەرانبەر براکەی بەهەڵەدا بچن، مۆتەکە لە دەروونی منداڵآدا بریتییە لەوێنەی ئەو ترس و ئێش و ئازارو ناخۆشییانەی کە ناوێرێت بەزمان باسیان بکات, لەبەر ئەوە دەبێت هەمیشە هەوڵ بدرێت لەجیاتی ئەوەی منداڵآن گرفتاری مۆتەکەبن تادەکرێت رێگایان بۆخۆشبکرێت ئیرەیی و تووڕەیی و رقی خۆیان بەدەم باس بکەن.

(وارن) (WARRENN)ی (٥) ساڵە پاش لە دایکبوونی خوشکی, بەردەوام

تووشی جۆرەها هێرشی تەنگە نەفەسیی کتوپڕ دەبوو, دایکو باوکی وایان بەخەیاڵدا دەهات کە (وارن)زیاد لە ئەندازە خوشکەکەی خۆشدەوێت و بە هەمان شێوەش هەرگیز بە زەینیاندا نەدەهات کە لەوانەیە ئەم نەخۆشییە کتوپڕە پەیوەندی بە لە دایکبوونی زراسکەکەوە هەبێت. بردیانە لای پزیشك و بەناچاری رەوانەی نەخۆشخانەی نەخۆشییە دەروونییەکانیان کرد تاکو لەوێ لەجیات هێرشەکانی تەنگەنەفەسی بەقسەکردن رێگای دەربڕینی ئیرەیی خۆی فێربێت. هەندێك منداڵ لەجیاتی ئەوەی ئیرەیی خۆیان بە قسە دەربڕن بەشێوەی کۆخەو زیپکەی سەرپێست و هەستیاریی پێست دەردەبڕن.هەندێکی دیکە پێخەف تەڕدەکەن و بەم رێگایە ئیرەیی خۆیان بە هۆی ئەندامێکی جیا لەئەندامی دەربڕین بە دیاردەخەن. هەندێك منداڵی دیکە لەجیاتی ئەوەی هەستەکانی خۆیان بەقسە دەربڕن قاپوقاچاغی ماڵەوە دەشکێنن. هەندێك منداڵی دیکە نینۆکیان دەجوون یان مووی لەشیان هەڵدەکێشن و بەم رێگایە پەردەیەك لەسەر ئەو ئیرەییەی خۆیان لادەدەن کە بەرانبەر خوشك و براکانی خۆیان هەیانە, باشترە هەموو ئەم منداڵانە هەستەکانی خۆیان بە قسە باس بکەن، نەك بەچەندرێگایەکی هاوشێوەو هاوتای قسەکردن هەستەکانیان پیشان بدەن، کلیلی دڵی منداڵان هەمیشە لەدەستی دایك و باوکانەو بەکەمێك چاودێریی و دەروونناسییەوە دەتوانن یارمەتیی کاریگەری منداڵەکانیان بدەن.

## روخسارە جۆراو جۆرەکانی ئیرەیی

بۆئەوەی دایکان و باوکان لەپەروەردەو فێرکردنی منداڵەکانیان رێگایەکی راست بگرنەبەر، دەبێت بە دڵنیاییەوە بزانن کە لە دڵ و دەروونی منداڵەکانیان هەستی ئیرەیی بوونی هەیە، وەکو بڵێی شوێنەواری ئەم هەستە ناکەوێتە بەرچاوو روخساری جۆراو جۆری هەیەو زۆربەی کاتەکان جلی خۆیان دەگۆڕن و دێنە بەرچاوان، چونکە بۆ نموونە لەوانەیە بەشێوەی ئیرەیی پێبردنی توندو یان بەشێوەی خۆدوور خستنەوە لە گشت پێشبڕکێ و، ناوبانگ خوازییەك و یان بە پێچەوانەوە لەشێوەی زەبوونی و گۆشەگیری و، یان بەشێوەی دەستبلاوی و یان

بەپێچەوانەوە بەشێوەی چاو برسییەتی و قرچۆکیی لە سنوور بەدەر بێتە بەرچاو.

دەتوانین بەئاشکرا بەرهەمە تاڵەکانی رکابەرییەتی ونێرەییە بێ چارەسەرەکان لەژیانی ئەو گەورانە دا ببینین کە لە دەورووبەری ئێمەدا دەژین, ئەم شوێنەوارە (پڕ لە داخ و کەسەرانە) لە رکابەرییەتی ئەو پیاوە دەبەنگەدا بەتەواوی دیارە کە لەکاتی لێخوڕیندا سوورە لەسەر ئەوەی بەپێش گشت ئوتومبێلەکانی دیکە بکەوێت، هەروەها لە کەسایەتیی ئەو مرۆڤە ناونیشانخوازە بەدیار دەکەوێت کە بەهیچ نرخێك ئامادە نییە لەگەمەیەکی تێنسدا بدۆڕێنێت, هەروەها لەو بازرگانەی کە بۆ شکست پێهێنانی رکابەرەکەی , ئامادەیە گیان وهەموو مۆڵك و ماڵی بەبادا بدات و, لەژیانی ئەو کەسانەش بە تەواوی روون و ئاشکرایە کە تەنانەت بەبێ بوونی هۆکارو وزەی پێویست بۆ سەلماندنی باشتری و گەورەتریی خۆیان لەسەر خەڵکانی دیکە خۆیان دەخەنە مەترسییەوە. لە هەمان کاتدا ئەم نیشانانە لەو پیاوانەشدا بەدیار دەکەون کە لە هاوبەشی کردن لەهەر جۆرە پێشبڕکێیەك خۆیان بە دوور دەخەنەوەو لەو پیاوەش بەدیار دەکەوێت کە پێش دەستپێکردنی شەڕێك خۆی بەژێر کەوتوو دەزانێت. لەو کەسەش بەدیار دەکەوێت کە تەنانەت بۆ وەرگرتنی مافە یاساییەکانی خۆشی ناچێتە پێشێ. بەم شێوەیە مەسەلەی رکابەرییەتی و ئێرەیی بێ چارەسەر زیاد لەو تەسەورەی بۆیدەکرێت زیان بەژیانی منداڵ دەگەیەنێت و هەندێك کات لە قاڵبرێژیی کەسایەتی و گۆڕین وەرچەرخاندن و سەراولێژکردنی خووی منداڵەکەدا شوێنەوارێکی بەرچاوی دەبێت.

* ریشەکانی ئێرەیی: ریشەی ئێرەیی، ئارەزووی منداڵە بۆ وەدەستهێنانی خۆشەویستیی دایك بەشێوەیەك کە ئەم خۆشەویستییە تەنیا بۆخۆی بێت و لەگەڵ کەسانی دیکە دابەشی نەکات و تایبەتمەندبێت بەخۆی. ئەم ئارەزووە ئەوەندە توندو بەهێزە کە رێگا بە هیچ رکابەرێك نادات لەگەڵی دابەش بکات بە تایبەت کاتێك براو خوشکانی پێیان دەخەنە سەر گۆڕەپانی ژیان، منداڵ بۆ داگیر کردن و تایبەتکردنی خۆشەویستیی دایك و باوکی، لەگەڵ ئەوان دەست بەرکابەرییەتی ونێرەیی دەکات، لەوانەیە ئەم پێشبڕکێیە بەپێی شێوازو رێگای مامەڵەکردنی دایك و باوك بەرلنبەر بە ئێرەیی ئاشکرا یان نەهێنی بێت، هەندێك دایك و باوك ئەوەندە لە

رکابەرییەتی و ئیرەیی منداڵەکانیان توڕەدەبن هەموو جۆرە شوێنەوارێکی ئاشکرا قەدەغە دەکەن و بەهۆیەوە هۆشداری بە منداڵ دەدەن و ئاگاداری دەکەنەوە. ژمارەیەکی دیکەی دایکان و باوکان بۆلە ناوبردنی هەرجۆرە هەست و پاڵنەرێکی ئیرەیی، تێدەکۆشن باوەڕ بە منداڵانی خۆیان بهێنن کە بەشێوەیەکی یەکسان جێگای سۆز وخۆشەویستیی ئەوانن لەبەر ئەوە هیچ هۆیەك بۆ بوونی ئیرەیی لەلای ئەوان پێویست نییە، ئەوان بەشێوەیەکی یەکسان و بەو پەڕی دادوەرییەوە هەموو جۆرە خەڵات و جلو بەرگ و ستایشکردنێك لەنێوان منداڵانی خۆیاندا دابەش دەکەن. بەڵام هیچ یەکێك لەم دووربینی و چارەئەندێشیانە شوێنەوارو کاریگەرییان لەکوژاندەوەی ئاگری ئیرەییدا نییە. هەروەها هۆشداری و ستایشکردنی یەکسان ناتوانێت ئارەزووی منداڵ بۆ تایبەت کردن و داگیرکردنی خۆشەویستی دایك و باوکی کەم بکاتەوە، لەوکات و شوێنەی کە ناتوانرێت ئەم ئارەزووە تێربکرێت، ناتوانرێت ئیرەیی لەدڵی منداڵدا بە تەواوی ریشەکێش بکرێت. ئەوهەموو خامۆشکردنەی ئاگری ئیرەیی منداڵان یان گلپەدارکردنی ئائەندازەیەکی زۆر پەیوەندیی بەشێوازو هەلومەرجی زانیاریی دایك و باوکەوە هەیە.

## ئەو هەلو مەرجانەی کەدەبنە هۆی بەهێزکردنی ئیرەیی:

ڕەنگە لە ژێر هەلومەرجی ئاساییدا، تەمەن و ڕەگەز ببێتە هۆی پەیداکردنی هەستی ئیرەیی نێوان منداڵانی خانەوادەیەك. برای گەورەتر جێگای ئیرەیی پێبردنە چونکە تایبەتمەندییەکی زیاترو مافێکی زیاتری هەیە و سەربەخۆییەکەی زۆرترە، منداڵی بچووك جێگای ئیرەیی پێبردنە چونکە زیاتر لەژێر چاودێری و پارێزگاریی دایك و باوکە. خوشك ئیرەیی بە براکەی دەبات چونکە کوڕەو ئازادییەکی زۆرتری هەیە. برا ئیرەیی بە خوشکەکەی دەبات چونکە بەرووکەش زیاتر جێگای ئاوڕلێدانەوەی تایبەتی دایك و باوکە.

ئەم ئیرەییە ئاساییە، بەلأم لەو کاتەدا بەرەو مەترسی دەڕوات کە دایك و باوك نەزانانە گرینگیی تایبەت بەتەمەن و ڕەگەز بدەن. کاتێك دایك و باوك منداڵێکی بێ توانای پاشکەوتوو لەمنداڵێکی شەش ساڵەی ساغ وبەهێز زیاتربخەنە نێوبازنەی خۆشەویستیی خۆیانەوە، بێگومان لە دڵی منداڵە شەش ساڵییەکەدا تۆی ئیرەیی دەچێنن. هەروەها ئەو منداڵەی بەهۆی هۆش و جوانی و توانا و بەهرەی مۆسیقی و نەریتزانیی کۆمەلأیەتیی خۆیەوە دەبێتە جێگای گرینگی پێدانێکی تایبەتی دایك و باوکی، ئاگری ئیرەیی لەدڵی خوشك و براکانی خۆی دادەگیرسێنێت، ئاساییە ئاوڕدانەوەو گرینگی پێدانی زیاتر بەمنداڵێك لەدڵی منداڵانی دیکە ئیرەیی پەیدا دەکات، وەلێ ستایشکردنی زێدەڕۆیانەی تایبەتمەندییەکی رەوشتی یان توانا و بەهرەیەکی تایبەتی یەکێك لەو منداڵانەیە کە ئاگری ئیرەیی لەدڵی برا و خوشکەکانیان گڵپە دارترو گەورەتر دەکات.

هەڵبەتە نابێت واخەیاڵ بکرێت کە دەبێ بەشێوەیەکی یەکسان رەفتار لەگەڵ منداڵانی گەورەترو بچووکتردا بکرێت. بەپێچەوانەوە دەبێت بۆ هەر تەمەنێك تایبەتمەندی و لێپرسراویەتییەك دابنرێت وئاساییە کەدەبێت منداڵی گەورەتر خەرجییەکی زیاتری رۆژانە وەربگرێت و، درەنگتر بخەوێت و، بۆ مانەوە لەدەرەوەی ماڵەوە ئازادییەکی زیاتری لەمنداڵە بچووکترە کەهەبێت، دەبێت ئەم تایبەتمەندی ومافانە بەو پەڕی خۆشەویستییەوە بۆ گشت منداڵان هەبێت و رابگەیەنرێت، بەشێوەیەك کە گشت منداڵان دڵنیابن لەوەی کە هەر لەگەڵ گەیشتن بە تەمەنێکی

دیاریکراو سوود لە تایبەتمەندی و مافەکانی ئەو تەمەنە وەردەگرن، ڕەنگە منداڵی بچووکتر ئیرەیی بەتایبەتمەندی و مافە بڕیار لەسەر دراوەکانی منداڵی گەورەتربیات، بۆ یارمەتیدانی منداڵ لە زاڵبوون بەسەر ئیرەیی خۆی نابێت دەربارەی هەقانییەتی ئەم تایبەتمەندی و مافانە دەست بەئامازەپێکردن و بەڵگەهێنانەوەیە بکەین. بەڵکو دەبێت تێبکۆشین درك بە هەست وسۆزەکانی منداڵ بکەین. بۆنموونە دەتوانرێت ئاوای پێبگوترێت: (تۆش حەزدەکەیت زیاتر بەبێداری بمێنیتەوە)یان(تۆش حەزدەکەیت گەورەتربیت) یان (تۆش حەزدەکەیت لەجیات ئەوەی تەمەنت شەش ساڵ بوایە نۆساڵ بوایت) یان (دەزانم کە حەزدەکەیت لەم کاتەزیاتر بەبێداری بمێنیتەوە وەلێ کاتی خەوتنت هاتووە). دایك و باوکی نەزان داوا لە هەندێ لە منداڵەکانیان دەکەن لەپێناو مافی منداڵانی دیکە فیداکاری بکەن و قوربانی بدەن، بەمەش هەستی ئیرەییان دەجولێنن بۆ نموونە:(منداڵەکە حەزدەکات لە پێخەفی تۆدا بخەوێت، تۆ دەتوانیت لەسەر قەنەفە بخەویت) یان (بەداخەوم! ئەمساڵ ناتوانم (SKI*)بۆ تۆ بکڕم. ئەوەی هەمانە دەبێ لەکڕینی جلوبەرگی کۆرپەکەی خەرج بکەین). مەترسییەکە لەوەدایە کەمنداڵ نەك هەرتەنها لەوشتە بێبەش دەکرێت کەمولکی خۆیەتی ، بەڵکو خۆشەویستیی دایك و باوکیش لەدەست بدات. لەبەرئەوەی کاتێك داوا لەمنداڵ دەکرێت بۆ سوودی منداڵەکانی دیکە فیداکاری بکات، دەبێ ئەم داواکارییە بەوپەڕی ئاگاداری و لێزانییەوە لەبەرچاوبگیرێت و تادەکرێت سۆزوخۆشەویستییان پێ نیشان بدرێت.

### ( خەبات بە دژی ئیرەیی ):

منداڵانی تەمەن بچووك زۆر ناشارەزایانە ئیرەیی خۆیان بەدیار دەخەن. بۆ نموونە دەپرسن (کەی زراسکەکە دەمرێت؟) یان (باشترە بگەڕێتەوە نەخۆشخانە)، یان (فڕێی بدەنە نێو تەنەکەی زبل)، ڕەنگە ئەو منداڵانەی روو هەڵماڵاوترن بەدژی هێرشبەرە نوێیەکە شەڕ رابگەیەنن... بەو مانایەی دوورنییە بەرێگای جۆراوجۆر تەنگی پێ هەڵبچنن بەم جۆرە لەئامێزی دەگرن و وەکو مارێکی ئەستوور دەستی تێوەر دێنن و هەتا بکرێ دەیگوشن و ئازاری دەدەن ،لەهەندێك باردا منداڵانی ئیرەیی پێبەر دەتوانن هێدمەی وا بەمنداڵەکان بگەیەنن کە هەرگیز چاکبوونەوەی بۆ

نەبێت.
ئێمە لەپایەی دایك و باوكدا ناتوانین مۆڵەت بەمندالّ بدەین ئازار بەبرای یان خوشكی بگەیەنێت. دەبێت مندالاّن لەهێرشە توندو زیانبەخشەكان بە دوور بخرێنەوە، جا ئەم هێرشانە جەستەیی بن یان زمانی، چونكە زیان بەهێرش بەرو هێرش بۆكراو دەگەیەنێت و هەردوو مندالّ پێویستیان بەچاودێری و سەرپەرشتیی ئێمە هەیە، هەروەها پێویستیان بەوەش هەیە كە بچینە نێو مەسەلەكەوە. خۆشبەختانە بۆ پاراستنی سەلامەتیی جەستەیی مندالّی بچوكتر پێویستمان بەوە نییە ئاسایشی سۆزیی مندالّی گەورەتر بخەینە ژێر هێرشەوە.
كاتێك مندالّێكی سێ ساڵە لە حالّی ئازار گەیاندن بە مندالّە تازە لەدایكبووەكە غافیلگیردەكرێت, دەبێت بێ درەنگ رێگا لەو هەنگاوەی بگیرێت و,پاشان بە ئاشكرا پالّنەری ئەم جووڵەو رەفتارەی بۆ راڤە بكەین! (تۆ مندالّەكەت خۆشناوێت!) یان (تۆ رقت لێی دەبێتەوە!) یان (پێم بڵێ تا چ ئاستێك رقت لێی دەبێتەوە دەمەوێت بزانم!).
ئینجا دەبێت بووكۆڵەیەكی گەورە بدرێتە دەست مندالّەكەو مۆڵەتی پێبدرێت جامی تووڕەیی خۆی بەسەر بووكۆڵەكەدا بەتالّ بكاتەوە، لەوانەیە ئەو لە سمتی مندالّەكە بدات و پەنجە لەناوچاوی رابكات و فڕێی بداتە سەر زەوی و داركاریی بكات. نابێت ئێمە بە مندالّ بڵێین چی بكات.
رۆلێ ئێمە ئەوەیە كە بەچاوێكی بێ لایەنانەوە بڕوانین و بە زمانێكی خۆشەویستانەوە وەلاّمی پرسیارەكانی بدەینەوە. نابێت هەست و سۆزو هێرشە توندەكانی, تووڕەمان بكات. هەست وسۆزەكانی راستگۆیانەو هێرشەكانی بێ ئازارن. ئاساییەكە زۆر زۆر باشترە تووڕەیی خۆی بەسەر شتێكی بێ گیاندا هەڵبڕێژێت , نەك بیخاتە سەر مندالّێكی گیاندار و خودی خۆشی.
دەبێت لێكدانەوەی ئێمە دەربارەی سۆزی مندالّەكە ئاسان وكورت بێت ,بۆ نموونە دەبێ بە مندالّەكە بڵێین: (بەمنت نیشاندلوە كە چەند تووڕەیت!) یان (ئێستا دایە زانی!) ویان (هەر كاتێك تووڕە بوویت وەرە بە من بڵێ!).
ئەم جۆرە مامەڵەیە بەچەندین جار باشترە لە هۆشداری و سست و سوككردن و,

لەئێرەیی منداڵ کەم دەکاتەوە. بەپێچەوانەشەوە شێواز و رێگای لەم جۆرەی خوارەوە دەرەنجامێکی پێچەوانەی هەیە:کاتێك دایکی (والتر WALTER) منداڵە چوارساڵییەکەی خۆی لەحاڵی راکێشانی برا بچووکەکەی غافلگیرکرد,وەکو بۆمب تەقیەوەو ئاوا بەسەریدا قیژاندی:(چیتە؟) دەتەوێت بیکوژیت؟ دەتەوێت برای خۆت بکوژیت؟ دەبێت بزانیت کە ڕەنگە بەدرێژایی ژیانی ئیفلیجی بکەیت؟ دەتەوێت کەم ئەندامی بکەیت و پەکی بخەیت؟ چەند جار بە تۆم گوتووە لە نێو شوێنی نووستن دەری مەهێنە! دەستی لێمەدە! ئیدی مافی ئەوەت نییە دەستی لێبدەیت.

لەوانەیە منداڵانی گەورەتریش لەم بارەدا تووشی ئێرەیی بن. دەتوانرێت ئاشکراو بێ پەردەتر قسەیان لەگەڵدا بکرێت: (زۆر ڕوونە کە کوڕەکەت خۆشناوێت) یان (دڵت زۆر ئەوە دەخوازێت کە بەتەنیا تۆم هەبوایە) یان (زۆر حەزدەکەیت کە تەنها تۆم خۆشبووێت!) یان (کاتێك دەبینی دەیلاوێنمەوە تووڕە دەبێت) یان (حەزدەکەیت هەمیشە لەگەڵ تۆدا بم) یان (ئەوەندە تووڕە بوویت کە فشارت دەخستە سەر منداڵەکە! من هەرگیز ناتوانم مۆڵەتت پێبدەم ئازاری پێبگەیەنیت وەلێ هەرکاتێك هەستت بە تووڕە بوون و ناڕەحەتی کرد دەتوانیت بە منی بڵێیت.) یان (کاتێك بەتەواوی هەست بە تەنیایی دەکەیت من کاتێکی زۆرم تایبەت دەکەم بە تۆ و ئەوکاتە هەست بەتەنیایی ناکەیت.)

## خۆشەویستی ـ بەیەکسانی یان جیاوازی ـ لەرووی چۆنییەتی یان بەقەد یەك

ئەو دایك وباوکانەی سوورن لەسەر ئەوەی بەرانبەر بەگشت منداڵەکانیان بەشێوەیەکی یەکسان خۆشەویستیی خۆیان بەمنداڵەکانیان پیشان بدەن, رۆژێك تێبینی ئەوە دەکەن کە نەك تەنیا بە مەبەست و مراز نەگەیشتوون بەڵکو لەگەڵ گشت منداڵانیان لەحاڵی رق و کینەو شەڕو شۆڕدان.هیچ شتێك وەکو پێوەرگرتن و ئەندازە گیری ئەنجامی ناپەسند و بێ هیواکاری نییە. کاتێك دایکێك لەترسی (پێناخۆش بوون) ناتوانێت لەنێو رێزی منداڵەکانیدا سێوێکی گەورەتر بداتە یەکێك

لەمنداڵەکان یان ماچێکی گەرمتر لەمنداڵێکی بکات ژیان تام و بۆی نابێت و هەرگیز توانای بەرگەگرتنی نامێنێت ,هەوڵی دایك بۆ دیاریکردن و ئەندازەگیری خۆشەویستی سەرەنجام گشت کەسێك ماندوو وتووڕە دەکات.منداڵان بەهیچ شێوەیەك خوازیاری دابەشکردنی یەکسانانەی خۆشەویستی نین. ئەوان ئارەزوو دەکەن هەریەکێك بۆ خۆی جێگای خۆشەویستی بێت و ئەوەندە خوازیاری دابەشکردنێکی یەکسانانەی سۆز و خۆشەویستی دایك و باوك نین، بەشێوەیەکی گشتی زیاتر پابەندی چۆنییەتی خۆشەویستیەکەن نەك یەکسانی خۆشەویستییەکە.

ئێمە هەموو منداڵانی خۆمانمان بەشێوەیەکی یەکسان خۆشناوێت و هیچ پێویستیش بەوەناکات بەیەك چاو تەماشای گشت منداڵەکانمان بکەین. ئێمە هەر یەکێك لە منداڵەکانی خۆمانمان بەشێوەیەکی جودایانە خۆشدەوێت و پێویست بەوەش ناکات ئەم شێوازو ڕێگایەی خۆمان بشارینەوە. هەر چەندە بۆ داپۆشینی ئەم جیاوازییە زیاتر تێبکۆشین، ڕکابەرییەتی و چاودێری و وردبینیی منداڵان بۆ ئاشکرا کردنی لایەنە دەستکردەکانی خۆشەویستی زیاتر دەبێت و بەم ڕێگایەش حەزبکەین و حەزنەکەین ,خۆمان لەبەرانبەر ئەو ترسەدا دەبینینەوە کە نەبادا بەخراپی لەخۆشەویستییەکەی ئێمە بگەن، بۆیە بەردەوام خۆمان لەباری بەرگری کردنێکی هەمیشەییدا دەبینینەوە.

نابێت ئێمە خۆمان بخەینە نێو داوی پەیامەکانی منداڵانەوە، هەروەها نابێت بۆ چۆنییەتیی خۆشەویستیمان بەرانبەر بە یەك بەیەکی منداڵان لە هەوڵی پەیداکردنی هۆیە سووککراوەکانیدا بین و هۆو بەڵگە بۆ بێگوناهی و نیازپاکیی خۆمان بهێنینەوەو هەوڵێکی فراوان بۆ سەلماندنی بێ بناغەیی تۆمەتەکانی منداڵانمان بدەین، لێبگەڕێ لەبەرانبەر دوودڵی و نیگەرانی بۆ پاکبوونەوە لە تۆمەت و بەرگریکردن لە داد خوازیی خۆمان سەنگەر بگرن و دەربارەی چاکی یان خراپیی بڕیارەکانمان بەبێ هۆ دەست بە ئاماژەو بەڵگە هێنانەوەی دوورودرێژ نەکەین ,بەتایبەت مۆڵەت بدەین بۆ سەلماندنی یەکسانیخوازیی خۆمان لەپشکدارییەتی یەکسان و دادوەرانەی خۆشەویستی بەرانبەر بەمنداڵان خۆمان بە

دووور بخەینەوە.

لێبگەڕێ بۆهەریەکێك لە منداڵانمان خۆشەویستییەکی تایبەتی لەدڵدا پەروەردە بکەین و چۆنییەتیی نزیکیی خۆمان لەگەڵ منداڵێکمان بەپەیوەندیمان لەگەڵ تەواوی منداڵانی دیکە بەراوردنەکەین.کاتێك چەندخولەکێك یان چەند کاتژمێرێك لەگەڵ یەکێك لە منداڵانمان بەسەر دەبەین, لێبگەڕێ شەشدانگی کاتمان تایبەت بێت بەو منداڵە. بەشێوەیەك کەلەو چەند کاتژمێرەدا منداڵەکە هەست بکات تاکە کوڕو تاکە کچی ئێمەیە. کاتێك لەگەڵ یەکێك لەمنداڵانمان دەچینە گەڕان و پیاسە, نابێت بیرمان نیگەرانی ئەوانی دیکە بێت و دەربارەی ئەوان قسە بکەین و یان دیارییان بۆ بکڕین. بەتایبەت لەم خولەك و کاتژمێرانەدا نابێت گرینگی وپەیوەندیی دایکایەتی یان باوکایەتی ئێمە دابەش بکرێت، بەڵکو دەبێت لەسەر ئەو منداڵە دا چڕبکرێتەوە کە لەتەك ئێمەوەیە.

# بەشی هەشتەم
## هەندێك سەرچاوەی نیگەرانی منداڵان

ــ نیگەرانیی سەرچاوە گرتوو لە ترسی بێ یارو یاوەری.
ـ نیگەرانیی سەرچاوەگرتوو لە کەمو کورتکاری.
ـ نیگەرانیی سەرچاوەگرتوو لە قەدەغەکردنی ئازادی.
ـ نیگەرانیی سەرچاوەگرتوو لەشەڕ وکێشەی نێوان دایك و باوك.
ـ نیگەرانیی سەرچاوەگرتوو لەدەستێوەردانی چالاکییە جەستەییەکان.
ـ ئەو نیگەرانییەی سەرچاوە لە ترسی مردن دەگرێت.

دایکان و باوکان لەو خاڵە ئاگادارن کە گشت منداڵێك کەم تا زۆر گرفتاری چەندین جۆرە دوو دڵی ودڵە خورپەن و نیگەرانن، بەڵام ئەوشتەی وەکو پێویست زانیارییان لەسەرنییە, سەرچاوەکانی ئەو نیگەرانیانەن. زۆربەی جار دایك و باوك لە خۆیان دەپرسن: (بۆچی منداڵەکەمان ئەوەندە دەترسێت؟ هیچ هۆیەك نییە کە بەم شێوەیە شڵەژاوبێت؟) باوکێك هەنگاوی گەورەتری ناو ڕۆژێك ئاوا بەسەر کوڕە ناڕەحەت و نیگەرانەکەی هاواری دەکرد:(دەست لەم هەست و بیرەت هەڵگرە, باش دەزانیت کە سەد لەسەد دڵخۆش و ئاسوودەیت و هیچ هۆیەك نییە تاکو بە خۆڕایی خۆت بشلەژێنیت). لەم بەشەدا زۆر بەجێیە هەندێك سەرچاوەی نیگەرانی ورێگای ڕووبەڕووبوونەوەی دڵەخورپەودڵەڕاوکێ و شڵەژانەکان ڕافە بکەین.

### نیگەرانیی سەرچاوە گرتوو لەترسی بێ یارو یاوەری. ¡

گەورەترین مایەی ترس و نیگەرانیی منداڵێك ئەوەیە کە دایك و باوکی بەجێیبهێڵن. بەشێوەیەك (جۆن شتاینبیك) (JOHNSTEIN BECK) لەکتێبی خۆرهەڵاتی بەهەشتدا (EAST OF EDEN)ئەوە پیشان دەدات کە: (گەورەترین مایەی ترس و تۆقینی منداڵێك ئەوەیە کە کەسێك خۆشینەوێت. دەرکردنی منداڵێك لەلایەن دایك وباوکیەوە دۆزەخییەو دەیهەژێنێت... دەرکردن رقو تووڕەیی پەیدادەکات، رقوتووڕەیش هەستی تۆڵەخوازی و خراپەکاری پەیدادەکات. ئەومنداڵەی ئارەزوو دەکات خۆشیانبوێت وکەسیش ئاوڕی لێنەداتەوە، پشیلە و شتی دیکە دەدڵتە بەرشەقو پێلەقەو ئەم گوناهەی خۆی پەنهان دەکات, منداڵێکی دیکە پارە دەدزێت

بەڵکو بەهۆی ئەم دزیەوە بتوانێت خۆشەویستیی دایك و باوکی بە دەستبهێنێت و سەرەنجیان رابکێشێت... منداڵی سێیەم بۆسەرنج راکێشان و بەدەستهێنانی سۆزو خۆشەویستی جیهان رام دەکات, بەم رێگایەش هەمیشە گوناهو تۆڵەسەندنەوە (یەك لەدوای یەك) روودەدات و رۆژبەرۆژ رووبەری کەموکورتکاری وخراپەکاری فراوانتر دەبێت. هەرگیز نابێت منداڵ بەبەجێهێشتن هەڕەشەی لێبکرێت. نە بەگاڵتەو نەلەکاتی رقوتووڕەییدا نابێت هۆشداری بدرێتە منداڵ کەوا بەرەڵلاً دەکرێت. زۆر روودەدات دایکێکی تووڕە لەسەر شەقام یان لە فرۆشگا کاتێك منداڵە بچووکەکەی لەگەڵی بەرێگادا ناڕوات, هاوار دەکات: (ئەگەر لەگەڵم نێیتەوە هەرلێرە بە جێت دەهێلم و دەڕۆم!) ئەم جۆرە قسەو ئاگادارکردنەوانە زیاتر و زیاتر دوودڵی و نیگەرانیی منداڵ توندتر دەکەن, نەوەك رۆژێك لەرۆژان بەجێی بهێلن و گڵپەکانی ئاگری خەیاڵی دەربارەی ئەوەی چۆن چۆنی لەجیهاندا ژیان بەسەر ببات رووبەرێکی فراوانتر دەگرێتەوە, هەر کاتێك منداڵێك لەجێگای خۆیدا نەجوولاوە زیاد لە ئەندازە نوقمی تەماشاکردنی شتێك بوو، لەجیات ئەوەی هەڕەشەی لێبکەین, باشترە دەستی بگرین و بەزۆر لەگەڵ خۆمانی ببەین.

هەندێك منداڵ هەرکاتێك لەکاتی گەڕانەوە لەقوتابخانەدا دایکیان لەماڵەوە نەبینن گرفتاری نیگەرانی دەبن و غەم و پەشێوی و ئاناراميی بەجێهێشتن کە هەمیشە لە دڵی ئەواندا خەوتووە, کتوپڕ بێدار دەبێتەوە, چونکیّ وەکو لەسەرەتاوە باسمان کرد، لەو هەلومەرجانەی کە دایك ناچار دەبێت ماڵەوە بەجێبهێڵێت زۆر بەجێیە لەیاداشتێکدا بنووسێت بۆ کویّ چووە. لە زۆربەی وڵاتە پێشکەوتووەکاندا دایکان بەهۆی ریکۆردەرێکی هەرزانەوە دەنگی خۆیان لەسەر کاسێتێك تۆماردەکەن و تیایدا بەدەنگێکی خۆشەویستانەو ئارامەوە هۆی چوونە دەرەوەیان بۆ منداڵەکە راڤەدەکەن و بەم رێگایەش شڵەژان و دڵەڕاوکێی منداڵ کەمدەکەنەوە.کاتێك دەستی رۆژگار ناچارمان دەکات بەشێوەیەکی کاتی جگەرگۆشەکانی خۆمان بەجێبهێڵین، دەبێت پێشوەخت زەمینەی ئەم جوداییە ئامادەبکەین، هەندێك دایك و باوك دڵیان نایەت بڕوا بە منداڵ بهێنن کە بۆ نەشتەرگەرییەك یان ئەنجامدانی ئەرکێکی کۆمەلایەتی و گشت کارە پێویستەکانی دیکە ناچارن ئەو بەجێبهێڵین. شەوانە یان

کاتێك منداڵ لەقوتابخانەیە, لەماڵ دەردەچن و خزمێك یان دایەنێك رادەسپێرن کەهۆی لەماڵنەبوونیان بۆ منداڵەکە راڤەبکات.

دایکی جمکێکی سێ ساڵی بۆ نەشتەرگەریەك ناچار بوو لە نەخۆشخانەدا بخەوێت. لەماڵەوە کەشوهەوایەکی وەرچەرخێنەری خراپ و قەیراناویی پڕلە نائارامی بەرپابوو، بەڵام هیچیان بە منداڵەکان نەگوت تا دایکەکە لە بەیانیی ئەو رۆژەی کە دەبوایە لەنەخۆشخانەدا بخەوێت. کیسەی کرینی کەلوپەلی لە دەست گرت وای بە منداڵەکان پیشان دا کە دەچێتە فرۆشگا بەم شێوەیە ماڵەوەی بەجێهێشت و تاسێ هەفتە نەگەڕایەوە.

لەو ماوەیەدا منداڵان هەستیان بە ناڕەحەتی دەکرد ولە هەموو روویەکەوە بە پەژمووردەیی دەهاتنە بەرچاوو, روونکردنەوەو دڵدانەوەی باوکیان هیچ کاریگەرییەکی لە کەمکردنەوەی نارەحەتیی ئەواندا نەبوو, هەموو شەوێك تا کاتی خەوتن دەگریان و لە چاوەڕوانیی هاتنەوەی دایکیاندا بەدرێژایی رۆژ لەبەردەم پەنجەرەدا دادەنیشتن. هەرکاتێك منداڵان بۆ ئەم تاقیکردنەوەیە ئامادەبکرێن باشتر بەرگەی ئێش و ئازاری جودایی دەگرن، بەڵام ئەم ئامادەییە پێشوەختە پێویستی بە پێشاندان و خستنەگەڕی شارەزایی و دەروونناسی هەیە، لەبەر ئەوەی منداڵ بەئاسانی بڕوا بە روونکردنەوەی ئاسایی ناهێنێت. بەتایبەت دەبێت بەزمانی خودی منداڵ واتا بەزمانی بووکۆڵە قسەی لەگەڵدا بکرێت.

(YVTTE) کچێکی بچووکە. دایکی دوو هەفتە پێش ئەوەی بۆ نەشتەرگەری بچێتە نەخۆشخانە (ئیڤیت)ی لە رووداوەکە ئاگادارکرد.(ئیڤیت)ئەوەندە گرینگیی بەمەسەلەکە نەدا، بەڵام دایك لەکەمیی گوێپێدانی منداڵەکە بۆ پشکنین و لێکدانەوەی هەواڵەکە بێ ئومێد نەبوو بەڵکو ئاوای بەکچەکەی گوت: (وەرە دیمەنی رۆیشتنی دایك بۆنەخۆشخانە بنوێنین!) چەند بووکۆڵەیەکی خستە ریزی یەکەوە کەتایبەت بۆئەم بۆنەیە کڕیبووی، خانەوادەو پزیشك ودایەنێکی بۆمنداڵەکە بەرجەستەکرد. کاتێك دایکەکە بووکەکانی رێکدەخستن وبەزمانی ئەوان قسەی دەکرد نیمچە شانۆگەرییەکی بەم شێوەیە نمایشکرد: (دەبێت دایەبۆ چارەسەرکردنی خۆی لەنەخۆشخانەدا بخەوێت. دایە لە ماڵەوەنییە.) (ئیڤیت)

سەری سوڕدەمێنێت و دەپرسێت: (دایە لەکوێیە؟ دایە لەکوێیە؟) بەڵام دایە لەماڵەوەنییە.. هەروەها لە موبەق و ژووری خەوتن و ژووری دانیشتن نییە. دایە چووەتە نەخۆشخانە تاکو دکتۆر ببینێت و بیپشکنێت و چارەسەر بکرێت. ئیڤیت هاوار دەکات: (دایکم دەوێت! دایکم دەوێت!)، وەلێ دایە لەنەخۆشخانەیە چونکە دەبێت چارەسەر بکرێت. دایە ئیڤیتی زۆر خۆشدەوێت و لەدووریی ئەو زۆرئازار دەچێژێت وهەموو ڕۆژێك بیری دەکات.(ئیڤیت)یش بیری دەکات و لە دووری ئەو داخدارە.دوایی دایەپاش چارەسەرکردنی دەگەڕێتەوە ماڵەوە (ئیڤیت) نوقمی شادومانی دەبێت.

ئەم شانۆگەرییەی جودایی و گەڕانەوەیە لەلایەن دایك و کچەکەوە چەندین جار دووبارە کرایەوە. لەسەرەتادا دایك زیاترقسەی دەکرد وەلێ (ئیڤیت) بەزوویی جێگای گرتەوە.ئەولەگەڵ بەکارهێنانی بووکۆڵەکانی پەیوەندار بەدکتۆرو پەرستارەکان،پێشی دەگوتن کە بەچاکی چاودێریی دایکی بکەن وچاکی بکەنەوە هەرچی زووترە بینێرنەوە ماڵەوە.

پێش ئەوەی دایك بچێتە نەخۆشخانە .(ئیڤیت) داوای لێکرد کە جارێکی دیکە نواندنەکە دووبارە بکاتەوە.بەشی زۆری نواندنەکە (ئیڤیت) ئەنجامی داو لەکۆتاییدا بەئاوازێکی دڵنیایی بەخشەوە ئاوای بەدایکی گوت: (دایەگیان نیگەران مەبە ! هەرکاتێك گەڕاینەوە من لێرەم!)

پێش ئەوەی دایك ماڵەوە بەجێبهێڵێت چەند تەگبیرێکی سوود بەخشی دیکەی بەکارهێنا. بەم شێوەیە (ئیڤیت)ی بەو ئافرەتە ناساند کەلەکاتی لەماڵ نەبوونی خۆیدا ئەرکی پاککردنەوەو ڕێکخستنی ماڵەوەی پێسپێردرابوو،هەروەها وێنەیەکی گەورەی خۆی وئیڤیتی خستە سەر کۆمەدی و جگە لەمەش لەسەرکاسێتێك پەیامێکی خۆشەویستانەی بۆئیڤیت تۆمارکرد بەشێوەیەك لەکاتژمێرەکانی تەنیاییدا وێنەو دەنگی تا ئەوپەڕی لە کەمکردنەوەی ناڕەحەتیی (ئیڤت)لەکاتی لە ماڵ نەبوونی دلیکی کاریگەر بوو.

## * نیگەرانیی سەرچاوە گرتوو لەکەمو کورتکاری:

دایکان و باوکان جا بزانن یان نەزانن هەستی گوناهکاری لەدەروونی منداڵانی خۆیاندا پەیدادەکەن،هەستیی کەمو کورتکاری بۆ ژیانێکی ئاسایی و بۆنخۆش وەکو خوێ تاموبۆیەکی بەسوودە، بەڵام نابێت بەشێوەیەکی زێدەڕۆیانە بەکاربهێنرێت .
کاتێك منداڵێك لەبەرانبەر رێورەسمێکی پەسندکراوی کۆمەلایەتی یان رەفتارێکی رەوشتی سنوری بەزاند، دەبێت ئەو هەڵەو خلیسکەی منداڵەکە دادەوەرانە پلەبەندی بکرێت و لەنێوان هەڵەیەکی بچووك و، کەموکورتکارییەکی گەورەدا جیاوازییەك دابنرێت. ئاساییە کاتێك منداڵێك لەبەرانبەر هەستە نەخوازراو وناپەسندەکاندا رێی لێ دەگیرێت لەدڵەوە هەست بەنیگەرانی و کەموکوڕی دەکات.
دەبێت دایك و باوك بۆجڵەوگیرکردنی هەست وهەڵچوونە بێسوودەکانی کەموکوڕی و لەوکاتەی منداڵ سنوورێك دەبەزێنێ، هەمان ئەو رێگایە بگرنەبەر کە فیتەرێك لە بەرانبەر ئوتومبێلێکی شکاودا دەیگرێتە بەر. بۆزیاتر روونکردنەوە؛ کاتێك ئوتومبێلێکی شکاو بۆ نۆژەنکردنەوە بەفیتەر پیشان دەدەن، فیتەرەکە ڕەخنە لە خاوەنەکەی ناگرێت کە بۆچی ئاوای بەسەر ئوتومبێلەکەی هێناوە، بەڵکو ئەوەی بەراوبۆچوونی خۆی دەبێت چاکبکرێتەوە بەخاوەنی ئوتومبێلەکەی رادەگەیەنێت هەروەها فیتەرەکە رەخنە لەدەنگە جۆراوجۆرەکان و تەقەتەق و لەرزینی پارچەکانی ئوتومبێلەکە ناگرێت, بەڵکو بۆ دیاریکردنی کەموکوڕی و شکستەکانی سوودیان لێوەردەگرێت ولەخۆی دەپرسێت: (سەرچاوەی خراپ بوونی ئوتومبێلەکە چییە؟)
بۆمنداڵان مایەی ئەوپەڕی ئارامیی خەیاڵ و شادومانییە لەنێو دڵەوە دڵنیابن کە دەتوانن ئازادانەو بەپێی ئارەزووی خۆیان بیر بکەنەوە بەبێ ئەوەی خۆشەویستی و ڕەزامەندیی دایکان و باوکانیان لەدەست بدەن. ئەم قسانەی خوارەوە یارمەتییەکی کاریگەر بەمنداڵان دەبەخشێت تاکو دڵنیابن لەوەی کە لە بیرکردنەوەدا ئازادییەکی تەواویان هەیە: (تۆ بەجۆرێك بیردەکەیتەوە منیش بەجۆرێکی دیکە، دەربارەی ئەم مەسەلەیە ئێمە دووبیرو بۆچوونی جیاوازمان هەیە.) یان (تۆ بیری خۆتت بەچاك دێتە بەرچاو بەڵام بڕوای من و بڕوای تۆ جیاوازییان هەیە رێز لەراو بۆچوونت دەگرم

وەلێ راو بۆچوونی من شتێکی دیکەیە).هەندێك کات دایکان و باوکان نازانن بەهۆی زۆر گوێی و روونکردنەوەی ناپێویست هەست بەکەموکوڕیکردن لە دڵی مندالأنیان پەیدادەکەن. ئەم راستییە بەتایبەت دەربارەی (دایك و باوکە رۆشنبیرەکانی) ئەمڕۆ راست دەردەچێت کەوا یان بەخەیاڵدا دێت کە دەبێت هەمووکارێك بەگونجان و هاوتابوون لەگەڵ بیروڕای مندالآن بێتە کایەوە تەنانەت ئەگەر کارەکە دژواریش بێت و مندالآن ) بەپێی پێویست

توانایی درك پێکردنیشان نەبێت.( زاخاری )کوڕێکی(٥)ساڵییە لەدەست مامۆستاکەی ماڵەوەی تووڕەبوو لەبەر ئەوەی بەهۆی تەنبەڵیەوە ماوەی دووهەفتە نەیتوانی بوو بۆ وانەگوتنەوە ئامادەبێت. لەرۆژی گەڕانەوەیدا (زاخاری) کلآوی مامۆستاکەی رفاندو بەرەو حەوشەکە رایکرد. دایك و مامۆستا کەوتنە دوای، مامۆستاکە پێیگوت: (کلآوەکە هی منە! بیدەرەوە من!) دایکی گوتی:(زاخاری! تۆباش دەزانیت کەکلآوەکە هی تۆنییە. ئەگەر نەیدەیتەوە,میس (مارتا) نەخۆشدەکەوێتەوە, دەزانیت کەئەو دووهەفتەیە نەخۆش بوو, وانییە خانم (مارتا)؟ (زاخاری) تۆ حەزناکەیت مامۆستاکەت جارێکی دیکە نەخۆش بکەوێتەوە. ئایا وانییە؟ مەترسیی روونکردنەوەیەکی ئاوا لەوەدایە کە ڕەنگە لەدەروونی (زاخاریدا) هەستی کەموکوڕیو گوناهکاری پەیدابکات ,بەومانایەی کەخۆی بەلێپرسراوی تەنبەڵیی مامۆستاکەی دەزانێت.ئەم جۆرە روونکردنەوە دوورودرێژ و بێجێیانە زۆر زیانبەخشن. ئەوەی کەدەبێت لەبارێکی ئاوادا ئەنجام بدرێت وەرگرتنەوەی کلآوەکەیە. کلآوێك لەدەست مندالێکدا بەچەندین جار لەم دوو روونکردنەوەیەی نێوحەوشەکە باشترە. پاشان مامۆستاکە دەیتوانی دەربارەی تووڕەیی زاخاری لەسەر ئامادەنەبوونی خۆی گفتوگۆی لەگەڵدا بکات و بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم تووڕەییەی رێگای پێ پیشان بدابوایە

نیگەرانیی سەرچاوەگرتوو لەقەدەغەکردنی ئازادی!: کاتێك مندالێك قەدەغەبکرێت لەئەنجامدانی چالاکی و لەئەستۆ گرتنی ئەو لێپرسراویەتیانەی بۆیان ئامادەیە. کاردانەوەی دەروونیەکەی دڵشکان و رەنجان و تووڕەییە. ڕەنگە تووڕەییش لە خۆیەوە ببێتە هۆی پەیداکردنی خەیاڵاتی تۆڵە ئامێز و ئەویش لەلایەن خۆیەوە

هەست بە کەموکوڕی بکات ولەهەستی تۆڵەخوازیی خۆی بترسێت , لەهەموو بارەکاندا دەبێتە هۆی پەیداکردنی نیگەرانیی لە دڵی منداڵە ساوایەکان . منداڵان هەرگیز ناتوانن تەنانەت کارە بچووکەکانیش وەکو گەوران بەباڵادەستی و شارەزاییەوە ئەنجام بدەن. بۆ نموونە بۆ بەستنی قەیتانی پێڵاو، داخستنی قۆپچەی جل وبەرگ و، جل وبەرگ لەبەرکردنەوە وهەڵگرتنی دەرقاپی گۆزەو کلیلدانی دەرگایەك لە گەورە ساڵان زیاتر کات خەرج دەکەن. لەم جۆرە بارانەدا باشترین کۆمەك بۆئەوان پیشاندانی سەبرو دان بەخۆداگرتن وئاماژەی زۆرکورتە بەشێوەکانی کار، بۆنموونە دەتوانرێت بگوترێت::(لە پێکردنی ئەم پێڵاوانە کارێکی ئەم جۆرە قسانە ئاسان نییە) یان (دەرقاپی ئەم گۆزەیە بە زەحمەت دەبەسترێت). بارمەتییەکی کاریگەریی منداڵ دەدات جانەگەر لەکارەکەی سەرکەوتن وەدەست بهێنێت یان وەدەست نەهێنێت. هەرکاتێك سەرکەوتنی وەدەست هێنا، خۆشحاڵەلەوەی کەکارێکی دژواری ئەنجام داوە، هەرکاتێك سەرکەوتنیشی وەدەست نەهێنا، بەلای کەمەوە بەوە دڵخۆشە کەدایك و باوکی دەزانن کارێکی دژوار بوو. لە هەردوو باردا سوود لە خۆشەویستی و پشتیوانیی دایك و باوکی وەردەگرێت ,لەئەنجامدا پەیوەندیی لەگەڵ دایك و باوکی بەهێزتر دەبێت و زیاتر وا بەستە و هۆگریان دەبێت، هەروەها لەوکاتەی لەکارێکدا سەرکەوتن وەدەست نەهێنێت خۆی بەبێ توانا و ناشایستە لەقەڵەم نادات. هەمیشە دەبێت ئەو خاڵە سەرەکییانەمان لەخەیاڵدا بێت کە پێشبینی و چاوەڕوانیی گەورە ساڵان بۆ ئەنجامدانی کاری تەواو و بێ کەموکوڕی، ژیانی منداڵان خراپ دەکات و،چاوەڕوانی و پێشبینییەکی کامڵ یەکێکە لە دوژمنە سەرسەختەکانی سەردەمی منداڵی و لەڕووی سۆزییەوە تانەوپەڕی بەگران لەسەر منداڵانمان دەوەستێت, لەبەر ئەوەی کانیاوو سەرچاوە گیانییەکانی منداڵان وشك دەکات وناهێڵێت ئاساییانە پێبگەن وپەروەردە ببن, حەزوئارەزووەکانیان دەکوژێت و لەوانەیە بەتێکچوونی هاوسەنگی سۆزیی منداڵان کۆتایی پێبێت.

## نیگەرانی سەرچاوە گرتوو لەشەڕو کێشەی نێوان دایك و باوك:

کاتێك دایك و باوك لەحاڵی ناکۆکی و گۆتە گۆتن, منداڵان هەست بە نیگەرانی و

گوناهکاری دەکەن, چونکە نیگەرانی ئارامیی خانەو هێلانە دەخاتە مەترسییەوە. بۆیەش وا خەیاڵ دەکەن کەوا گوناهکارن، چونکە وا دەزانن ئەوان بوونەتە هۆی شەڕو کێشەی نێوان دایك و باوکیان. ئەم خەیاڵکردنە چ راست بێت یان هەڵە ئازار و هێدمەیەکی فراوان بەمنداڵان دەگەیەنێت.

لەشەڕوکێشە خانەوادەییەکاندا منداڵان کەمتر بەبێلایەنی دەمێننەوەو زۆربەی جاریش لایەنگری دایك وباوکیان دەبن و لەئەنجامدا هەم هێدمە بەلایەنی سێکسییان دەگات و هەم بەچۆنییەتی گەشەکردن ولایەنی پەروەردەییان. لەوکاتەی کوڕێك باوکی و کچێك دایکی بەتاوانبار دەزانێت لەوکاتەدا ئەوان بەسەر مەشقی خۆیان نازانن وابێبەش دەبن لەبوونی نموونەیەك بۆ پەیڕەوی و لاسایی کردنەوەی: ناکۆکیی منداڵ لەگەڵ دایك یان باوکی بە خۆ دوورخستنەوە لە لاسایکردنەوەی رەفتارو کرداری ئەوان بەدیار دەکەوێت. ڕەنگە لە هەلومەرجە زۆر توندوتیژەکاندا, دەرکردنی دایك و باوك لەماڵەوە بەهاوشێوەیی سێکس و تێکچوون و ئاڵۆزی و سەرنگونکردن وبێتوانایی بۆ درێژەدان بەژیانێکی ئاسایی کۆتایی پێبێت. کاتێك کوڕ لەگەڵ دایك و کچ لەگەڵ باوکی ناکۆکە، ڕەنگە هەردووکیان بەرانبەر بەگشت رەگەزەکانی جیاواز لە خۆیان لە تەواوی قۆناغی ژیانیاندا هەستی بەدحاڵیبوون و رکابەرییەتی لەدڵی خۆیاندا پەروەردە بکەن.

هەرکاتێك بۆ راکێشانی خۆشەویستی منداڵان کێبڕکێ و کێشە لەنێوان دایك و باوکدا رووبدات، زۆربەی جار ئەوان پەنادەبەنە بەرهۆکارە نا پەروەردە ییەکانی وەك بەرتیل پێدان و ماستاوچیەتی و درۆزنی, لەئەنجامدا منداڵان بەهەستی دژ بەیەك و هەست و سۆزی دوودڵانە پەروەردە دەبن. جگە لەمانەش، پێویستیی لایەنگری لەیەکێکیان لەدژی ئەوی دیکەو سوود وەرگرتن لەهەڵە بۆ (باشترلە قەڵەمدانی باوك لەجیاتی دایك) یان بەپێچەوانەوە شوێنەوارێکی بەردەوام لە خوو و کەسایەتیی منداڵدا بەجێدەهێڵێت و لەهەمان قۆناغی منداڵیدا ئاگاداری بەهاو گرینگیی خۆی دەبێت, کاتێ خەڵکانی دیکە لەسەر ئەوکێشە دەکەن, بەرێژەیەکی زۆرسوود لەم هەلومەرجانە وەردەگرێت و زیاتروزیاتر شێوازو رێگای زەمینەسازی و پیلانگێڕی و سێخوڕی و (تێك بەردان) فێر دەبێت و لەجیهاندا خووبە ژیانێك

دەگرێت کەبەڕای ئەو خۆشەویستی نادروستە و شەرەفیش بە ڕێگری بەردەم هەڵشکان و پێشکەوتن دەزانێت, لەجیهانێکدا دەژیت کە زیاتر لەگەڵ ڕەوشت و ڕەفتاری ناپەسند و قیزەوندا دەگونجێت.

## نیگەرانیی سەرچاوە گرتوو لە دەستێوەردانی چالاکییە جەستەییەکان:

لەزۆربەی ماڵە نوێیەکاندا، منداڵان بۆ پێشاندانی زۆرانبازی و ململانێیە جەستەییەکان بەهۆی نەبوونی شوێن خۆیان لەشوێنی تەنگەبەردا دەبیننەوە. ئاپارتمانە گەورەو ئامادە کراوەکان و جلوبەرگی گرانبەها ڕێگە لە بازدان و(هەڵبەزین و) گەمەی منداڵان دەگرێت. ئەم سنوور بەندکردنانە بەگشتی لەژیانی منداڵاندا زوو دەستپێدەکات. ئەو منداڵەی تازە لەدایکبووە مۆڵەتی ئەوەی نییە لەگالێسکەکەی خۆی بووەستێت, ڕەنگە ئەو منداڵەی تازە پێیگرتووە لەراکردن و سەرکەوتن بەسەر پەیژەکاندا قەدەغە بکرێت.ئەومنداڵانەی کەبەوشێوەیە هەست بەڕەنجان دەکەن زیاتر نیگەران دەبن و دەشڵەژێن. چارەسەری ئەم مەسەلانە تەنیا بەهۆی زانیاری و ئاگاداریی دایکان و باوکان دەربارەی گرینگیی بابەتەکە وەدیدێت.

دەبێت دایکان و باوکان بزانن کەمنداڵان تەنیا بەئەنجامدانی چالاکییە جەستەییەکانیانەوە لەنارەحەتییەکانیان دەربازدەبن ,لەبەرئەوە پێویستیان بە شوێنێك هەیە کەتیایدا رابکەن و بۆگەمەکردن هۆکاری پێویستیان هەبێت. دەبێت ئەوان بەلای کەمەوە ژوورێکیان لەبەردەستدابێت کە بەوپەڕی ئارامیی دەروونییەوە چالاکییە جەستەییەکانی خۆیانی تێدا ئەنجام بدەن.

## ئەو نیگەرانییەی کە لەترسی مەرگەوە سەرچاوە دەگرێت:

ترس و تۆقینی گەورە ساڵان لەمەرگ بەهۆی لایەنە لێڵونهێنییەکانی ئەم دیاردەیەوەیە. مەرگ کە فەرمانێکی کۆتایی وبێچەندوچۆنە کۆتایی گشت ئومێدەوارییەکانی مرۆڤە. چونکە قورسیی مەرگ بەرگەی ناگیرێت و هەرگیزناتوانین بیهێنینە خەیاڵی خۆمانەوە. سروشت و خووکەسایەتی و یادگاری و ئەو ئومێدەوارییانە دەگرێتەوە کە قۆناغێکی رابردوو وکاتێکی ئایندەیە لەبەر ئەوەی

هیچ تاکەکەسێك ناتوانێت بەبێ ئاینده تەماشای خۆی بکات. ئەو دڵخۆشی و ئارامییەی کەبیرو رای مەزهەبی بۆ مرۆڤی پەیدا دەکات تەواو لەهەمان ئەو شتە دایە بەو مانایەی ئایندەیەکی بۆ مرۆڤ داناوە، بۆیە مرۆڤی بڕوادار دەتوانێت بەخەیاڵێکی ئاسوودەوە بژیت و بمرێت.

ئەگەر مردن بۆ گەورە ساڵان مەتەڵاوییە، بۆ منداڵان مەتەڵێکی نهێنیی وەهایە کە هەرگیز ئاشکرا نابێت و پەردەی لەسەر لانادرێت.منداڵ ناتوانێت درك بەو خاڵە بکات کە مردن لایەنێکی یەکجاری و بێچەندوچۆن و بەردەوامی هەیە ,هەوڵی دایك و باوك و دوعاو پاڕانەوەیان ناتوانێت مردوو زیندو بکاتەوە. بێ توانایی وەدیهێنانی ئارەزووەکانی منداڵ لەبەرانبەر مەرگ بەهێدمەیەکی گەورە دادەنرێت بەو مانایەی بڕوای ئەو لەبەرانبەر هێزو وزەی خۆی لەسەر گۆڕین و وەرچەرخاندنی رووداوی بەهێزو ئیرادەو ئارەزووە زێدەڕۆیەکەی خۆی لەرزۆك دەکات و بێ تواناو نیگەرانی دەکات. منداڵ بەچاوانی خۆی دەبینێت کە رژاندنی لافاوی فرمێسك و ناڕەزاییە توندەکانی لە بەرانبەر مەرگی ئاژەڵێکی راهێنراوو ماڵی یان مەرگی هۆگرو کەسێکی بەڕێز و رێزلێگراوی لەژیاننەماودا بێ سوودەو نابێتە هۆی زیندوو کردنەوەو گەڕانەوەیان ,لەبەر ئەوەی هەست دەکەن بێ یارو یاوەر بەجێهێڵدراون. ترسی منداڵەکە زۆربەی جار لەو پرسیارانە ڕەنگدەداتەوە کە لە دایك و باوکی دەکات:(ئایا پاش مردنیش منت خۆشدەوێت؟)

هەندێك لەدایکان و باوکان هەوڵ دەدەن رۆڵەکانی خۆیان لەو غەم و کاریگەربوونە توندە بپارێزن، کەبەهۆی لەدەستچوونی ئازیزێکەوە پەیدادەبێت.. بۆ نموونە هەرکاتێك ماسی یان کیسەڵی منداڵ بمرێت، بەخێرایی ماسییەك یان کیسەڵێکی دیکەی لەجیات دەکڕن و ئومێدەوارن منداڵ هەست بەم جیاوازییە نەکات. هەرکاتێك سەگەکەی یان پشیلەکەی بمرێت، بێدرەنگ ئاژەڵێکی گرانبەهاترو جوانتر دەکڕن بەو ئومێدەی منداڵ غەم و مەراقی خۆی فەرامۆش بکات . لەم تاقیکردنەوە سەرەتایی وزیانە کتوپڕانەو چاکردنەوە یەکسەرییانەدا چ وانەیەك فێر دەبێت؟ ڕەنگە دەرەنجامێکی وەهای بێتە دەست کە لە دەستچوونی ئازیزان گرینگییەکی گەورەی نییەو بەئاسانی دەتوانرێت خۆشەویستی بگوازرێتەوەو وەفاداری و

پاکدۆستی دابەش بکرێت. نابێت منداڵ لەمافی پرسەداری وغەم ومەراق بێبەش بکرێت ،دەبێ ئازادبێ لەوەی غەم لە مردنی ئازیزێك بخوات. بەم ڕێگایە هەستی مرۆڤدۆستیی منداڵ قووڵتر دەبێت و هەستەکانی ناسکتر دەبن. بەشێوەیەکی گشتی دەبێت بزانرێت کە نابێت منداڵان لەهاوبەشبوون لەغەموو مەراقی ژیان بەدوور بخرێنەوە، چونکە دەبێت خوو بەجوانی و ناشرینی و خۆشی و ناخۆشییەکانی ژیان بگرن و وپێی ئاشنابن. کاتێك مەرگێك ڕوودەدات ومنداڵ لەچۆنیەتیی مردنەکە بێئاگایە,لەوانەیە تووشی نیگەرانی و سەرلێتێکچوون ولێڵیو ناڕاشکرایی بێت، یان لەوانەیە بێ ئاگایی خۆی بەچەند خەیاڵێکی لێڵ و مەنگ و ڕوونکردنەوەی تۆقینەرانە پارسەنگ بداتەوە. لەوانەیە لەبەرانبەر ئەم مردنە خۆی بەلێپرسراو بزانێت و بەم ڕێگایەش نەك هەرهەست دەکات لە مردووەکە جودایە، بەڵکو لەبەرانبەر زیندووەکانیشدا هەست بە جودایی دەکات. یەکەمین هەنگاو بۆیارمەتیدانی منداڵ لەڕووبەڕوو بوونەوەی غەم ولەدەستدانی ئازیزێك ئەوەیەکە مۆڵەتیان پێبدەین ترس و هەست و نیگەرانی وخەیاڵکردنەکانی خۆی بەتەواوی دەرببڕێت. ئارامی ودڵدانەوەی زیاتر بەهۆی هاوبەشبوون لە سۆزە قووڵەکاندا بەهۆی گوێگرێکی باشەوە وەدەست دێت. دایکان و باوکان هەمیشە دەتوانن ئەوسۆزانە رابگەینن و و قسەی لەسەر بکەن کەلەوانەیە منداڵ هەستیان پێبکات وەلێ نەتوانێت رایانبگەیەنێت, بۆ نموونە پاش مردنی ئەو داپیرەی کەمنداڵ دڵبەستەیەتی، لەوانەیە دایك و باوك ئاوای پێبڵێن: (دایە گەورەت لە دەستچوو!) یان (لە نەبوونی ئەودا زۆر هەست بە ناڕەحەتی دەکەیت!) یان (زۆرت خۆشدەویست!) یان (چەندی تۆ خۆشدەویست!) یان (چەندە حەزدەکەیت ئێستا لەگەڵماندا بووایە) یان (چەندە حەزدەکەیت ئێستاش زیندووبوایە) یان (باوەڕ ناکرێت کەمردووبێت) یان (باوەڕ ناکرێت ئیدی ئەو لەگەڵ ئێمەدا نەبێت) یان (چەند بەباشی دەیهێنیتەوە یادت!), ئەم جۆرە قسانە پەیوەندی وگرینگی پێدانی پتەوی دایك و باوك بەهەست و بیرەکانی منداڵان پیشان دەدات و هانیان دەدات هاوبەشی نیگەرانی و غەموو مەراقی دایکان و باوکانیان بن. ڕەنگە منداڵ بیەوێت بزانێت ئایا مەرگ ئازاربەخشە و ئایا مردوو جارێکی دیکە زیندوو دەبێتەوە ئایا خۆی و دایك و

باوکی دەمرن، دەبێت وەلامی ئەم پرسیارانە کورت و راست و دروست بن.دەبێت بەمندالان پێشان بدرێت کە مردوو بەهیچ شێوەیەك هەست بەئازار ناکات و هەرگیز دووبارە بەزیندوویی نایەتەوە سەر گۆرەپانی ژیانی دونیا. مردن بۆ کەسێکی پیر لە هەموو روویەکەوە سروشتییە. کاتێك دەربارەی مەرگ قسە لەگەڵ مندالاندا دەکرێت، باشترە خۆمان لەدەربرین و قسەی فریودەرانە بەدوور بخەینەوە. کاتێك بەکچێکی (٤) سالەیان گوت کە دایە گەورەی چۆتە نێو خەوێکی تاهەتاییەوە، بێدرەنگ پرسی: ئایا جلو بەرگی خەوتنی لەگەڵ خۆیدا بردووە یان نا؟ هەروەها لە بەرئەوەی دایەگەورە لەپێش مردنیدا پێی نەگوتبوو (شەوت شاد) هەستی بەترس دەکرد نەوەك دایە گەورە لێی رەنجابێت.

کاتێك کەبە مندالێکی (٥)سالەیان گوت (دایە گەورە چۆتە ئاسمان و هەروەکو فریشتەکانی لێهاتووە)، لەخوا دەپارایەوە کە گشت ئەندامانی خانەوادەش هەرچی زووتر بمرن تاکو(ببنە هاودەمی فریشتەکان)، کاتێك بەو پەری سادەییەوە بەنەوازش و خۆشەویستییەوە راستییەکان بۆ مندالان راڤە بکەین بێگومان هەست بەئارامی و دڵنیایی دەکەن، بەلام ئەم مامەلەیە کاتێك کاریگەرو سوودبەخش دەبێت کە خودی دایك و باوك لەراستییەکانی ژیان و مردن گەیشتبن و قبوڵیان کردبێت. بەشێوەیەکی گشتی لە هەموو بابەتێکی گرینگدا رەفتارو شێواز لە گوفتار گرینگترە.

## بەشی نۆیەم

## پەروەردەی سێکسی

- سەرەتای دەستپێکردنی هەستە سێکسییەکان.
- سێکس و فێرکردنی منداڵ بۆ چوونە ئاودەست.
- چێژە سێکسییەکان.
- جیاوازییە سێکسییەکان.
- وەڵامدانەوەی پرسیارەکان.
- لەشی رووت.
- پێخەف و ژووری نووستن.
- خەیاڵی ئومێدبڕ.
- دەستپەڕ.
- گەمە یاساغەکان: گەمە سێکسییەکان.
- قسەی کرچوکاڵ و ناشرین.

زۆربەی دایکان و باوکان وا خەیاڵدەکەن کە پەروەردەی سێکسی بەگفتوگۆو ئامۆژگاری دێتەدی. دایك یان باوك بەهۆی ئارەزووداریی ئارەزوویەکی قۆناغی پێش پێگەیشتن، منداڵی خۆیان دەبەنە کەنارێك و دەربارەی (راستییەکانی ژیان) ئاگاداریان دەکەنەوە، منداڵان لەمەترسیی دەستپەڕو ئەونەخۆشییانە ئاگادار دەکەنەوە کە بەهۆی پرۆسەی سێکسییەوە تووشیان دەبێت، هەروەها کچەکانی خۆشیان لەمەترسی سکپڕبوون ئاگادار دەکەنەوە ,لەکاتێکدا دەبێت پەروەردەی سێکس زۆر زووتر دەست پێبکات. شێوازو رێگای سێکسیی خودی دایك وباوك رەنگدانەوەیەکی گەورەی بەسەر رێگاو شێوازە سێکسییەکانی منداڵەوە هەیە. ئایا دایك وباوك حەز بەدیمەنە رووتەکانی ژن و مێردایەتی دەکەن و چێژ لە بۆنی لەشی یەکتری وەردەگرن، ئایا وا هەست دەکەن کە ئەم هەستانە قێزەون و ناشرینن؟ ئایا حەزدەکەن یەکتری بەرووتی ببینن. یان هەر لەگەڵ ئەوەی بەرووتی تەماشای یەکتریان کرد ئەوەندە شەرمەزار دەبن کە چاوانی خۆیان دەگرن و لەشی خۆیان دادەپۆشن؟ ئایا رقیان لەرەگەزی خۆیان یان رەگەزی بەرانبەر دەبێتەوە، یان حەزی

لێدەکەن و خۆشیاندەوێت؟ ئایا لە بواری پەیوەندییە سێکسییەکاندا یەکتری بە سارد و حسێبگر دەزانن، یان هەوەس و ئارەزووداریی هاوبەشیان لەبەرانبەر سێکسدا هەیە و چێژی لێوەردەگرن؟

هەستی شاراوە و خامۆشی دایك و باوك هەرچی بێت, راو بۆچوونی سەلمێنراو ئەوەیە کە کاریگەریی بەسەر منداڵانەوە هەیە تەنانەت ئەگەر دایك و باوك لەکاتی قسەکردن لەمەڕ مەسەلە سێکسییەکان پەلەوەر و زەردەواڵە و پەپوولەش بەنموونە بهێننەوە. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە زۆر زەحمەتە بتوانرێت دەربارەی پرسیارەکانی منداڵان لەسەر مەسەلە سێکسییەکاندا یارمەتیی دایك وباوك بدرێت. لەسەرتادا دەبێت خراپ تێگەیشتن و گومڕایی دایك و باوك دەربارەی مەسەلە سێکسییەکان وەلاوە بنرێت.ناڕەحەتی ونیگەرانییەکانی دایك و باوك لەم رووەوە لابردرێت ئەوکاتەدەست بەپەروەردەی سێکسیی منداڵانیان بکەن.

## سەرەتای دەستپێکردنی هەستە سێکسییەکان:

منداڵان هەر لەسەرەتای لە دایکبوونیانەوە بۆهەست و چێژە سێکسییەکان ئامادە و تەیارکراون و لەهەمان قۆناغی منداڵیەتیی خۆیاندا هەلومەرجی سێکسییان دەست بەپێکهاتن دەکات. چێژ وەرگرتنی منداڵ لەلەشی خۆی جیاوازی لەگەڵ چێژوەرگرتنی گەورەساڵاندا هەیە. بەشێوەیەکی گشتی منداڵ لایەنی سێکسیی هەیە. هەر لەگەڵ ئەوەی منداڵ لەرووی جەستەییەوە توانایەکی پێویستی وەدەستهێنا, لەشی خۆی دەپشکنێ. بەدەستی خۆی نەوزاشی لەشی خۆی دەکات و کاتێك خەڵکانی دیکە نەوازشی دەکەن و قدیلانەی دەکەنەوەو دەچێتە ئامێزیانەوە چێژ وەردەگرێت. ئەم بەرکەوتن و نەوازشە سەرەتاییانە بەشێکی پەروەردەی سێکسیی منداڵ پێکدەهێنن و منداڵ بەهۆی ئەم رێگایەوە فێری خۆشیی چێژ وەرگرتن دەبێت.زەمانێك بوو هۆشدارییان بەدایکان دەدا کە تاپێیان دەکرێت منداڵانی خۆیان لەئامێز نەگرن و گەمەیان لەگەڵدا نەکەن, دەنا منداڵ بەدخوو دەبێت, وەلێ لەم زەمان و سەردەمە دێرینانەشەوە دایکان دەیانزانی کە ئەم ئامۆژگارییە لۆژێکی نییە, بەڵکو دایکان بەڕەمەکی خۆیان دەزانن کە گەمە نەکردن لەگەڵ منداڵاندا زیانێکی گەورەیان پێدەگەیەنێت, ئێستاش وا هەموومان

دەزانین کە منداڵ زۆر پێویستی بەلاواندنەوەو لەئامێز گرتن هەیە.
کاتێك منداڵ بۆی روون دەبێتەوە کە دەم مایەی چێژ وەرگرتنێکی زیاترە، هەرچیەکیشی بکەوێتە بەردەست تەنانەت پەنجەو پەتوو و بووکۆڵە بۆدەمی دەبات و مژین و جووین وگازگرتن لەوشتانەی کە ناشخورێن چێژێکی ئاسایی بۆدەهێنێتەدی.
نابێت رێگا لەو چێژوەرگرتنە (دەم)بیانەی منداڵ بگیرێت. بەڵکودەبێت ئەوشتانە پاکبکرێنەوە، دەبێت تەنیا چاودێریی ئەوە بکەین کە ئەوشتەی منداڵ دەیخاتە دەمییەوە لەرووی تەندروستییەوە زیانی نەبێت، هەندێکی دیکە پێویستیان بەمژینێکی زیاتر هەیە و نابێت بەهیچ شێوەیەك ئەم چێژخوازییەیان قەدەغەبکەین .بەدرێژایی یەکەمین ساڵی تەمەنی منداڵ دەم گرینگترین ئاوێنەیە کە بەهۆیەوە ئەم جیهانە دەناسێت وبە جوانی دەکەوێت بەرچاوییەوە ,بۆیە نابێت بەهیچ شێوەیەك رێگا لەم رەنگدانەوە ئاساییە بگیرێت کاتێك پێویستی منداڵ بەجووین تێر نابێت، نابێت خەیاڵبکرێت کە ئەم پێویستییە ونبوو و تەواو، بەڵکو بەچەند وێنەیەکی لاوازترو بەهێزتر بەدیار دەکەوێتەوە، چونکە لەوانەیە کۆرپە پەنچەی خۆی بمژێت و منداڵی گەورەتر لە قۆناغی کۆرپەییدا رەشکەرەوە (مساحە) بجووێتو منداڵی پێگەیشتووش جگەرە بکێشێت, لەوانەشە کۆرپە هەمووشتێك بجووێت و، منداڵانیش نینۆکیان بەددان بقرتێنن.

## سێکس و فێرکردنی منداڵ بۆ چوونە ئاودەست:

ئامێری سێکس وئەندامەکانی فڕێدانی پاشماوەی خۆراك ئەوەندە لە یەکتری نزیکن کە شێوەی چوونە ئاودەستی منداڵ لەپەروەردەی سێکسیی ئەودا کاریگەریی هەیە، منداڵ لە دووەمین ساڵی لە دایکبوونی چێژ لە چوونە ئاودەست وەردەگرێت. بۆیە دیمەن و بۆنی پیسایی و تەنانەت دەستێوەردانیش بەهیچ جۆرێك قێزی منداڵەکە هەڵناستێنێت. لەبەر ئەوە کاتێك شێوە پاکەکەی چوونە ئاودەست فێری منداڵ دەکەین, دەبێت زۆرئاگاداری ئەوەبین کەمنداڵ لە دەروونی خۆیدا رقی لە لەش و دەرهاوێشتەکانی نەبێتەوە ,لەوانەیە هەنگاوی توندو خێرا ئەم هەستە لە دەروونی منداڵاندا پەیدا بکات کەتەواوی ئەندامەکانی لەش و ئەرکەکانی ئەندامەکان مایەی چێژ لێوەرگرتن نین بەڵکومایەی رقلێبونەوەو قێزلێبوونەوەن. پیشاندانی بێ ئارامی

لەفێرکردنی شێوەی پاك و خاوێنی هیچ ئەنجامێکی ئەرێیی نییە. مندالّ پێش دووەمین سالّی تەمەن ناتوانێت لەبەتالّکردنەوەی خۆی کۆنترۆلّی هەبێت ,هەروەها لەسێ سالّیشدا ناتوانێت بەویستی خۆی میزکۆنترۆلّ بکات ,زانراوە کەمندالاّن تا تەمەنی (٥)سالّی بە نارێکی دەچنە ئاودەست و بەهیچ شێوەیەك نابێت لەسەر ئەمە گلەییان لێ بکرێت.

کاتێ بۆ یەکەم جار مندالّ فێری ئەوە دەکەین خۆی بە پاکی رابگرێت، دەبێت وایان لێ بکەین دەست لە پیسایی خۆیان نەدەن ، بەلاّم پێویست نییە ئەم سەرگەرمییەی مندالّ بەتوندوتیژی رێگای لێ بگیرێت، بەلّکو بۆ سوودوەرگرتن لەم چێژە قەدەغەکراوانە دەتوانرێت بە چەند رێگایەکی جێگرەوەی دیکە رێنمایی بکرێت, بۆ نموونە دەکرێت هەندێك خیزو قورو رەنگ و گلّەسوورو لەگەلّ ئاو) لەبەردەستیان دابنرێت تاکو گەمەی پێبکەن، لە نەستی ئەواندا، ئەم مادانە هاوشێوەی جێگیری پیساییە راستەقینەکە دەبن و چێژ بە مندالاّن دەبەخشن, هەروەها بەهۆی لەدەستدانی چێژە سەرەکی و بنەڕەتییەکە زۆر هەست بەناڕەحەتی ناکەن.

هەروەها لەوانەیە کەموکوڕی لەفێرکردندا دەرەنجامی خراپی هەبێت کاتێك مندالّێك لە رووی چوونە ئاودەستەوە هەر بەئازادی بمێنێتەوە لەوانەیە بۆ ماوەیەکی دوور درێژە بە خۆتەڕکردن و پیسکردنی خۆی بدات. هەلّبەتە لەوانەیە ئەم کارە بەلای مندالّەوە ئاسایی بێت، بەلاّم چێژی راستەقینەی چوونە ئاودەست لەدەست دەدات. کاتێك مندالّێك بۆ بەڕێوەبردنی خۆی ئامادەیی وەدەست دەهێنێ، دەبێت بەوپەڕی راشکاوی و خۆشەویستییەوە داواکارییەکەی خۆمانی بەگوێچکەدا بچرپێنین ، بۆ نموونە ئاوای پێبلّێین: (تائەو کاتەی زۆر بچووك بوویت قەیدی نەبوو، چێژت لەگەرمیی خۆپیسکردن و خۆتەڕکردنی نێو پێخەفت وەردەگرت، بەلاّم ئیدی حەزناکەین درێژە بەم کارە بدەیت, ئێستا حەزدەکەین بچیتە ئاودەست).

لەیەکەمین سالّەکانی فێرکردن و بەتایبەت لەپاککردنەوەو بەکارهێنانی پێوەری گەرمیدا دەبێت زۆر بەئاگادارییەوە مامەلّە لەگەلّ مندالّدا بکەین و هەولّبدەین ئازار بەمندالّ نەگات دەنا لەوانەیە رێگاو هەلومەرجی نوێ ترس لە دەروونی مندالّدا پەیدا

بکات و لەپەیوەندییە سێکسییەکانی سەردەمی پێگەیشتندا شوێنەوارێکی ناپەسند و نەخوازراو بەجێبهێڵێت. هەروەها کاتێك لە(سمت)ی منداڵ دەدرێت دەبێت ئەوپەڕی ئاگاداری بەکاربێت، چونکە لەوانەیە شوێنەوارێکی ناپەسند لەپەروەردەکردنی سێکسیی منداڵدا بەجێبهێڵێت، رەنگە منداڵ بەهۆی نزیکیی ئەندامەکانییەوە لەکاتی لێدانخواردندا بۆ زەمینەو پێشینەکانی چێژوەرگرتنی سێکسی بەدوای ئازاردا بگەڕێت. زۆرن ئەو ژن و مێردانەی کە بەر لە بەسەربردنی شەوێکی نەشئەبەخش پێویستیان بە شەڕو کێشەو لێدان و کوتانێکی راستەقینە هەیە.

## چێژە سێکسییەکان:

کاتێك منداڵ بەرە بەرە لەرووی جەستەیی و سۆزییەوە پەروەردەکراو گەشەیکرد، لەدەوروبەری ئامێری زاوزێدا زیاتر چێژ لە جەستەی وەردەگرێت. لێرەشدا دەبێت ئێمە بەتەواوی منداڵەکە لە هەستکردن بە چێژە جەستەییەکان ئازادو سەربەست بکەین. لەراستیدا دەبێت گرینگی بەم خاڵە بدەین کەمنداڵ لە رووی سێکسیەوە پێویستییەکی زۆری بەرێنمایی ئێمە هەیە، ودەبێت دڵنیایی پەیدا بکات کە هەستکردنە جەستەییە ئاساییەکان لەرووی سۆزەوە بەهیچ شێوەیەك زیانبەخش نین.

کاتێك کەکچێکی بچووك بە کلیتۆدیسی خۆی دەزانێت کە(چێژ بەخشترین) جێگای لەشی ئەوە نارەزایی لەبەرانبەر دایکی پیشان دەدات، دەبێت دایك بە ئاستێکی پێویست و تەواو تێبگات و درکی ناوەکی وهۆشیاریی هەبێت و بڕوادار بێت کە بەسەریدا نەقیژێنێت:(نابێت دەست لەم شوێنە بدەیت) بەپێچەوانەوە بۆئەوەی منداڵەکە بەشێوەیەکی ئاسایی پەروەردە بکرێت وگەشەبکات وهەست بەئاساییترین چێژی ئەندامەکانی زاوزێی خۆی بکات، دەبێت دایکەکە لەبەرانبەر ئەم مەسەلەیە لە دڵەوە شادوومان وخۆشحاڵ بێت. نەك منداڵەکە لەرێگای دەم وپاشکۆیدا هەست بە چێژ وخۆشی بکات.

## جیاوازییە سێکسییەکان:

منداڵان جیاوازییە سێکسییەکان وەکو شتێکی سەلمێنراو و بڕیار لەسەردراوی دابینکراو نازانن، تا ماوەیەکی دوورو درێژ جیاوازیی نێوان ئافرەت و

پیاو بۆ ئەوان بەشێکە لە نهێنییەکان و بۆ روونکردنەوەو تێگەیشتنی ئەم جیاوازییانە لەجیهانی خەیاڵدا هۆکاری سەیر و سەمەرە دادەتاشن, هەر چەندە بمانەوێت بە راشکاوی وهاوڕێیانەوە لە چۆنییەتیی ئەم جیاوازییانە ئاگاداریان بکەینەوە، هەر بروایان وایە و دووپاتیشی دەکەنەوە کە هەرمرۆڤێك ئامێری زاوزێی پیاوانەی هەیە. ڕەنگە کچێك وا خەیاڵبکات کە ئامێرە پیاوانەکەی بزر بووە یان بەهۆی هۆشداری و ئاگادارکردنەوەوە لە دەستی چووە و بڕوای وایە کاتێك خوورەوشتی خۆی چاك بکاتەوە یان کەمێك گەورەتر بێت دووبارە ئامێرەکەی گەشە دەکاتەوە. ڕەنگە بە هەمان شێوە کوڕێك بە ترسەوە دەرەنجامێکی وەها وەدەستبهێنێت کە هەرکاتێك ئامێری نێرینەی خۆی لەدەست بدات ئەویش گرفتاری هەمان چارەنووس بێت. نابێت دایك و باوکان بەم ترسانەی مندال پێبکەنن و لە پایەی خەیاڵاتە منداڵیی و بیری پڕوپووچی دابنێن و بەقاقاو پێکەنینەوە بۆ خەڵکانی دیکە باسی بکەن. بەپێچەوانەوە ئەم جۆرە نیگەرانیانە شایانی گرینگی پێدان و ئاوڕ لێدانەوەیەکی تەواون و دەبێت بۆلابردنی, بیر لە چارەسەر بکرێتەوە. دەبێت ئێمە هەمیشە منداڵان والێبکەین ڕاو بۆچوون و خەیاڵەکانی خۆیان دەربارەی جیاوازیی سێکسی باسبکەن. بۆ نموونە دەتوانین ئاوا بە کچەکەی خۆمان بڵێین: (هەندێك کات کچان نیگەرانن چونکە دەبینن ئامێری نێرینەیان نییە, ئایا تۆش هەندێك کات لەم بارەیەوە تووشی سەرسوڕمان دەبیت؟), یان دەتوانین ئاوا بەکوڕێك بڵێین: (هەندێك کات کوڕان تووشی سەرسووڕمان دەبن، چونکە دەبینن کچان ئامێری پیاوانیان نییە, ئایا تۆش هەندێك کات لەم بارەیەوە بیردەکەیتەوە؟ هەندێك کات کوڕان وا خەیاڵدەکەن کە چ پێشهاتێك بەسەر کچان دێت بەسەر ئەوانیش دێت لە کاتێکدا وانییە لەبەرئەوەی، کوڕ و کچ جیاوازییان لەگەڵ یەکتریدا هەیەو شێوەی دروستبوونیان بەتەواوی جیاوازە. بە هەمان ئاراستەش کوڕان دەبنە باوك وکچانیش دەبنە دایك).

هەندێك لە دایك و باوکان هەوڵدەدەن بەبێبەها کردن و بچووکردنەوەی جیاوازیی نێوان دوو رەگەز نیگەرانیی کچە بچووکەکان لابەرن و, لەوانەیە ئاوا بەکچێك بڵێن:(براکەت لە هەموو روویەکەوە بە تۆ دەچێت تەنیا ئەو ئامێرێکی بچکۆڵەی

هەیە، لەبەر ئەوە بەبیّ هۆ مەگری!) تەنانەت دایکێکی دیکە پێشنیاری کردبوو (بەگلە سوورەو قوڕە سوور) ئامێرێکی پیاوانە بۆ کچەکەی دروست بکات، بیّ ئاگا لەوەی کە بەم ڕێگا چارەیەوە لەئایندەدا چەندین گرفتی جۆراو جۆری بۆ دروست دەکات.

کاتێك منداڵێك بۆی ڕوون دەبێتەوە کەوا لە ڕووی لەشناسییەوە لەنێوان کوڕ و کچدا جیاوازیی هەیە، باشتر وایە لەجیات بیّ بەهاکردن و بچوککردنەوەی ئەم جیاوازییانە زیاتر و زیاتر گرینگیی ئەم جیاوازییانە بۆ منداڵ دووپات بکەینەوە،بۆ نموونە بۆی ڕافە بکەین کە:(زۆر ڕاستە، جیاوازییەکی گەورە لەنێوان کوڕو کچدا هەیە، تۆ ئامێری پیاوانەت هەیە بۆیە کوڕیت کاتێك کە گەورە بوویت دەبیتە باوك).

هەروەها دەبێت ئاواش بەکچان بڵێین: (تۆ کچیت و ئامێری ئافرەتانەت هەیە، کاتێك کە گەورەبوویت دەبیتە دایك، خۆشحاڵم کەدەزانیت و بۆت ڕوونبۆتەوە کەکچان بەشێوەیەك و کوڕانیش بەشێوەیەکی دیکە دروستکراون).

دەبێت لەم بارەیەوە ڕاو گوزارشتەکانمان بە تەواوی ڕۆشن و دەستنیشانکەربن بەشێوەیەك جڵەو گیری لەهەر جۆرە هەڵەو خەیاڵبلاّوی و لاساییکردنەوەو هاوشێوەیی سێکسی بکات.

## وەڵامدانەوەی پرسیارەکان:

ئامۆژگارێکی نویّ بۆ یەکەمین وتاردانی خۆی لەهەوای ئازاددا هاتە گوندێك، بەلاّم جگە لە گاوانێك زیاتر گوێگرێکی دیکەی نەدۆزییەوە، لەبەر ئەوە لەگەڵ ئەو تاکە گوێگرەدا پرسوڕایکردو، گوتی: ئایا ئەوەندە دەهێنیّ زەحمەت بکێشێت لەپێناو وتاردانێکی پڕ لە ئامۆژگاری بۆ تاکەکەسێك خۆی ماندوو بکات ؟ گاوان لەوەلاّمدا پێیگوت: (ناتوانم لەم بارەیەوە ڕای خۆم بدەم، چونکە لە گاوانێك زیاتر هیچی دیکە نیم، بەلاّم تەنیا دەتوانم ئەوەت پێبڵێم کە هەرکاتێك من بۆ ئالیك دانی گایەکانم دەهاتمە ئێرە و تەنیا گایەکەم دەدۆزییەوە زۆر ناڕەحەت دەبووم ئەگەر ئالیکم نەدابوایە.) ئامۆژگار سوپاسی کردوو وتارێکی زۆر دوورودرێژی بۆدا کە پێشتر ئامادەی کردبوو. کاتێك وتاری ئامۆژگارەکە کۆتایی هات لەگاوانەکەی پرسی ئایا

شتێکی لەم وتارە هەڵکڕاند یان نا؟ گاوان لەوەڵامدا گوتی: (ناتوانم لەم بارەیەوە راوبۆچوونی خۆم دەربڕم، چونکە دەربارەی وتاردان زانیارییەکی تەواوم نییە و تەنیا گاوانێکم، وەلێ کاتێك بۆ ئالیکدانی گایەکان دەهاتمە ئێرە و تەنیا یەك گام بەرچاو دەکەوت هەرگیز گشت ئالیکەکەم دەرخواردی تاکە گایەك نەدەدا).

بەپێچەوانەوەی ئەم وتاربێژە نابێت دەربارەی روونکردنەوەی پێکهاتەی سێکسی لەماوەیەکی کەمدا پەلە بکەین و هەمووشتێك بۆ منداڵ روونکەینەوەو لە زانیاری بەخشیندا پەلە بکەین. لەهەمان کاتیشدا هیچ بیانوویەك نییە بۆ ئەوەی بەوپەڕی راشکاوی و راستگۆییەوە وەڵامی پرسیارەکانی منداڵ نەدەینەوە، هیچ پێویست ناکات وانەیەکی دووردرێژی مامانیی بڵێینەوە. دەبێت وەڵامی ئێمە بۆ پرسیارە سێکسییەکان کورت و بەسوود بێت و لەیەك دوورستە زیاتر تێنەپەڕێنێت نەك درێژدادڕیی تێدا بکەین و شێرو رێویی بۆ بهێنینەوە. تەمەنی گونجاو بۆ زانیاریبەخشین و ئاگادار کردنەوەی منداڵان دەربارەی مەسەلە سێکسییەکان ئەوکاتەیە کەپرسیار دەربارەی ئەم مەسەلانە بکەن. کاتێك کوڕێژگەیەکی بچووکی دووساڵە یان سێ ساڵە ئاماژە بەئامێری زاوزێی خۆی دەکات و دەپرسێت : (ئەمانە چین؟) دەبێ بە شێوەیەکی دروست بڵێین :(ئەمانە ئامێری پیاوانەی تۆن), لەوانەیە منداڵان بەچاولێکەریی گەورە ساڵان ناوی ئەم ئامێرانە بەناوە باوەکانی دیکەی بخوێننەوە کە بۆ تەمەن بچووکەکان ئاسایی و باوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەبێت دایك و باوك ناوی راستەقینەی ئامێرەکان بەمنداڵان بڵێن.

کاتێك منداڵ دەپرسێت منداڵ لەکوێوە دێت؟ نابێت لەوەڵامدا پێی بڵێین لەکیسەی دکتۆر یان لەنەخۆشخانە یان لەفرۆشگا یان لەبەڕێوبەرایەتیی پۆستە دێت، دەبێت پێی بڵێین کە: (لەجێگایەکی تایبەتیدا لەناوەوەی دایکدا گەشە دەکات و دروست دەبێت.) دەربارەی ئەوەی کە ئایا پێویستە بەراشکاوییەوە پێیبگوترێت: کە (ئەم شوێنە تایبەتییە منداڵدانی دایکە) لەم بارو کاتانەدا دەبێت پرسیارەکانی دیکەی منداڵ لە بەرچاو بگیرێن.

هەروەها بەشێوەیەکی گشتی دەبێت لەسەرەتای دەستپێکردنی کۆرپەییەوە منداڵان ناوو ئەرکی ئامێری زاوزێی خۆیان و جیاوازیی شیکاری و پێکهاتەی نێوان

دوو ڕەگەزی جیاواز بزانن. نابێت بۆ زانیاریبەخشین و ئاشنابوون بە مەسەلە سێکسییەکان گۆگیاو ئاژەڵ بەنموونە بهێنرێنەوە. دەبێت خۆمان لەم مەسەلەیە بەدووربخەینەوە کە (سلمافرێبێرگ) (SELMA FRAIBERK) لەچیرۆکی (فیلی کشتوکاڵی) باسیدەکات. ئەویش چیرۆکی منداڵێکی بچووکە کە لەکاتی منداڵبوونی دایکیدا نێردراوەتە تەویلەیەك تاکوو چۆنیەتیی هاتنە دونیای گوێرەکەیەك و دواتریش منداڵبوونی دایکی بۆ ڕوونبێتەوە. لەکاتی گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە بەباوکی دەڵێت: بابەگیان! لە هەمووشتێك گەیشتم تەنیا پێم بڵێ بزانم جوانەگایەکە هاتە لای دایکم یان دایکم چووەلای جوانەگاکە).

هەمیشە دوو مەسەلە جێگای تێبینیی گشت منداڵانن: (چۆن منداڵ دروست دەبێت وچۆن زارسك دێتە سەر دونیاوە؟!) پێش ئەوەی وەڵامی ئەم دووپرسیارە بدەینەوە, باشترە زانیاری وئاگاداریمان لەسەر خەیاڵکردنی منداڵ هەبێت دەربارەی شێوەی دروستبوون ولەدایکبوونی منداڵ. ئەو بەگشتی لەم وەڵامانە پشتبە خواردن و وەدیهێنانی پێویستییەکان دەبەستێت. کورێژگەیەکی بچکۆڵەی هۆشمەند خەیاڵکردنی خۆی بەم شێوەیە ڕاڤە کرد: (منداڵی باش لەخۆراکی باشەوە دروست دەبێت, ئەوان لەسکی دایکدا گەشە دەکەن و لەژێرەوەی سکی دایکەوە دێنەدەرێ).

دەبێت ڕوونکردنەوەکانی ئێمە ڕاست و دروست بن. وەلێ هیچ پێویست بەوە ناکات تەواوی پرۆسەی سێکس بۆمنداڵ ڕاڤە بکەین. ئەوەندە بەسە کەپێی پیشان بدەین و بۆی ڕوونبکەینەوە کە: (کاتێك دایکێك و باوکێك دەیانەوێت ببنەخاوەنی منداڵ، خانەیەکی لەشی باوك بەخانەیەکی لەشی دایك دەبەسترێت ودەست بە گەشەکردن دەکات , کاتێك بەپێی پێویست گەورە بوو لە ئەندامی زاوزێی دایك دێتە دەرێ. هەندێك کات منداڵ دەپرسێت کاتێك منداڵ لە ناوەوە دێتە دەرێ ئەی پێشتر لە کوێ بووە؟ باشترە مۆڵەتی پێنەدەین تا ئەم ئاستە دەست لە بەشە وردەکانی کردەکە وەربدات و بێتە ناویەوە. بە پێچەوانەوە دەتوانرێت بە وێنەی مرۆڤێك یان سوود وەرگرتن لە بووکۆڵەیەك شوێنی هاتنەدەرەوەی منداڵی پێ پیشان بدرێ.

لەوانەیە وەڵامەکانی ئێمە بۆ ماوەیەکی کورت بڕوا بەمنداڵ بهێنێت. لەوانەیە پاش ماوەیەکی کەم و بەزیادکردنی چەند ڕوونکردنەوەیەکی دیکەوە بگەڕێتەوە سەر

پرسیارەکە. هەرکاتێك مندالْ سەر لەنویْ بپرسێت:(مندالْ چۆن دێتە سەر دونیا؟) ئێمە ناتوانین وەلآمێکی کاملْترو چڕوپڕتری بدەینەوە، بۆنموونە ناتوانین بۆی روونبکەینەوە: (باوك لەلەشی دایك دەست بەدروستکردنی مندالْ دەکات. شلەیەك بەناوی سپێرم کەخانەی زۆر بچووکی گەردیلەیی لە خۆ گرتووەو لەلەشی باوك دێتە دەریْ و دەچێتە لەشی دایکەوەو یەکێك لەم خانانە لەگەلْ هێلکەی دایك بەیەکدەگەن و، بە بەیەکگەیشتنی ئەم دوو خانەیەش مندالْ دروست دەبێت).

لەوانەیە پرسیاری دواتری مندالْ ئەو پرسیارە بێت کە بەگشتی دایکان و باوکان کاتێك گوێیان لێدەبێت هەست بەناڕەحەتی دەکەن: (چۆن چۆنی خانەی باوك دەچێتە لەشی دایکەوە), لێرەدا دەبێت سەر لەنویْ لەسەر خەیالْی خودی مندالْەکە داوای لێکدانەوەو روونکردنەوەو پرسیارمان هەبێت. دوور نییە کە گریمانەکانی (تۆدان)مان لەزمانی مندالْەکەوە گویْ لێبێت و لەسەر ئەم بناغەیەشەوە لەوانەیە بپرسێت: (بابە تۆیەك لەلەشی دایەدا دەچێنیْ), یان گریمانەی تۆ خواردن بەنموونە بهێنێتەوەو پیشانی بدات کە: (بابە بە دایە دەلْێت ناوکی میوەیەك قووت بدات، یان یان لەفەلسەفەی رواندنی گولْ ئیلهام وەربگرێت و بلْێت: (بابە ئەو تۆیە دەباتە لەشی دایکەوە کە مندالْی لیْ دروست دەبێت) یان قسە لەسەر پرۆسەی نەشتەرگەری دەکات: (دکتۆر بە نەشتەرگەری تۆیەك لەلەشی دایکدا دەچێنێت), لەم جۆرە هەلومەرجەدا دەتوانرێت بەشێوەیەکی کورت وەلآمی پرسیارەکانی مندالْ بدرێتەوە: (تۆو لەئامێری پیاوانەی باوکدا دێتە دەرەوەو دەچێتە ئامێری سێکسیی دایکەوە.) لەم کاتەدا زۆر بەجێیە جیاوازیی نێوان سپێرم و میز بۆ مندالْ راڤە بکرێت: (میز پاشماوە پیسەکانی لەشە لە کاتێکدا سپێرم شلەیەکەو خانەی گیاندارە وردە گەردیلەییەکان لەخۆدەگرێت.)

لەوانەیە پرسیاری دواتری مندالْ بەم شێوەیە بێت: (چ کاتێك تۆو بابە مندالْ دروست دەکەن؟) بەپێچەوانەی خەیالْکردن و بیروڕای دایك و باوکان, ئەم پرسیارە ئەوەندە قێزەون و ناپەسەند نییەو دەتوانرێت وەلآمێکی کورتتری بدرێتەوە: (دایك و باوك بۆ ئەم کارە کاتێکی ئارامی وەها هەلْدەبژێرن کە بەتەواوی تەنیابن. ئەوان کەیەکتریان خۆشبوێت حەزدەکەن ببنەخاوەنی مندالْ وهەردووکیان سۆزو خۆشەویستی

پێببەخشن.) لەوانەیە پێویست بێت ئەمەشی بۆزیادبکرێت کە: (کەجووتبوون شتێکی کەسی و تایبەتییە.) هەندێك کوڕ حەز دەکەن باوکانیش بتوانن منداڵیان ببێت لەبەر ئەوە ئەم پرسیارە دەکەن: (بۆچی تۆی دایك ناچێتە نێولەشی باوکەوە؟) دەبێت ئەم پرسیارە بەشێوەیەکی وەها وەڵام بدرێتەوەو بە جوانی روون بکرێتەوە کەلەشی دایك شوێنێکی هەیە ناوی (منداڵدانە) کەتیایدا منداڵ دەتوانێت گەشە بکات ,بەڵام لەشی باوك ئەم شوێنەی نییە. منداڵ دەپرسێت: (بۆ؟) دەبێت وەڵامی بدرێتەوە: (چونکە پێکهاتەی لەشی پیاو و ژن جیاوازە.

پێویستە دڵنیایی پێببەخشرێت کە منداڵ جگە لە دایك پێویستی بە باوکێك هەیە تاکو سۆز و خۆشەویستیی پێببەخشێت و پارێزگاری لێبکات.

لەشی رووت:

زۆرن ئەو ماڵانەی کە هەر بەئۆردوگای رووتەکان دەمێننەوە، باوکان ومنداڵانی رووت وقووت لەو بەهەشتەی کە وەك ئادەم وحەوا بۆ خۆیان دروستیانکردووە تێك وەردێن ,لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەو منداڵانەی کە لەکەشوهەوایەکی ئاوادا گەشەدەکەن و پەروەردە دەکرێن، لە نیگەرانی و هەستکردن بە کەموکوڕی دەربارەی لەشی مرۆڤ پارێزراو نین، چونکە بینین و تەماشاکردنی راستەوخۆ نەك تەنیا لەوانەیە هەستی پشکنین و گەڕان تێرنەکات بەڵکو بەپێچەوانەوە ڕەنگە هەندێك ئارەزوو وهەوەسی وەها زیاتر و زیاتر بجولێنێت کە هەرگیز پەسندو کردەیی نییە.

(بیتسی BETSY) کە کچێکی (٤) ساڵانە رێگای پێ درا لەگەڵ باوکی خۆی بشوات.ئەوچێژی لەبینینی لەشی رووتی باوکی وەردەگرت وستایشی خۆشئەندامیی ئەوی دەکرد، بەڵام جارێك هەوەسی هێنا دەست لە ئامێری پیاوانەی باوکی بدات، باوکی بەتەواوی ئازادیخوازیی فەرامۆ شکردوو دەستی کچەکەی بۆ پشتەوە پاڵ پێوەنا. لە قۆناغی شیرە خۆریدا دیمەن و دەست لێدان لەمەمکی رووتی دایك، ئارەزووی مژینی دەجولێنێت ودەتوانرێت بە ئاسانی ئەم ئارەزووە تێربکرێت، بەڵام لەو قۆناغانەی کە منداڵ بەتەمەنترە. لەوانەیە دیمەنی رووتی لەشی دایك یان باوك ئارەزووی سێکسی و ئامێری زاوزێی منداڵ بجولێنێت کەهەرگیز لەو تەمەنە

بچووکەدا ناتوانرێت تێر بکرێت. کەواتە لەم بارودۆخەدا دەبێت ئەنجامێکی وەها بەدەست بهێنین کە باشترە بگەڕێینەوە سەر (دوور کەوتنەوە لەهەوەس و پاکدامێن پەرستی)ی سەردەمی (ڤیکتۆریا) یان نا؟ نابێت لە داپۆشینی شوێنە شەرمهێنەکانی وەك ئەندامی سێکس و هتد زێدەڕۆیی بکەین، بەڵکو تەنیا دەبێت، چ بۆ دڵنیایی و حەسانەوەی خۆمان و چ بۆ ئارامیی ڕۆڵەکانمان ئاگامان لە لەشی رووتی خۆمان بێت و چاودێریی بکەین. دەکرێت مۆڵەت بە منداڵانمان بدەین لەکاتی خۆشوشتن و جلوبەرگ پۆشینی خۆماندا و لەکاتە پێویستەکاندا بێنە نێو گەرماوەوە، بەڵام نابێ بە هیچ جۆرێك ستایشی ئەو ئازادییە بکەین و منداڵان لەسەر ئەم هاتنە ژوورەوەیە هان بدەین. بەتایبەت دەبێت چاودێرو ئاگاداری ئەو شتە بین کە منداڵانمان وا نەزانن کە حەزدەکەین ئەندامەکانی لەشمان بپشکنن و ببینن. کاتێك خۆمان دەدەینە بەر تیشکی خۆر یان بە رووتی وەرزش دەکەین ومنداڵان مۆڵەت وەردەگرن لەوێدا ئامادەبن، ڕەنگە واخەیاڵبکەن کە هەرتەنیا بۆ هاتنە ئەم شوێنە مۆڵەتیان پێنەدراوە، بەڵکو چاوەڕوانیی ئەوەشیان لێدەکەین بۆ رازیکردنی ئێمە کارێك ئەنجام بدەن, لەبەر ئەوە دەورووژێن و نارەحەت دەبن و لە جیهانی خەیاڵدا دەست بەئەنجامدانی چەند کارێکی خەندەهێن دەکەن, ئێمە ئەوە بە دروست دەزانین کە منداڵان دەربارەی لەشی مرۆڤ حەزێکی توندیان بۆ پشکنین هەیە. ئەوان جیاوازیی نێوان کوڕێکی بچووك وکچێکی بچووك دەکەن. ماوە ماوە تەماشای لەشی ئێمەش دەکەن, بەڵام هەمیشە تینووی ئەوەن کەزیاتر تەماشای لەشی ئێمە بکەن, دەبێت زانیاریمان لەسەر حەزی پشکنینی ئەواندا هەبێت و، لەشی رووتی خۆمان زۆر بەوان پیشان نەدەین, دەتوانین ئاوا بەمنداڵ بڵێین: (تۆ حەزدەکەیت ببینیت لەشی من چۆنە، وەلێ دەمەوێت لەگەرماودا تەنیابم بۆ تۆ ئەوە راڤە دەکەم کە گەورە ساڵان چۆنن، ئەوەندە بەسە تۆ پرسیار بکەیت و منیش وەڵامت بدەمەوە.) ئەم جۆرە مامەڵەیە، حەزی پشکنینی منداڵ جڵەوگیردەکات و زیانیشی پێناگەیەنێت، بەڵکو تەنیا ئەم حەزی پشکنینە دەخاتە ڕێرەوێکی دروستترو سەلامەتر. بەمشێوەیە لەجیات ئەوەی حەزی پشکنین بەنیگارکردن و دەست لێدان بەدیاربخرێت بەقسە پیشان دەدرێت.

## پێخەف و و ژووری نوستن،

بەهیچ شێوەیەك خەوتنی منداڵ لەیەك پێخەف و لەسەر یەك سیسەم و لە کەنار دایك و باوك پێویست و پەسندنییە. منداڵان زیاتر لەوەی کە ئێمە بیری لێدەکەینەوە ،توانای بینین و بیستنیان هەیە. بەو گریمانەیەی کە ئەوان لەوشتانە ناگەن کە لەدەورو بەریاندا روودەدات، بەڵام دیمەن و دەنگەکان لەزەینیان نەخش دەبەستێت و لەوانەیە لەشێوەی ترس و مۆتەکە بەدیار بکەوێت.مەترسیی ئەم غافڵییە زۆر روونە بەومانایەی کەمنداڵان تەنانەت لەو هەلومەرجانەی کە بەراستی کەڕو کوێرن یان بەقەستی خەولە خۆیان بخەن، هەرگیز نە نابینان ونە کەڕو کوێریشن.

بەزۆری و بەشێوەیەکی گشتی خانوو و ماڵەکانی ئێمە دژی سێکسن, بەومانایەی کەکەمتر لەخانوو و ئاپارتمانە نوێیەکاندا بۆ بەتەنیابوونی ژنومێرد شوێنێکی لەبارو چۆڵ و ئارامی تێدانییە، دیوارەکان باریك و تەنکن منداڵان هەمیشە لە دایکان و باوکانیان نزیکن، هەر بۆ لایەنی شارستانییەتمان ئەوەندە جێگای شانازی نییە کە دەنگی عەشق و کاتی تێکەڵ بوون زیاترو زیاتر کورتترو کپتر بکرێتەوە.

## خەیاڵی ئومێدبەر

لەژیانی هەرکوڕ و کچێکی بچکۆلە داو لەتەمەنی نێوان ٣ــ ٥ ساڵیدا کاتێك دێتە پێشی کەوا حەزدەکەن دایکیان بەردەوام وابەستەیان بێت. دایك یەکەمین خۆشەویستیی ئەوەو بەهیچ شێوەیەك ئامادە نییە کەسێکی دیکە عەشقی پێببەخشێت. هەروەها کچیش لەدڵەوە داواکاری خۆشەویستیی باوکەو لەتایبتکردنی ئەم خۆشەویستییە ئەوەندە سەختگیرە کەهیچ هاوبەشێك و رکابەرێك قەبوڵ ناکات. دەبێت بەتەواوی ئاگاداری ئەوەبین کە ئەم خۆشەویستییە ئومێدبەرە بەقسەو جوولە هان نەدرێت وستایش نەکرێت و نەوروژێنرێت. تەنانەت نابێت دایکێکی ئاقڵ و رۆشنبیر بەگاڵتەش بانگی کوڕە بچووکەکەی خۆی بە (پیاوە بەهێزە کەی من! یان ئازیزە بچکۆلەکەم بانگ بکات).نابێت باوکیش بە (دولبەر) بانگی کچەکەی بکات. ئەمانە راست ئەو دەورانەن کەمنداڵان حەزدەکەن بە درێژایی تەمەنیان بیگێڕن، لەکاتێکدا دەبێت هەرچی زووترە لە گێڕانی ئەم رۆڵانە بەدوور

بخرێنەوە. ئێمە نابێت بەهاندان و وروژاندنی ئەوان بۆ درێژەدان بەخەیاڵكردنە نومێدبەر و ئەنجام قەبوڵنەكەرەكان ئێش و ئازارو غەمورەنجانیان زیاتر بكەین، میهرەبانیی لەسنوور بەدەری دایك و باوك و دایەنەكان و رەفتاری وەك ماچكردنی دەم و لێوی منداڵ و نەوازشكردنی ئامێرە سێكسییەكانی، بۆمنداڵان ئاساییە، بەڵام لەجیات خۆشحاڵی وشادومانی هەستكردن بەگوناهكاری لە دەروونی منداڵە كەدا دروست دەكات وروژاندنە سێكسییەكانی منداڵ لەلایەن دایك و باوكەوە جانەگەر بەقسەكردن یان بەنەوازشكردنی جەستەیی ئەنجام بدرێت, یاسای سەلمێنراو ئەوەیە كەلەرووی سێكسییەوە منداڵ وابەستەی دایك و باوك دەكات و نایەڵێت رەمەكی سێكس و خۆشەویستی لەمنداڵەكەدا بەشێوەیەكی ئاسایی گەشە بكات.

## دەستپەڕ:

لەوانەیە لەسەردەمی منداڵیدا دەستپەڕ ببێتە مایەی ئارامیی منداڵان، بەڵام بەبێگومان ناڕەحەتی ئەندێشەو كێشمەكێشی زەینی بۆ دایكان و باوكان دروست دەكات.

لەوانەیە منداڵان بەپەنابردنە بەر دەستپەڕ لەكاتی تەنیاییدا چێژ لەبوونی خۆیان وەربگرن و لەكاتەكانی بێكاری و دەستبەتاڵیدا لەبێزاری دەرباز بن و لە هەمبەر ناڕەزایی خەڵكانی دیكە دڵخۆشی و خەیاڵ ئاسوودەیی وەدەست بهێنن.

بەپێچەوانەوە بۆ دایكان و باوكان مایەی دوودڵی و نیگەرانی دەبێت، دیمەنی ئەو منداڵە (٥) ساڵەیەی كە لە بەرچاوی خەڵكی لادەچێت و لەشوێنێكی چۆڵدا گەمە بەئامێری زاوزێی خۆی دەكات بۆ نوێخوازترین دایك مایەی شەرمەزاری و ناڕەحەتیی خەیاڵە.

دایكان و باوكانی ئەم رۆژگارە چەندین جار گوێیان لێبووەو خوێندوویانەتەوە بەتاقیكردنەوەش ئەوەیان بۆیان سەلمێنراوە كە دەستپەڕ هیچ جۆرە مەترسییەكی نییەو بەهیچ جۆرێك و بەپێچەوانەی راو بۆچوونەكان نابێتە هۆی شێتی و نەزۆكی و بێ توانایی سێكسی و دەیە ها بەلای دیكە كە چەندین سەردەمە خراوەتە پاڵ ئەم پرۆسەیەوە، بەڵام هەمان ئەم دڵنیاكردنەوانەش مایەی نیگەرانین بەجۆرێك كە هیچ

کەس بە ویستی خۆی خۆراکێك ناکرێت کەپێی بڵێن چەند جۆرە ژارێکی تێدایە یان بڕوا بەوکەسە ناکات کەپێی بگوترێت کە چەند تاوانێکی کردووە.
لەرووی ئاقڵانییەتەوە دایك وباوك بەراستی دەزانن کە لەوانەیە دەستپەڕ بەقۆناغێکی پەروەردەیی حەزی سێکسیی منداڵ بژمێردرێت، بەڵام لەرووی سۆزییەوە بەم ئاماژەو بەڵگەیە رازی نابن, لەوانەیە بتوانرێت بگوترێت کە نارەزایی ئەوان لەسەر دەستپەڕ تاڕاستێکی زۆر بەجێیە. روونکردنەوەیەك هەیە دەڵێت چێژی خود لە خود دەبێتە هۆی ئەوەی کە منداڵ کەمتر بچێتە ژێر دەسەڵاتی دایك و باوك و مامۆستایانی خۆی, کاتێك خووی بەم چێژو خۆشییە کورتەوە گرت، بۆ چێژ وەرگرتن جگە لە خۆی پەنا بۆ کەسی دیکەی نابات و بەبێ هەوڵێکی زۆر و بەبێ یارمەتی وەرگرتن لە خەڵکانی دیکە جیهان و چێژەکانی لەژێر دەستی خۆیدا دەبینێتەوە ئەم گوتەیەی کە دەڵێت: (دەستپەڕ دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵ کەمتر سەروکاری لەگەڵ کەسانی سەرنجراکێشدا هەبێت) لەهەموو روویەکەوە دروستە .لەوانەیە خوگرتنی منداڵ بەدەستپەڕ بۆ چاککردنەوەو راستکردنەوەی کارە ناپەسندو شکستەکانی ببێتە دڵدانەوەو سەرگەرمی ودڵخۆشییەکی وا کە بەئاسانی دەستی پێبگات وبەوپەڕی سادەییەوە جێگرەوەی کۆشش و هەنگاوە ئەرێنیەکانی بێت.
چوونی منداڵان بۆ نێو دونیای شارستانی پەیوەندی بەوە هەیە کە لەبەرانبەر ئەو چێژانەدا چاو بپۆشێت کەوا لەدەستپەڕ پایەدارترن. ئەم چێژە پایەدارانە لەقۆناغی یەکەمدا لەنێو رۆشنایی سۆز ومیهری دایك و باوك و لەقۆناغی دووەمیشدا لەسایەی رەزامەندیی کۆمەڵگاوە دێتەدی, خۆشەویستی وچاودێریی دایك و باوك نەك تەنیا پێویستییەکانی منداڵان دەهێنێتەدی، بەڵکو بۆ خۆشەویستی و رەزامەندیی کۆمەڵگا چەند نیاز وپێویستییەکی نوێ لەدەروونی ئەواندا دەهێنێتە دی.
لەبەرئەوە کە منداڵان تامی خۆشەویستی بچێژن لەتەواوی سۆز و میهرو خۆشەویستیی زیاتری خانەوادە بە ئاسانییەکی زیاترەوە حەزدەکەن رەوشت و رەفتاری خۆیان بگۆڕن.
لەوانەیە دایکان و باوکان تا ئاستێك فشاربخەنە سەر منداڵ بۆ ئەوەی واز لە دەستپەڕ بهێنێت، هەڵبەتە نەك بۆ ئەوەی ئەم خووە لەرووی تەندروستییەوە

زیانبەخشە، بەڵکومەترسییان لەوە هەیە و بۆ ئەوەیە کەپەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان و گەشەکردن و پەروەردەی کەسایەتییان تووشی گیروگرفت دەکات، بەڵام دەبێت ئەو فشارە زۆر بەگونجاوی و لۆژیکییەوە بەڕێوە بچێت ئەگەرنا دەبێتە هۆی پەیداکردنی کێشمەکێشی توند.

ڕێگاچارەی ئەم مەسەلەیە بریتییە لەوەی کەهەرلەسەرەتای بەدیارکەوتنی منداڵەوە سۆزو میهرو خۆشەویستی پێببەخشین و، بەهۆی سەرچاوەو کانیاوەکانی خۆشەویستی و دۆستایەتیی راستەقینەوە دڵی منداڵ بەجۆرێك سەرمەست بکەین کە بۆی روونبێتەوەو درك بەوەبکات کەدەستپەڕ تاکە هۆکاری چێژ وەرگرتن و شادومانی ئەونییە, دەبێت چێژە رەسەن و بنەڕەتییەکان لەپەیوەندیی کەسی و هەنگاوە شایستەکانی گرینگپێدانییەوە وەدیبێت ,کاتێك مامەڵەکان وابن دەستپەڕ نابێتە هۆی دروستکردنی کێشەی دژوار، بەڵکو وەکو ڕێگا چارەیەکی دیکەخۆی دەنوێنێت.

## گەمە پاساغەکان، گەمە سێکسییەکان،

کۆرپە تازە لەدایکبووەکان حەزدەکەن لەشی خۆیان بپشکنن و منداڵانی گەورەتریش حەزدەکەن بەباشی بەلەشی یەکتری ئاشنابن، ئەم تێنویەتییەی گەڕان و پشکنینەش بەئاسانی دانامرکێت و کپ ناکرێت. جیاوازیی شیکاری و پێکهاتەی لەش هەستی پشکنین و بەدواداگەڕانی منداڵان دەجوڵێنێت و ئەوان دەخاتە سەر ئەو بارەی کەزیاتر و زیاتر بارودۆخی بونیادی لەش و ئەندامەکانی بپشکنن تاکو بۆیان روونبێتەوە کە لە رووی جەستەییەوە کەموکورییان نییە.

تەنانەت کاتێك راستییەکانیشیان بۆ روونکرێتەوەو هەستەکانیان شەنوکەو بکرێت لەوانەیە بڕوا نەهێنن و بۆ وەدەستهێنانی دڵارامیی خۆیان دەست بە پشکنین و جووڵاندن و دەست لێدانی لەشی یەکتری بکەن. ئەوان بۆ تێرکردنی ئەم ئارەزووەی خۆیان چەندین گەمەی وەك پشکنینی دکتۆر بۆ نەخۆش و یان ژیانی ژن و مێردایەتی دادەهێنن. لەوانەیە بەنهێنی تەماشای لەشی رووتی یەکتری بکەن و تەنانەت منداڵە بێ شەرمترەکان هەنگاوی گەورەتریش دەهاوێن. بۆ نموونە لەوانەیە بەڕەزامەندیی هەردوولا گەمە بە ئامێری زاوزێی یەکتری بکەن و لەهەندێك بارودۆخی دیکەدا

هەنگاوی گەورەتر لەم گەمە منداڵانییە دەهاوێن، لەهەموو رووییەکەوە لەتێکەڵبوون وعەشقبازیدا لاسایی گەورەساڵان دەکەنەوە.
ئاساییە کە دایك و باوك هەر لەگەڵ ئاگادار بوونیان بەم رووداوە نارەحەتکارانە، دەخەجڵێن، زۆربەی جاریش دەربارەی ئەنجامە کۆتاییەکانی ئاقیبەتی ئەم گەمانە زێدەڕۆیی دەکەن و لەوە دەترسن کە جگەرگۆشەکانیان لەکاتی پێگەیشتن و رەسیندا ببنە یەکێك لە شێتەکانی سێکس.
تەنانەت رۆشنبیرترین دایك و باوك ئەگەر لەرووی مەسەلە سێکسییەکانی منداڵانیشدا ئاگادارییەکی تەواویان هەبێت ناتوانن نارەحەتیی خۆشیان بشارنەوە کاتێك منداڵانیان دەچنە نێو ئەم جیهانە سێکسیانەوە لەوانەیە خۆیان لەلێدانی منداڵ بە دووربخەنەوەو سستوسووکی نەکەن، بەڵام دوودڵن لەوەی چۆن ئەم جۆرە رەفتارانەی منداڵ جڵەوگیربکەن. تەنانەت هەندێك لەدایك و باوکان لەخۆیان دەپرسن ئایا راستە دەست بخرێتە نێو ئەم کاروبارە تایبەتییانەی منداڵانەوە، ئایا ئەم دەستێوەردانە لە جیهانە سێکسییەکانی منداڵان هێدمە بەژیانی ئایندەیان ناگەیەنێت؟ ئێستا دەبێت بزانرێت کەزیانی گەمە نهێنییە سێکسییەکان لە چیدایە؟
زیانی ئەم گەمانە لەوەدایە کەهەستکردن بەکەموکوڕی لەدەروونی منداڵاندا دروست دەکات وجگە لەمەش، پێویستییەکانیشی دابین ناکات، کاتێك کچێکی بچووکی دووسێ ساڵە بەسەرسوڕمانەوە سەیری شێوەی میزکردنی کوڕێکی بچووك دەکات لەرووی شیکاری و پێکهاتەی جەستەییەوە هەستی پشکنین و گەڕانی زۆر بەجێیە، چونکە حەزدەکات جیاوازیی سێکسیی بۆ روون بێتەوە. کەلە باخچەی ساوایاندا کچ و کوڕ دەچنە نێو یەك ئاودەستەوە دەبێت بەهۆی تەماشاکردنێکی راستەوخۆ هەستی پشکنین و بەدواداگەڕانیان تێر بکرێت، بەشێوەیەك دەبێت منداڵێکی ئاسایی لەکلاسی یەکەمدا بەپێی پێویست حەزی پشکنین و بەدواداگەڕانی خۆی کپ کردبێت و راستییەکانی وەرگرتبێت، لەبەر ئەوە هەرکاتێك بەردەوام لەژێر چاوانییەوە لەبەرانبەر ئەندامی سێکسیی خەڵکانی دیکە درێژەی بەنیگاکردن و رامان دا ، دەبێت بزانن کە ئەم نیگاکردنە نهێنییانە تەنیا لەهەستی پشکنین و بەدواگەڕاندا سەرچاوەی نەگرتووە، درێژەدانی منداڵ بەم شێوازو رەفتارە نیشانەی ئەوەیە کەگرفتاری

شلەژان و دوودڵی بووە, دەبێت بۆ نەهێشتنی ئەم نیگەرانییەی هەنگاو هەڵبهێنرێت. جگە لەمانەش، پێویستییە راستەقینەکەی منداڵەکە بەنیگاکردن نایەتەدی، چونکە پێویستی مەیخۆرێك تەنیا بەنۆشینی کهول دابین نابێت. لەبەر ئەوە دەبێ بەمیهرەبانی و زیرەکییەوە چاوی ئاژەڵانەی منداڵان لەرووی حەزی پشکنین و بەدواگەڕاندا سنوور بەندبکرێت و چاودێریی بکرێت , بەشێوەیەك لەکاتی تێکەڵاوبوون لەگەڵ هاوڕەگەزەکانی خۆی یان رەگەزی جیاواز پێ لەسنوری خۆی نەباتەدەرێ.

کاتێك دایکێك یان باوکێك کچ وکوڕێکی بچووك بەبێ شەلواری و جلوبەرگی هەڵدراوەوە غافلگیر دەکەن, نابێت لێیان بپرسن: (چیدەکەن؟) لەبەر ئەوەی هەرکاتێك منداڵان راستییەکە بڵێن دایکان و باوکان زۆر ناڕەحەت دەبن. نابێت منداڵ بەهۆی ئەم رووداوەوە سەرزەنشت و شەرمەندە بکرێت, هەروەها نابێت بۆ ئەو رەفتارەی هۆکارێکی داتاشراو بهێنرێتەوە, یان بەهانەی سادە و ئاسانی وەك: (ئایا بیر ناکەیتەوە کە بەم کەشوهەوا ساردەوە نابێت خۆت رووت بکەیتەوە) ی بۆ بدۆزرێتەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبێت فەرمان بەمنداڵان بدرێت کە جلوبەرگی خۆی رێکبخاتەوەو گەمەیەکی دیکە بکات، پاش رۆیشتنی منداڵە میوانەکە دەبێت بەراشکاوی بابەتەکە لەگەڵ منداڵ باسکرێت و رێك و راست پێیبگوترێت: (تۆوپینی PENNY دەتانەویست جلوبەرگ داکەنن, نابێت ئەم رەفتارە بکرێت. بینیم دەستت لەئامێری زاوزێی ئافرەتانەی پینی دەدا: ئەم کارە رێگا پێنەدراوە.) منداڵە بچووکەکان بۆیە ئەم رەفتارە دەکەن دەیانەوێت بزانن بۆچی کوڕ ئامێری پیاوانەی هەیە و کچ نییەتی؟ هەرکاتێك لەم بارەیەوە تۆش پرسیارێکت هەبوو دەتوانیت لەمنی بکەیت تاکو بابەتەکەت بۆراڤە بکەم.بەڵام نابێت جلوبەرگ لەبەر هاوگەمەکانت بکەیتەوە). رێگاوشێوازی ئاشتیخوازانەوئارامی ئێمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە تاقیکردنەوە سێکسییەکانی منداڵ سنوربەندبکرێت بەبێ ئەوەی لەبەرانبەر سێکس وخۆشەویستیدا هێدمە بە حەزی بگات.

## قسەی کرچوکاڵ و ناشرین:

هیچ دایك وباوکێك حەزناکەن رۆڵەکانیان بەتەواوەتی لەوقسە کرچوکاڵ و ناشیرینانە بێئاگابن کە هاوتەمەنەکانیان بەکاریان دەهێنن.بەڕای منداڵ ئەم قسانە ئەوەندە

توندو سەرکوتکەرن ولەهەمان کاتدا یاساغ دێنە بەرچاو، کە منداڵ لەبەکارهێنانیاندا هەست بە جۆرە شانازی و گرینگییەك دەکات. لە کۆبوونەوەی نهێنیی خۆیاندا قسەی کرچوکاڵ و ناشرین بەکاردەهێنن, واهەست دەکەن کە بەیاننامەی سەربەخۆیی خۆیان مۆرکردووە. نابێت بەکارهێنانی قسەی کرچوکاڵ و ناشرین لەلایەن منداڵەوە دایکان و باوکان بخاتە نێو ترسەوە، بەڵام دەبێت تادەکرێت بەشێوازێکی دۆستانەوە وا لە منداڵ بکرێت کە لە بەکارهێنانی ئەم قسانە چاودێری و وردبوونەوەیەکی تەواوی هەبێت. بۆنموونە باوك دەتوانێت ئاوا بە کوڕەکەی بڵێت: (جۆرج! نابێت لەکاتی ئامادەبوونی ئافرەتاندا ئەم قسانە بکرێن. ئەمانە تەنیا ئەو قسانەن کە لە مەجلیسی پیاواندا بەکاردەهێنرێن. دایك هەر لەگەڵ ئەوەی گوێبیستی ئەم قسانە بوو دەتوانێت ئاوا بە منداڵەکەی بڵێت: (من هەرگیز حەز ناکەم گوێم لەم جۆرە قسانەبێت، وەلێ دەزانم هەندێك منداڵ بەکاری دەهێنن.من وام پێباشترە هەرگیز گوێم لەم قسانە نەبێت.لەبەرئەوە تاپێت دەکرێت کەمتر ئەم قسانە بەکار بهێنە. لەماڵی ئێمەدا بەکارهێنانی ئەم قسانە قەدەغەیە.) بەم ڕێگایە ئێمەجارێکی دیکە ڕێز لە ئارەزوو و هەستی منداڵ دەگرین، بەڵام سنوورێکی بۆ دادەنێین و لەهەمان کاتیشدا ڕەفتارەکەی چاکدەکەینەوە.

## بەشی دەیەم
## رۆڵی سێکسی و ئەرکە کۆمەلایەتییەکان

- وێکچوون و ئەرکە جەستەییەکان.
- رۆڵی دایکایەتی و رۆڵی باوکایەتی.
- رۆڵی باوک.
- نموونە بۆ کچان و کوڕان.
- پەروەردەکردنی گونجاو بۆ گێڕانی رۆڵی ژنانە و پیاوانە.
- سەرمەشقە جیاوازەکانی خانەوادەیی.

### وێکچوون و ئەرکە جەستەییەکان:

بۆ ئەنجامدانی ئەرکە جەستەیی و سروشتییەکان، دەبێت کوڕان باوکی خۆیان و کچانیش دایکی خۆیان بکەنە پێشەنگ. وێچوویی ولاساییکردنەوە یەکێکە لە گرینگترین تێکۆشانەکان کە کوڕان دەکاتە پیاو و کچان دەگۆڕێت بۆ ئافرەت.کاتێك پەیوەندیی نێوان دایك و باوك و رۆڵەکانیان لەسەر بناغەی رێزی بەرانبەرو خۆشەویستییەکی راستگۆیانە بونیاد نرابێت لاسایی کردنەوە ئاسانکارییەکی زۆروزەبەند بەخۆیەوە دەبینێت. ئێمە بە وەدەستهێنانی خۆشەویستیی ودۆستایەتیی مندالآن ئارەزووی مندالەکە بۆلاسایی کردنەوەی رۆڵە رەگەزییەکانی خۆمان زیاترو زیاتر بەهێزدەکەین، بەلآم رەنگەخودی دایك وباوك وەکو پێویست زانیارییان لەسەر ئەم رۆڵە رەگەزیەدا نەبێت.

### رۆڵی دایکایەتی و رۆڵی باوکایەتی:

لەزۆربەی کۆمەلگاکاندا رۆڵی دایك بەچەندین پلە زیاتر لە رۆڵی باوك رۆشنترە. دایکایەتی واتا شیردان بە کۆرپە، گۆڕینی جلوبەرگە پیسەکانی، نەوازشکردنی گوێچکەکانی، گەمەکردن لەگەڵ مندالّ، زەردەخەنە بۆ کردن و چاودێری کردنی مندالّ لە هەموو روویەکەوە. بەم رێگایە پێویست بوونی چاودێریی دایك بۆ کۆرپەکەی لەرووی ژیانییەوە بەتەواوی رۆشنەو کەمیی چاودێریکردنی دایك بۆ کۆرپەکەی دەروونذروستیی مندالّ دەخاتە مەترسیەوەو هەڕەشە یەکە بۆ سەر

ژیانی منداڵەکە. بەپێچەوانەوە باوکایەتی پێویستی بەبوونی تایبەتمەندیی سروشتیی کەمتر هەیە، وەلێ پێویستی زیاتری بە هەبوونی رۆشنبیری و زانیاری هەیە. لە رووی ژیانییەوە دەتوانرێت بگوترێت کە لە راستیدا رۆڵی باوك پێش لەدایکبوونی منداڵ دەست پێدەکات و کۆتایی دێت وگشت چالاکییەکانی دیکەی باوك کەلەپاش لەدایکبوونی کۆرپەکە بەرێوە دەچێت, لەتێبینییە کۆمەلایەتییەکانەوە وەرگیراوەو تێبینییە کۆمەڵایەتیەکان ئیلهامبەخشی چالاکیەکانی باوکن , بەم شێوەیە لەهەندێك کۆمەڵگادا باوك تەنیا گرینگی بە کوڕ دەدات و بەهیچ شێوەیەك ناچێتە نێو پەروەردەکردنی کچەوە، لە هەندێك کۆمەڵگای دیکەشدا، باوك رۆڵی مامۆستایەکی نەرمونیان و ئاسانگیر دەگێرێت و ئەرکی بەخێوکردن و پەروەردەکردنی منداڵ بەتەواوی دەخاتە سەر شانی دایك ، لەهەندێك کۆمەڵگای دیکەشدا باوك وەك پاشایەکی دیکتاتۆر دەسەڵات بەسەر منداڵەکانیدا دەسەپێنێت . لەکۆمەڵگای ئێمەدا سەرۆکی خانەوادە باوکە، بەلام زۆربەی جار رۆڵ و هەلومەرجی لێڵ و نەزانراوە. هەندێك لەکارناسانی پەروەردەو فێرکردنی ئەمریکا بڕوایان وایە کە باوکێکی ئەمریکایی تەنیا ئامادەکارو فەراهەمکارێکی هۆکارەکانی ژیانی خانەوادەیە, هەنووکەش زۆربەی کاتەکان لەماڵەوە نییە بەو مانایەی هەر لەگەڵ کازیوەی بەیاندا لەماڵ دەچێتە دەرەوەو، بە درێژایی رۆژ بزردەبێت و بەماندوویەتی وکفتی زۆر درەنگ دەگەڕێتەوە ماڵەوەو دەخەوێت. رۆژەکانی پشوودانیش ئەگەر گەمەی گۆلف نەکات وتەمەشای تەلەفزیۆن نەکات بێگومان خۆی بەکورتکردن و بڕینەوەی چیمەنی باخچە سەرگەرم دەکات. بەم شێوەیە منداڵان بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ خودی باوك و بەشداریکردن لەچالاکییە پەسندو ئەرێیییەکانی کاتێکی کەمیان لەبەر دەست دایە.

لەبەرئەوە دایك لەخانەوادەدا رۆڵێکی سەرەکی دەگێرێت , ئەگەر تاکە فەرمانڕەوڵش نەبێت، ئەوا بەشێوەیەکی گشتی و سەلمێنراو بەشی هەرە گەورەی دلبینکردنی رێکخستن و رێککاری و رێکخستنی منداڵانی دەکەوێتە سەرشان.

ئەم سەرکەوتنە نوێیە بەتەواوی رۆڵی دێرینی دایکی خستۆتە ئەندێشەوە, بۆ روونکردنەوە؛ لەسەردەمەکانی رابردوودا دایك سومبوڵی خۆشەویستی و دڵسۆزی و,

باوك نموونەی ڕێکخستنی رەوشتی منداڵان بوو، منداڵانیش بەتایبەت کوڕان سەرمەشقییان لەباوکیان وەردەگرت. زیاتر وێنەی ئەندێشەیی باوك بوو کە لە دوودڵییەناڕەواکان وسنوربەزاندنە ناپەسندەکان بەدووری دەخستنەوە، لەڕاستیدا باوك ئەلقەیەك بوو خانەوادەی بەجیهان دەبەستایەوە.

بەڵام لەخانەوادەکانی ئەم ڕۆژگارەدا ڕۆڵی دایك و باوك وەکو رابردوو دەستنیشان کراوو ڕۆشن نییە, بەو مانایەی زۆربەی ئافرەتان لەدەرەوەی ماڵەوە کاری پیاوان ئەنجام دەدەن و ژمارەیەکی زۆری پیاوانیش لەماڵەوە سەرقاڵی ئەنجامدانی کاری ئافرەتانەن وەك خۆراکدان بەمنداڵ و شووشتن و گۆڕینی جلوبەرگەکانی.

ئەگەرچی ژمارەیەك لەپیاوان بۆ جێگیر کردن و ئارامی وپەیوەندییەکی نزیکتر لەگەڵ کۆرپەکانیان بەئامێزێکی ئاوەلاوە پێشوازی لەم هەلە نوێیە دەکەن, لەگەڵ ئەمانەشدا مەترسیی ئەوە لەگۆڕێدایە کە لە جیات ئەوەی منداڵ خۆی لەنێوان دایك و باوکیدا ببینێتەوە، لەنێوان دوو دایکدا هەست بە تەنیایی بکات.

## ڕۆڵی باوك:

منداڵ پێویستی بەباوکێکی وەها هەیە کە ڕۆڵی خۆی بگێڕێت و قەبووڵی بکات. ناتوانرێت ئەرکی پیاوانە بەیەك دوو خوولی چاوپێداخشاندنەوەو خوێندنەوە فێربکرێت .منداڵ ئەم ڕۆڵە بەدرێژایی ژیانی ڕۆژانە لە باوکێك فێردەبێت کە سەرمەشقێکی چاك بێت. فرۆید ئەم مەسەلەیە ئاوا روونده‌کاتەوە:(لەسەردەمەکانی منداڵیدا ,بەهێزترین پێویستی ئەوەیە کە منداڵ لەلایەن باوکییەوە پارێزگاریی لێ بکرێت,ناتوانین ئەم پێویستییەش بە هیچ پێویستییەکی دیکە بەراورد بکەین, چونکە بۆ منداڵ وەکو هەناسە گرنگە.) منداڵ هەر لەگەڵ پەیدابوونییەوە پێویستی بەو دڵنیاییە هەیە کە خاوەنی باوکەو ئەم باوکە لەهەموو مەترسییەك دەیپارێزێت. بەتایبەتی بوونی باوك لەسێ لایەنەوە بۆ ڕێنمایی کردنی منداڵ زۆرپێویستە, ئەم سێ لایەنەش بریتین لەلایەنی مەترسیی جیهانی ناوەوەو مەترسیی جیهانی دەرەوەو مەترسی دایکێکی زیاد لە پێویست دڵسۆز. بۆ هەرمنداڵێك جیهانی دەرەوە پڕە لەمەترسی, لەجیهانی ئەمڕۆدا منداڵ بۆ درێژەدان بەژیان پێویستی بە پارێزگاریلێکردن هەیە لەبەرانبەر کەلوپەل و هۆکارە نوێیەکان و مەترسییە

بەردەوامەکانی دەوروبەری خۆی. ئەو بەلای کەمەوە دەبێت فێربکرێت کەچۆن لەکووچەوکۆلآناندا بپەڕێتەوە بەبێ ئەوەی ئۆتومبێل لێی بدات, یان چۆن سوود لە کەلوپەلە کارەباییەکانی ماڵەوە وەربگرێت بەبێ ئەوەی تووشی کارەباگرتن بێت، هەروەها منداڵ بۆ رووبەڕووبوونەوەی هەڵچوونە پڕ لە تووڕەییەکان و خەیاڵە تێکەڵ و پێکەڵ و نیگەرانییەکانی پێویستی بەوە هەیە کە باوکی یارمەتی بدات. تەنانەت کوڕێکی نەوجەوانیش حەزدەکات دایکی تەنیا وابەستەی ئەوبێت و لەوکاتەی کەبەهیچ رکابەرێك رازی نابێت, لەجیهانی خەیاڵ و خەونی خۆیدا لە شەڕی باوکی رزگاری دەکات .لەوانەیە ئەم خەیاڵانە توندییەکی تایبەتیی هەبێت و خەونەکانیشی بەشێوەی مۆتەکەبن ,چونکە منداڵ ناتوانێت بەدروستی ئارەزووەکانی لەکردارەکانی جیا بکاتەوە. گرفتاری بێ ئارامی و نیگەرانی دەبێت و بەهیچ رێگایەك ناتوانێت درك بەوەبکات و بۆی روونبێتەوە کەخەونەکانی بەراست ناگەڕێن. لێرەدا رۆڵی باوك دوو بەرابەر دەبێتەوە, بەومانایەی کە دەبێت لەلایەك بەدڵسۆزی و چاو پۆشینەوە تەماشای ئێشوترس و ئازار و ناڕەحەتییەکانی منداڵ بکات و لەهەمان کاتیشدا بەوپەڕی ئارامییەوە وابکات منداڵ بڕوا بەم پەیامە بهێنێت: (رۆڵەکەم نیگەران مەبە! ناهێڵم حەزو ئارەزووە تۆقێنەرەکانت بێتە سەر زەمینەی واقیع و کردارەوە).

هەندێك دایك و باوك زانیارییان لەسەر پێویستیی پارێزگاری لێکردنی منداڵان نییە لەبەرانبەر ئەو خەیاڵکردنە خراپەکاری و خیانەتاوییانەی کەدەربارەی باوکیان لەمێشکیاندا دەخولێتەوە. لەهەندێك ماڵدا منداڵان هەمووکاتێکی شەوو رۆژ رێگا پێدراوانە هێرش دەبەنە سەر شوێنی خەوتنی دایك وباوکیانەوە. لەهەندێك ماڵی دیکەدا منداڵان هەندێك کات بەقسەو هەندێك کاتیش بەکردار لە پێش باوکێکی سست و بێ ئیرادەدا لەسنوری لەبەر چاوگرتنی رێز و حورمەتی دایکیان دێنە دەرێ، لەکاتێکدا بەهیچ شێوەیەك نابێت مۆڵەتی ئاوایان پێ بدرێت. ئەم بێ رێزییە نیگەرانی و بێ ئارامی بۆ منداڵان پەیدا دەکات و دەبێتە هۆی ناڕەحەتیی ئەندێشەی دایك و باوکیش.

هەر باوکێك بەهەمان ئەو شێوەیەی کە دەبێت لەبەرانبەر منداڵێکی بێ شەرم و بێ

پەڕوای سنووربەزێن بەرگری لەدایك بكات، دەبێت بەهەمان شێوەش مندالْ لە مەترسیی دایکێکی میهرەبان و سستی ناناسایی بپارێزێت. مەبەستی ئێمە ئەوە نییە بڵێین کەگشت دایکان لەئازادی بەخشین بەرۆڵەکانیان رێگای زێدەڕۆیی دەگرنە بەر, بەڵکو مرازی ئێمە ئەوەیە کەزۆربەی دایکان تاماوەیەکی دوورودرێژ مامەڵەی منداڵێکی بچووك لەگەڵ رۆڵەکانیاندا دەکەن. ئەرکی باوکە کەجگە لە دابینکردنی بژێویی ماڵ و هۆکارەکانی ژیانی منداڵ، بەمیهرو خۆشەویستییەوە سنووری ئازادیی بۆ دیاری بكات. لەوکاتەی کەخۆشەویستیی دایك بۆ منداڵی دەسەلمێنێت کەجێگای گرینگی پێدان و پارێزگاریی دایکە، نزیکیی باوك لەمنداڵەکە، منداڵەکە دڵنیا دەکاتەوە کەتوانای باوك بۆ رێنمایی کردن لە توانای دایکەکە زیاترە. چونکە باوکان خۆیان لەسەردەمەکانی منداڵییەوە لەدایکان کەمتر سنوور بەندکراون وباشتر دەتوانن سنووری ئازادی و سەربەخۆیی منداڵان دیاری بکەن. ئارەزووی باوکان بۆ چاودێریکردنی رووداوی نوێی منداڵ و چاودێریکردنی ئازادییەکەی دەبێتە هۆی ئەوەی کە منداڵ بەبێ هەستکردن بە کەموکورتکاری گەشەبکات و پەروەردەبێت.چۆنییەتیی پشت بە خۆبەستن و دڵنیایی منداڵ پێویستی بە بوونی شارەزاییەکی تایبەت و سوود وەرگرتن لەکات و شوێن و بارە دیاریکراوەکان نییە. بەڵکو تەنیا پێویستی بە ئارەزوو و توانای هەستکردن بەپێویستییەکانی منداڵ و هەوڵ دان بۆ گێڕانی رۆڵی چاودێریکارێکی جددی وەلێ تەواو میهرەبان هەیە.

*** نموونە بۆ کچان و کوڕان:**

کچان و کوڕان بۆ پێشڤەچوون لەفێر بوونی ئەرکەکانی ژیانی خۆیان گشتیان پێویستیان بەیارمەتی دان هەیە، نابێت دایك و باوك بۆ ئەنجام دانی ئەم کۆمەکە چاوەڕوانی رەفتارو شێوازێکی یەکسانیان لەم دوو رەگەزە جیاوازە هەبێت، لەبەر ئەوەی کوڕان لەلایەك وزەی جەستەیی زیاتریان هەیەو لەلایەکی دیکەشەوە کۆمەڵگا چاوەڕوانیانە، دەبێت مۆڵەت بەکوڕان بدرێت دەست بە ئەنجام دانی چالاکیی توندوتیژترو ماندووکەرتر بکەن.

دەبێت دایکان و مامۆستایان خۆیان لە ستایشکردن و هاندانی رەفتار و کرداری ژنانەی کوڕان بەدوور بخەنەوە. نابێت کوڕان ناوی ژنانە لەخۆیان بنێن و جلوبەرگی

ژنان بپۆشن و یان وەکو کچان پرچی خۆیان بەربدەنەوە. نابێت چاوەڕوانییان لێبکرێت وەکو کچان پاکبن و ریورەسم و دابونەریتیان هەبێت، یان سروشت و رەفتاریان کچانە بێت. ئەو وتەیەی کە دەڵێت: (کوڕ هەر کوڕە) لەهەموو رووێەکەوە راستەو دەبێ هەمیشە ئەوە لەبیرماندابێت کە ئەو وزەیەی خوا بەکوڕی داوە دەبێ هەمیشە بەئەنجام دانی چالاکییە ماسولکەییەکانی خۆی خەرجی بکات ئەگەرنا زیان دەبینێت. ئەو دایك و باوکانەی لەبوونی کچ بێبەش ماونەتەوە دەبێت تاپێیان دەکرێت هەوڵبدەن لەدیمەن بەخشینی کچان بەیەکێك لە کوڕەکانیان بەدوور بکەونەوە. لەوانەیە کوڕێکی بچکۆڵەی جوان بەپرچی درێژو لوول وخولخواردووەوە ببێتە مایەی دڵخۆشیی دایك و باوك و خزم و کەسانی، بەڵام بێگومان دەبێتە جێگای گاڵتە پێکردنی هەڤاڵان و هاوگەمەکانی ،ئەم گۆڕانە لەکەسایەتیی منداڵەکەدا شوێنەوارێکی قووڵ بەجێدە هێڵێت، بەو مانایەی لەبەرانبەر ویژدانی خۆیدا هێدمە بە وێنە راستەقینەکەی دەگات و لەلایەکی دیکەشەوە لەنێو گروپ و کۆمەڵدا هێدمە بە شوێن و پێگەی دەگات.

هەروەها نابێت کچان سزای بێبەشیی دایك و باوك لەهەبوونی کوڕ وەربگرن و کچان باجی ئەم بێبەشییە بدەن. گەرچی کچان لەخۆنواندن بەکوڕ کەمتر کەسایەتیی خۆیان لەدەست دەدەن لەو کوڕەی کە بە کچ خۆی پیشان دەدات، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەبێت ئەوەمان لە خەیاڵدا بێت کە دەبێت کچیش شانازی بەنەرمی و ناسکیی خۆی بکات کە بەهۆی کچایەتیی خۆیەوە جێگای شادومانی و ستایشە. ئەم هەستە لەوکاتەدا بەهێز دەبێت کە دایك شەرم لە ژنایەتیی خۆی نەکات. بەشێوەیەکی گشتی دەبێت دایك و باوك هەردووکیان لەپێویستیی پەروەردەکردنی گیانی پیاوانەو ژنانەی رۆڵە کچ و کوڕەکانیان ئاگاداربن و زانیارییان هەبێت. زۆر بەجێیە کە باوك ستایشی سروشتە دڵڕفێن و جلو بەرگە جوان و دڵڕفێنەکانی کچەکەی بکات و هتد. بەڵام زۆر بێجێیە کە باوك بە زۆر کچەکەی بۆ پێشبڕکێیەکی کەشتیوانی یان فوتبۆڵ لەگەڵ خۆیدا ببات، نەوەك کچەکە ئەنجامێکی وەها وەدەست بهێنێت کە ئەگەر کوڕ بوایە باوکی زیاتری خۆشدەویست. ژیانی خانەوادەیی بۆ پیشاندانی ئەو خاڵە سەرەکییەی کە ژن و پیاو پێویستیان بە بوونی

یەکتری و ئاوڕلەیەکتردانەوە هەیە هەلی بێشومار دەخاتە بەر دەستی مندالآنەوە.

## پەروەردەکردنی گونجاو بۆ گێڕانی رۆڵی پیاوانە و ژنانە؛

پەروەردەکردنی مندالآن بۆ گێڕانی رۆڵی تایبەتیی رەگەزیی خۆیان لەهەمان سەردەمەکانی مندالّییەوە دەست پێدەکات. لەگەلّ هەموو ئەمانەشدا نابێت پەلە لە مندالّ بکرێت و ناچار بکرێت ئەو کارە تایبەتیانە ئەنجام بدات کە تایبەتن بە رەگەزی خۆیەوە، لەسەردەمی باخچەی ساوایاندا پێش چوونە قوتابخانە کوڕ وکچ هەردووکیان حەزیان لەوە هەیە گەمە بە بووکۆڵە بکەن و چالاکیی دایکانە ئەنجام بدەن. ئەم شتە لە هەموو روویەکەوە سروشتییە. لەبەرئەوە نابێت دایکان و باوکان کوڕێکی بچووکی (٥) سالّە بتۆقێنن کاتێك سەرقالّی شیردانە بەبووکۆڵەیەك.
دەبێت مندالآن تا تەمەنی (٥) سالّی و لەکاتی ئارەزووکردن بتوانن سوود لە کەلوپەلی گەمەو بووکۆڵەو گەمەی یەکسان و هاوشێوە وەربگرن.
نابێت لەم تەمەنەدا سنوورێکی جیاکەرەوەی دەست نیشانکراو لە نێوان گەمەی کوڕان و گەمەی کچان بوونی هەبێت. نابێت باوکان سووربن و پێ لەسەر ئەوە دابگرن کە کوڕانی (٥) سالّە لە جیاتی ئەوەی گەمە بە بووکۆڵە بکەن فێری مشتەکۆڵەبن تاکو لەکاتی پێگەیشتنیاندا ببنەپالّەوانی مشتەکۆڵە. دەبێت مندالآن بەهەردوو رەگەزەوە تا تەمەنی شەش سالّی بتوانن ئازادانەو بەبێ (ترس)ی رەخنە لێگرتن و بەپێی ئارەزووی خۆیان هەردوو گەمەی کوڕانە وکچانە بکەن. لەسەردەم وقۆناغی خوێندنی قوتابخانەدا. جیاوازیی رەگەزییەکان روونتر دەبنەوە. لەیەکتری جیادەبنەوەو هەریەك لەکوڕان وکچان ئارەزوو و حەزی جیاواز لەیەکتری پیشان دەدەن، کوڕان بەئەنجام دانی چالاکییە پیاوانەکان و کچان بەتاقیبکردنی سەلیقەو خووە ژنانییەکانەوە هەولّدەدەن بوونی خۆیان بسەلمێنن و سەرنجی خەلّکانی دیکە بۆ خۆیان کێش بکەن. لەم تەمەنەدا بۆ ئەوەی کچان و کوڕان لاسایی هاوڕەگەزەکانی خۆیان بکەنەوە، دەبێت بەهۆی دابینکردنی چالاکی و هەلە تایبەتییەکانی هەر رەگەزێك بەهێز بکرێت و پشتگیری لێبکرێت و ببێتە پالّنەر. بێگومان لاساییکردنەوەش هەر بەهۆی دابینکردنی ئەو شتانەوە بەهێز دەکرێن و

پشتگیرییان لێدەکرێت کە لە سەرەوە باسمان کرد.
قۆناغەکانی خوێندنی قوتابخانە بۆ پتەوکردنی پەیوەندیی کوڕ بە باوك و کچ بە دایك بەهەلێکی باش دادەنرێت, لەبەر ئەوەی قۆناغێکە دەتوانرێت پلە بەپلە کچان بە کارەکانی چێشت لێنان و ماڵداری ئاشنابکرێن. کچان لەم ساڵانەدا دەتوانن چێشت لێبنێن و خۆراکی سادە ئامادە بکەن و دروومان و تاروبۆی ماڵداری فێرببن. دەبێت دایك و باوك دەربارەی کەموکوڕیی کاروباری منداڵان تانەوپەڕی چاوپۆشی و لێبووردنیان هەبێت، لەبەرئەوەی بناغەی شادومانی و ئاسودەیی و چێژ وەرگرتنی منداڵ لەماڵدارییەوەیە، نەك لە ئەنجامدانی کاری تەواو و بێکەموکوڕی، لەم قۆناغەدا هەلێکی زێڕینە کە دایك بتوانێت بە باشترین شێوە چێژو لوتفی ژنایەتی و هاوسەرایەتی و دایکایەتی ببەخشێتە کچەکەی و فێری بکات.
دەبێت باوکیش تانەوپەڕی شادومان و دڵخۆشبێت کاتێك دەبینێت کوڕەکەی ئامادەیی ئەوەی هەیە لاسای چۆنییەتیی بەڕێدا رۆیشتن و قسەکردن و جلوبەرگ لەبەرکردنی ئەو دەکاتەوەو, نابێت گاڵتە بەم لاساییکردنەوەیە بکات, بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبێت زیاترو زیاتر ستایشی بکات و هانی بدات. لەوانەیە لاسایی کردنەوەی قسەو سروشتی باوك ببێتە پاڵنەرێك بۆ لاسایی کردنەوەی ئارەزوو و بەهاکانیشی. دەبێت باوك لەپەیوەندییە نزیکەکاندا بەکوڕەکەی پیشان بدات کەشوێن و پایەی پیاو لەخانەوادەو کۆمەڵگادا چییە.
منداڵان شانازی بەشارەزایی و هەوڵەکانی باوك دەکەن کە لەماڵەوە تیایدا دەبینرێت. هەروەها شانازی بەو هەنگاوانەشی دەکەن کە باوکەکە لەدەرەوەی ماڵەوە دەیانهاوێژێت. کات بەسەربردنی منداڵ لە شوێنی کاری باوك و بینینی چالاکییە شارستانی و سیاسییەکانی دەبێتە هۆی ئەوەی کەدرك بە بەهای ئەنجامی ئەرکەکانی پیاو و خزمەتکردنی کۆمەڵگا بکات و بۆی روونبێتەوە.

## سەرمەشقە جیاوازەکانی خانەوادەیی (خێزانی):

باشترین سەرمەشقەکانی لاساییکردنەوە، ئەو دایك و باوکانەن کە هەم رێز لە رەگەزی خۆیان و هەم رێز لەرەگەزی بەرانبەر دەگرن. ئەوان بەهەزاران رێگای نەرم و ناسك و، رەوشت و رەفتاری چاك بەمنداڵەکانیان پیشان دەدەن کە هەریەکە لەژن

و پیاو لەپێگەو رۆڵی خۆیدا نرخ وبەهای تایبەتیان هەیە.

منداڵان لەهەندێك خانەوادەدا فێری ئەوەدەبن کەدەبێت مرۆڤێکی راستەقینە رۆڵی خۆی لەجیهاندا بسەلمێنێت و جێ پەنجەی دیاربێت وشوێنەواری خۆی لەکات ونەبەدیەت ویادگارەکاندا بەجێبهێڵێت، کەشوهەواو دەوروبەرێکی ئاوا بەسوود لە خانەوادە تا ئەوپەڕی خەون و خولیای دۆزینەوەو داهێنان و هونەرنواندنی زانستی و هونەری لەدەروونی منداڵدا پەروەردە دەکات. دەبێت ژنانیش جگەلە پەروەردەی منداڵ و کاری خانەوادەدا بۆ بەرەو پێشبردنی کۆمەڵگا تێبکۆشن. ئەم بیرو بیردۆزە لەوکاتەدا دەچێتە سەر زەمینەی کردارەوە کە دایك و باوك بەشادومانی و خەیاڵ رەحەتییەوە رۆڵی خۆیان قەبوڵ بکەن و رێز لە پلەوپێگەی یەکتری بگرن و دەربارەی کارەکانی یەکتری پەیوەندی و ئارەزوو پیشان بدەن. بەڵام لە هەندێك ماڵی دیکەدا ئافرەت بەردەوام سەرقاڵی پەروەردەکردنی منداڵ و کاروباری ماڵەوەیەو, پیاویش لەبەرانبەر رۆڵی سەخت و دژواری ژنایەتی و دایکایەتی رێزو بەها دانانێت. لەبەر ئەوە منداڵان بەهەمان ئەم ڕوانگەو گۆشانیگایەوە سەیری رۆڵی دایك دەکەن و دڵنیایی پەیدادەکەن کە کاری دایك تەنیا تایبەتەبە ماڵداری و بەخێوکردنی منداڵەوە. لەوانەیە لەماڵێکی لەم جۆرەدا کچان شەرەنگێزی لەگەڵ کوڕان بکەن و هەوڵبدەن سەرەتا کوڕو دواتریش پیاوان مەیدان بەدەربکەن و بەم شێوەیەش لەگێرانی رۆڵی سروشتیی خۆیان بەدوور بکەونەوە (پاش بکەون), لەهەندێك ماڵی دیکەدا کە بەشێوەیەکی پێچەوانەوە رۆڵی ژن و پیاوی تێدا دەگێردرێت سەرمەشقی منداڵان شێوەیەکی دیکە لەخۆدەگرێت. بۆ روونکردنەوە: لەو ماڵانەدا کە ژن لەهەموو روویەکەوە حوکم دەکات و دەسەڵاتی رەهای هەیە, لەوانەیە پشکداریی لەدابینکردنی بژێویی خانەوادەدا نەبێت,بەڵام لەگشت مەسەلە گرینگە خانەوادەییەکاندا بڕیاردان و رای یەکجاری بەدەست ئەوەو فەرمانی ئەو رەتبوونەوەی بۆنییەو هەرخۆی سەرۆکە. پیاوێکی سیاسی دەیگوت: (دەربارەی مەسەلە گرینگەکان بڕیاردەدەم کە ئاخۆ راستە (چین)ی کۆمۆنیست بێتە نێو رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان, یان بەڕێوەبەرایەتیی تەلەفزێۆنی ئەمریکا بفرۆشرێتە کۆمپانیا تایبەتییەکان. لەکاتێکدا بڕیاردان لەسەر گشت مەسەلە خانەوادەییەکان بەئارەزووی هاوسەرەکەمە. هەرئەوە

کە دەبێت رای خۆی بسەپێنێت و رای خۆی بدات کە دەبێ چ جۆرە ئوتومبێلێک بکرین. لەچ خانوویەکدا بژین. منداڵەکانمان بۆ خوێندن بنێرینە کامە قوتابخانە) لەماڵێکی ئاوادا مێردەکە ئاشکرا ئەوە پیشان دەدات کە سەرۆکی خانەوادەنییە و بە راشکاوی هاوسەرەکەی (بەکول فی کول) و پاڵەوان و سەرۆکی ماڵەوە دەزانێت. کاتێك منداڵان داوای مۆڵەتێکی لێدەکەن بەگشتی وەڵامی ئاوا دەداتەوە: (لەدایکتان بپرسن. بەدایکتان بڵێن). لەم جۆرە ماڵەدا بەهەستی رێزگرتن و ستایشێکی کەمەوە دەڕواننە پیاوو ،کچ و کوڕ وەکو دایکێك سەیری باوکیشیان دەکەن واتا پیاوێکی ئەرمونیان، وەلێ بێ ئیرادە، مرۆڤێکی دڵپاش وەلێ کاریکاتێرێکی بەزەیی بزوێن.
هەمیشە چ کوڕ و چ کچ دەچنە ژێر کاریگەریی باوکێکی بێ دەسەڵات و دایکێکی قسە رۆیشتووی خاوەن بڕیار. لەوانەیە کوڕان بۆ چاککردنەوەو راستکردنەوەی بێحاڵیی باوك و سەلماندنی پیاوەتیی خۆیان دەست بە ئارەقخۆری و هەوسبازی و خراپەکاری ودەستدرێژکردنە سەر ئافرەتان بکەن. بەپێچەوانەشەوە کچان لە هەڵبژاردنی هاوسەرودۆستدا لاسایی سەرمەشق وئالگۆی سەرەکیی خانەوادەکەیان دەکەنەوە, بەم شێوەیەش زەمینەو پێشینەی گێڕانی رۆڵێکی ئاوەژووبووەی دیکە ئامادە دەکەن.

## رۆڵی رەگەزی و ئەرکی کۆمەڵایەتی:

گرینگیی پەروەردەکردنی کچ و کوڕ وەك تاکەکەسی مرۆیی یەکسان و بەرابەر، نابێت ئەو خاڵەسەرکییەمان لەبەرچاواندا بەدوور بخاتەوە دەبێت کوڕلە ئایندەدا پیاو بێت و کچیش لەئایندەدا ژن بێت, لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی بەرابەری و یەکسانیی نێوان کوڕو کچدا دەبێت هەمیشە ئەوەمان لەیاد بێت کە هەندێك ئەرك وکاری ژیانی گوڕان قەبوڵ ناکەن و ئاقیبەتی کۆمەڵایەتی و دەروونیی گرینگیان هەیە. دروستە کە نابێت رۆڵە کۆمەڵایەتییەکان زۆر بەجیاوازییە رەگەزییەکانەوە پابەند بکرێن.
بەڵام لەهەمان کاتیشدا نابێت ئەم جیاوازییانە بەتەواوی لەبەر چاو نەگیرێن.
لەوکاتەی کەتوانای زۆربەی ئافرەتان، ژنایەتی و دایکایەتییە، دەبێت پەروەردەی گشتی و پێشبینی و چاوەڕوانییەکانی ئەوان بەجۆرێك بێت کە لەگێڕانی ئەم رۆڵانەدا

چێژێکی قووڵ وەربگرن, ئاساییەکە لەوانەیە ئافرەتان بەشێوەیەکی تاك و بەژمارە کەمتر لەپەنجەی دەست بڕیاری گێڕانی ڕۆڵی جیاواز بدەن, لەوانەیە کاری میکانیکی یان دەریاوانی یان فڕۆکەوانی یان بازرگانی و بریکاریی ئەنجوومەن لەئەستۆ بگرن. وەلێ لەوکاتەی کەدەبێت هەلی سەرقالبوون بە کارو چالاکیی دڵخوازانە بۆ هەردوو ڕەگەز بوونی هەبێت، دەبێت هەمیشە ئەم خاڵە سەرەکییە لەبەر چاوبگیرێت کە هەرکاتێك کێبڕکێ و نێرەیی و چاولێکەریی بێجێ و نائاسایی لەنێوان تاکەکانی دووڕەگەزی جیاواز کەمتر بێت، ژیانێکی باشترو ئایندەیەکی دەرخشانتر لەچاوەڕوانی مندالەکانماندا دەبێت.

# بەشی یازدەهەم
## ئەو منداڵانەی پێویستی خێرایان بەچارەسەری دەروونی هەیە

- ئەومنداڵانەی کە پێویستییەکی یەکسەریان بەچارەسەرکردنی دەروونی هەیە.
- ئەومنداڵانەی کە دەتوانن لەچارەسەری دەروونیدا یەکسەر ئەنجام وەدەست بهێنن.

زۆربەی منداڵان بەبێ ئەوەی ناڕەحەتییەکی جەستەیی توندیان هەبێت لەبەرانبەر هەلومەرجە کەمێك دژوارو کێشمە کێشە دەروونییەکاندا، کاردانەوەیەکی سۆزیی شڵەژاوانە پیشان دەدەن و لەوانەیە زۆربەی جار گرفتاری نیگەرانی و مۆتەکە ببن و، نینۆکی خۆیان بجوون، نیش وتانە و تەشەر لەبراو خوشکی خۆیان بدەن و، ئازار بەدەست تووڕەیی و هەڵچوون بچێژن، بەچەند ڕێگایەکی جۆراو جۆر بێ ئارامیی خۆیان دەربڕن. ئەم منداڵانە بەگشتی لەدەوروبەری دروست و ماڵە ئاساییەکاندا پەروەردە کراون و لەمیهر و خۆشەویستیی دایك و باوکە خۆشنیازەکانەوە سوودیان وەرگرتووە، بەڵام گرفتی سەرەکییان لەوەدایە کە دایك و باوکی میهرەبان و دڵسۆزو سستی لەسنوور بەدەریان هەبووە، ئەم ژمارە منداڵانەو دایك و باوکیان دەتوانن سوودێکی تەواو لەچارەسەری زانستی وەربگرن.
دەستەیەکی دیکەی منداڵان گرفتاری چەند ناڕەحەتییەکی توندترن، بەومانایەی کە لە ئێرەیی پێبردندا تانەوپەڕی سەرسەخت و لە پێشاندانی رکابەرییەتیدا زۆرتوندوتیژ و لەمەسەلە سێکسییە کانیشدا تانەوپەڕی ناڕەحەتن. هەرکاتێك بمانەوێت لەئایندەدا وەك تاکەکەسی ئاسایی بن دەبێت بێ سێ و دوو و چەندوچۆن چارەسەری دەروونییان بۆ بکرێت.
سەرەتا بەشێوەیەکی کورت دەست بە راڤە کردن و باسکردنی دەستەیەك لەومنداڵانە دەکەین کە یەکسەر پێویستیان بەچارەسەری دەروونی هەیەو دواتر باس لەودەستە منداڵە دەکەین کەدەتوانن لەچارەسەری دەروونیدا ئەنجامێکی

یەکسەر بەدەست بهێنن.

## ئەو منداڵانەی کە پێویستییەکی یەکسەریان بەچارەسەرە دەروونییەکان هەیە : رکابەرییەتیی توندو کوێرانە

ئەومنداڵانەی کە لەبەرانبەرخوشك وبراکانیان رکابەرییەکی توند لەدڵی خۆیاندا پەروەردە دەکەن، پێویستیان بەیارمەتی دان هەیە. ئەوان ئەو دەستە منداڵانەن کە ئیرەیی دەسەڵاتی بەسەر تەواوی کەسایەتیاندا هەیەو بەدرێژایی ماوەکە بەخەگیریان دەبێت. ئەوان بەردەوام لەدوای گرینگی پێدان و چاودێرییەکی وەها دەگەڕێن کە تەنیا موڵکی ئەوان بێت و تایبەتبێت بەوان، بەستەمکارییەکی هەرچی زیاتر و تەواوتر هەوڵ دەدەن گشت رکابەرێك لەناوبەرن کەدەکەوێتە سەر رێگایانەوە. بەردەوام قسەی ناشرین بەبرا و خوشکەکانیان دەڵێن و بەردەوام ئەوان دەدەنە بەر لێدان وبە هیچ شێوەیەك ئامادەنین خۆشەویستی و پەیوەندیی گەورەتری وەکو دایك و باوك و مامۆستا و سەرۆکی دەستەو,هتد لەگەڵ یەکتری دابەش بکەن. هەروەها بەهیچ شێوەیەك ئامادەنین خەڵکانی دیکە سوود لەوشتە باشانەیان وەربگرن کەهەیانە. لە مێوانداریيەکاندا چ لەماڵەوەو چ لەدەرەوەی ماڵەوە هیچ جۆرە دوودڵییەك دەربارەی داگیرکردنی گشت ساردەمەنی و شیرینی و کەلوپەلەکانی گەمە ناکەن, ئەوەی نەتوانن بیخۆن، لەجیات ئەوەی لەگەڵ خەڵکانی دیکە دابەشی بکەن لێیان دەشارنەوە. لەوشوێنەی کە هەمیشە ئاگری رکابەریەتی و ئیرەیی لەدەروونی ئەواندا لەکڵپەدایە تێنویەتییەکی توندیان بۆ لەپێش دانەوەو پێشەنگایەتیی کردنی خەڵکانی دیکە هەیەو بردنی گۆی یەکەمایەتی لەهەموو کارێکدا حەزی ئەوانەو حەزدەکەن هەموو شتێك بن و هەموو شتێکیان لەدەست بێت. هەرکاتێك بە هۆی رێگای راست و دروستەوە سەرکەوتن وەدەست نەهێنن ,کەمترین دوودڵی لەگرتنە بەری رێگا نادروستەکان ناکەن, چونکە دروشمی ئەوان وەدەست هێنانی سەرکەوتنە بەهەرنرخێك بێت. رێگاو شێوازیان رکابەریەتی و ئامانجیان پاشخستنی خەڵکانی دیکەیە. ئەگەر لە قۆناغی منداڵیدا توندیی ئیرەییان

کەم نەکرێتەوە لەوانەیە بەدرێژایی ژیانیان خەڵکانی دیکەی وەك خوشك و برا بچووکەکانیان لەسەردەمی منداڵیدا- بخەنە ژێر هەڕەشەوە.هەمیشە هەوڵدەدەن لەپێناو شتی پڕوپووچدا خەڵکی وردوخاش بکەن و رکابەرییەکەشیان بە درێژایی ژیانیان بەردەوام دەبێت و دەگاتە ئاستێك گیانی خۆشیان دەخەنە مەترسییەوە, هەر جۆرە شکستێکی وەرزشی یان بازرگانی بەهێدمەیەکی گەورە دەزانن کە هەرگیز چارەسەری نەبێت. لەکاتی لێخوڕیندا هەوڵدەدەن لەپێش خەڵکانی دیکە بدەنەوە. دەبێت لەگەمەی شەترەنجدا هەر ببەنەوە، ئەگەرنا زۆر دڵگران و ناڕەحەت دەبن. هەروەها لەوانەیە بەدرێژایی ماوەی ژیانیان لەبەرانبەر براو خوشکەکانیان درێژە بەپیشاندانی رکابەریەتی و دوژمنکاری بدەن و بەردەوام هەوڵ بدەن سستوسووکیان بکەن و تووشی نەگبەتییان بکەن (چاوبەبەشی هەفتەمدا بخشێنەوە).
لەوانەیە منداڵە ئاساییەکانیش بەرانبەر خوشك و براکانیان ئیرەیی پیشان بدەن, بەڵام ئیرەیی ئەوان ئەوەندە توندو بەهێز نییە و یەکێك لەتایبەتمەندییە سەرەکییەکانی کەسایەتیان پێك ناهێنێت. ئەوان ئازار دەچێژن کاتێ دەبینن براو خوشکەکانیان زیاتر جێگای خۆشەویستیی دایك و باوکن, هەروەها لەوانەیە لەراکێشانی میهرو خۆشەویستیی دایك و باوك کێبڕکێ و رکابەرایەتیی لەگەڵ خوشك و براکانیاندا بکەن، بەڵام هەرلەگەڵ ئەوەی خۆشەویستی و سۆزی دایك و باوك وەدەستبهێنن ئارام دەبنەوەو بەشێوەیەکی هەستپێکراو ئیرەییان کەم دەبێتەوە. هەروەها لەوانەیە حەز بەرکابەریەتی و لەپێشدانەوەی خەڵکی بکەن و بیانەوێت پێشڕەوییان بکەن، بەڵام لەهەمانکاتدا بەپێی دڵخۆشی و سەرگەرمی و گەمەوە چێژ لەپێشبڕکێیە ئاساییەکانیش وەردەگرن و لەبەرانبەر شکست و دۆڕانەکانیاندا زۆر خۆیان نادۆڕێنن و بەشێوەیەکی گشتی بەبێ ناڕەحەتییەکی توند بەشکست رازیدەبن.

## * گرینگی دانی نائاسایی بەمەسەلە سێکسییەکان:-

هەندێك منداڵ زۆر زووتر لەکاتی ئاسایی گرینگی بەمەسەلە سێکسییەکان دەدەن و

بەشێوەیەکی گشتی بەردەوام دەربارەی کاروباری سێکسی قسەدەکەن و شەوان خەون بە رەگەزی بەرانبەرەوە دەبینن و تەواوی بیروخەیاڵیان دەچێتە سەرمەسەلە سێکسییەکانەوە. بەگشتی لەشوێنی نهێنی و تەنیا یان لەبەرچاوی خەڵکان دەستپەڕ لێدەدەن و هەوڵ دەدەن گشت منداڵێك بەبراو خوشکەکانی خۆشیانەوە لەچێژ وەرگرتنی سێکسی پشکدار بکەن وبەنهێنی سەیری لەشە رووتەکان دەکەن و بەردەوام لەهەوڵی ئەوەدان دایك و باوکی خۆیان لەحاڵی عەشقبازی وجووتبووندا غافلگیربکەن. ئەوان ئەودەستە مندالانەن کە زیاد لەسنووری خۆیان کەوتوونەتە ژێر وروژاندنە سێکسییەکانەوە, لەوانەیە بەگشتی لەژووری خەوتنی دایك و باوکی خۆیان و لەتەك براو خوشکەکانی خۆیاندا خەوتبن, یان کەوتبنە نێوداوی کەسێکی پیگەیشتووی لادەرو خراپەکارەوەو بەهەر شێوەیەك بێت بابەتی چێژە سێکسییەکان بەسەر مێشکیاندا زاڵ دەبێت. رێگاو رەوشتی ئەوان دەربری ئەوەیەکە پەروەردەی سێکسییان لەباری ئاسایی خۆی هاتۆتەدەرێ وپێویستیان بە چارەسەرێکی یەکسەرو بێدرەنگ هەیە.

منداڵە ئاساییەکانیش لەبەرانبەر مەسەلە سێکسییەکاندا سەروکارو حەزو ئارەزووی خۆیان دەردەبڕن و، ڕەنگە ڕەگەزی بەرانبەر هەراسان بکەن و دەربارەی عەشق و مەسەلە سێکسییەکان و ژن و مێردایەتی و منداڵبوون گفتوگۆ و گاڵتە بکەن، هەروەها ڕەنگە چێژ لە نەوزاشی خۆیان وەربگرن و هەندێك کات دەستپەڕیش لێدەدەن. بەلام پرۆسە سێکسییەکان تەنیا بەشێك لەژیانیان پێکدەهێنێت.

هەروەها منداڵانی زۆر داوێنپاکیش پێویستییان بەیارمەتی دان هەیە. ئەوان ئەو دەستە منداڵانەن کە هەرکاتێك بە رووتی ببینرێن زۆر دەترسن و دەربارەی باروێزخی لەشیان بەتەواوی و وەکو پێویست ئاگادارنین و زانیارییان نییە, لەکلاسی پەروەردەی جەستەییدا هەست بەناڕەحەتی دەکەن، کاتێك دکتۆر دەیانپشکنێت جا ئەگەر هاوڕەگەزی خۆشیان بێت لەپیشاندانی ئەندامی لەشیان زۆر ناڕەحەت دەبن و ئازار دەچێژن.

## منداڵە زۆر ئازاو توندوتیژە تووڕەکان:

منداڵە زۆر ئازاو رکابەرەکانیش پێویستیان بەیارمەتی و چارەسەری دەروونی هەیە، دەبێت چۆنییەتیی رکابەریەتی و هەستی دوژمنکارانەی منداڵ بەوردی دیاری بکرێت ودرکی پێبکرێت. لەوکاتەی کەرکابەریەتی ودوژمنکاری لەسەرچاوەی جۆراو جۆرەوە هەڵدەقوڵێت،دەبێت بەشێوەیەکی جوداو تایبەتی هۆی هەر بارێك بدۆزرێتەوە بەشێوەیەك کە چارەسەر شایستەی هەر هۆو بارێکی دیاریکراو و تایبەتی بێت.

هەندێك کات رووبەڕووی ئەو منداڵانە دەبینەوە کە پاش دەربڕین و پێشاندانیش رکابەریەتی وتوندوتیژییان کەم نابێتەوەو لەئەنجامدانی هەرجۆرە جوولەیەکی قێزەون و ناپەسندی تێکدرانە هەست بەهیچ جۆرە پەشیمانی و کەموکوڕییەك ناکەن. لەوانەیە هەندێك لەم منداڵانە کرداری زۆر ستەمکارانە ئەنجام بدەن، بەبێ ئەوەی کەمترین شوێنەواری نیگەرانی و پەشیمانیشیان لێ بەدیار بکەوێت. وەکوبڵێی هەر لەبناغەوە هەستی بەزەیی پێداهاتنەوەیان نەبێ و لەلای ئەوان ئاسایش وخۆشگوزەرانیی خەڵکانی دیکە بێ مانایە. هیچ شتێك کاریگەریی لەگۆڕینی شێوازو سروشتی ئەو منداڵانەدا نییە، قەدەغەکردن و ناڕەزایی دەربڕین و رەخنەگرتن لەم منداڵانە بێ ئەنجامەو هیچ جۆرە رێز و بەهایەك بۆ بیروڕای خەڵکانی دیکە دانانێن، تەنانەت بەهۆشداری و تەنبێکردن و سزاش رەفتاریان ناگۆڕێت.

ئەم جۆرە منداڵانە پێویستییەکی گەلێ زۆریان بەیارمەتیی دەروونناسێکی پسپۆڕ هەیە. هەندێك منداڵ تەنیا بەشێك لەکاتی خۆیان بۆ دەستدرێژی و سنوور بەزاندن تەرخان دەکەن، بۆنموونە خووی دلێرانەیان تەنیا لەماڵەوە بەدیاردەکەوێت ویەپێچەوانەوە لەقوتابخانەدا ئارامن , یان بەپێچەوانەوە لەقوتابخانە بەردەوام لەگەڵ هاوڕێیانی بازدەدات و رادەکات و شەڕەشەق دەکات, وەلێ لەماڵەوە لەهەموو روویەکەوە رەفتاری ئاساییە. رکابەریەتی و هەستی دوژمنکارانەی ئەم جۆرە منداڵانە بە (رکابەریەتی و هەستی دوژمنکارانەی کاردانەوەیی) لەقەڵەم دراوە. یان بۆ روونکردنەوە توندوتیژی و تووڕەیی و، ستەمکاری و هەڵاتن لە قوتابخانەو هەرجۆرە رەفتارێکی تێکدرانەی ئەم جۆرە منداڵانە کاردانەوەیەکە لەبەرانبەر

بەدرەفتاریی راستەقینە یان بەدرەفتارییە خەیاڵییەکانی دایك و باوکە. کاتێك ئەم جۆرە منداڵانە دایك و باوکی خۆیان بە گوناهکار دەزانن،بەرانبەر گشت پێگەیشتوانیش زیاترو زیاتر بەدگومان دەبن و بەهەمان ئاراستەش بەردەوام لەگەورە ساڵان دەترسن، چونکە پشت بە سۆزو خۆشەویستییان نابەستن و لە هەرجۆرە نزیکبوونەوەو پەیوەندییەك لەگەڵ ئەوان خۆیان بەدوور دەخەنەوە. جێگیربوون و بەرقەراربوونی پەیوەندی لەگەڵ ئەم جۆرە منداڵانە کارێکی ئاسان نییە. ئەو منداڵانەی دووچاری ئەم هەلومەرجە بوونەتەوە تەنیا لەوکاتە سوود لە شیکردنەوەی دەروونی وەردەگرن کەشیکەرەوەی دەروونی بتوانێت وا لە منداڵان بکات پشتی پێببەستن و بڕوایان پێی هەبێت و لەگەڵ ئەواندا پەیوندییەکی هاوبەشی وەها بەر قەرار بکات کە لەسەر بناغەی ڕێزی هاوبەش دارێژرابێت. هەندێك کات منداڵە ئاساییەکانیش ڕێگای خراپەکاری دەگرنەبەر ,بەڵام ئەم خراپەکارییانە زیاتر لە هەستی پشکنین و بەدواگەڕان و وزەی جەستەیی زیاد و بەشێکیشی لە پاشماوەی ئازارو ئێشەوە سەرچاوە دەگرێت. ڕەنگە ئەم منداڵانە بەهۆی حەزی پشکنین و تووڕەبوونی خۆیانەوە کەلوپەلەکانی گەمە تێکبدەن. بەڵام لەبەرانبەر کەلوپەلی خەڵکانی دیکە ئاگادارییەکی زیاتر و لەبەرچاوگرتنێکی زۆرتر بە خەرج دەدەن, منداڵی ئاسایی دەربارەی شتەکانی خۆی ئەوەندە توندوتیژ و سەختگیر نییە, لەوانەیە پاش گەمەکردن کەلوپەلەکانی گەمەکردن لەجێگای خۆی دابنێت ,یان بەهەمان شێوە پەرتوبڵاوەکەوە کەلوپەلەکانی بەجێبهێڵێت , هەروەها ڕێگا بە گشت منداڵان بدات، گەمە بەکەلوپەلەکانی بکەن، بەبێ ئەوەی زۆر لە تێکچوونیان بترسێت ، کاتێك کەلوپەلێکی گەمەی لێ بشکێنن زۆر ناڕەحەت نابێت و بەردەوام بەدوای کەلوپەلی دیکەی گەمەکردندا دەگەڕێت وتەنانەت پاش گەمەکردنیش خۆی بۆ ڕێکخستنەوەی ژووری گەمەکردن سەرقاڵ ناکات و لەوانەیە ژوورەکەی بەجێبهێڵێت بە بێ ئەوەی کەمترین نیگای بچێتە سەر ئەو شەپرێوی و ناڕێکییەی کە دروستیکردبوو.

## دزییە ئاسایی و باوەکان:

ئەو منداڵانەی کە لە دزیکردندا پێشینەیەکی دوورو درێژیان هەیە، پێویستیان بەیارمەتییەکی یەکسەر و بێ درەنگی دەروونناس هەیە. دزیکردنی بەردەوام نیشانەیەکی مەترسیدارە کە بەشێوەیەکی ئاسایی و باو دیمەن و وێنەیەکی ئێشو ئازاری توندی منداڵانە لەبەرانبەر رەفتارە بەهێزەکانی گەورە ساڵاندا, هەندێك لەومنداڵانە کەمترین رێز و بەها بۆ مافی خاوەنداریەتیی خەڵکانی دیکە دانانێن و هەر لەگەڵ ئەوەی هەلێکیان بۆ رێککەوت دزی دەکەن و چاو بۆدزی دەگێڕن و لەهەرکوێیەك دەستیان بیگاتێ وەکو ماڵێ و خوێندنگاو سەیرانگاو فرۆشگاو ماڵی جیرانان دزی لێدەکەن.... رەنگە چارەسەرکردنی ئەو جۆرە منداڵانە ماوەیەکی زۆر بخایەنێت چونکە بنبڕکردنی ئەم جۆرە دوژمنکارییە لە دڵی منداڵدا کارێکی ئەوەندە ئاسان نییە، ئەو منداڵەی کە ئەم جۆرە دزییە دەکات نابێ بە یەکێك لەو گروپانەی سەرەوە بژمێردرێت و لەوانەیە دزی کردن لەگیرفان و جزدانی دایك لە هەستی تۆڵەخوازیی منداڵ لە بەرانبەر بەدرەفتاریی راستەقینە یان خەیاڵیی دایکەوە سەرچاوەی گرتبێت. رەنگە هەندێ کات منداڵی ئاساییش لەدەرەوەی ماڵەوە دزی بکات. بۆنموونە: لەوانەیە میوەو شیرینی لەدووکانەکان برفێنێت ,یان ئەوشتە نەداتەوە کە بەقستی وەرگرتووە یان دۆزیویەتیەوە. (فرانسیس.ل.ئیلگ (FRANCES.L. LEG) و (لویز.ب.ئەمز (LOUISE.B.AMES) لەکتێبی(رەفتاری منداڵ)دا ئەم مەسەلەیە بەم شێوەیە روون دەکەنەوە: (منداڵ لە تەمەنی پێنج ساڵیدا (پینی) * لە پارەی پێنج شیلنیگی پێ باشترە... لەتەمەنی شەش ساڵیدا گەوهەرێکی دروستکراو سەرنجی رادەکێشێت و لەبەرانبەر چاوانت دەیرفێنیت, کاتێك بەدز لەقەڵەم دەدرێت زۆر بەدرۆی دەخاتەوە. لەتەمەنی حەفت ساڵیدا ئارەزووی بۆ(قەڵەمدارو رەشکەرەوە ئەوەندە بەهێزە کە حەزدەکات هەرچی زیاتردەستی بگاتێ و ئازادانە بیاندزێت. لەتەمەنی هەشت ساڵیدا ئەو پارەیە دەخاتە نێو بازنەی هەواو هەوەسی خۆیەوە کەلەنێو چەکمەجەی کەوەنتەری موبەق دانراوە ، چونکە درکی بەزانینی بەهای پارەو ئەو شتانە کردووە کە دەتوانێت بە پارە بیانکرێت, بۆیە دەست بەرفاندنیان دەکات, کاتێك کە دزییەکەی ئاشکرا دەبێت و بەهۆیەوە تەنبێ وسەرزەنشت بکرێت و

هۆشداریی پێبدرێت ئەو بەگریمانەیەکی زیادەوە وەکو بەرگریکردن لەخۆی دووپاتی دەکاتەوە کە بەهیچ شێوەیەك مەبەستی دزیکردن نەبووەو بەیەکجاری بڕیار دەدات کە لەمڕۆ بەدواوە ئیدی دەستانی خۆی بە دزیکردن پیس نەکات، بەڵام بۆ بەیانیی هەمان ڕۆژ هەمان تاس وحەمامی جارانەو قەوانی جاران لێدەداتەوەو دەبینیینت کە شتێکی دیکە وون بووە). لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەم جۆرە ڕەفتارانەی منداڵان تیژتێپەڕەو ئەوەندە درێژە ناکێشێت کە منداڵ بەرە بەرە گەشەدەکات و، پەی بەمافی خاوەندییەتیی خەڵکانی دیکە دەبات وئاشنایەتی لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی ئەم مافانەدا پەیدا دەکات و دەست لەم ڕەفتارە هەڵدەگرێت.

-PENNY: یەك لەدوانزەی شیلینگە.

## هێندە سۆزییە توندەکان؛

ئەو منداڵانەی تووشی ڕووداوە کتوپڕەکان بوونەتەوە هەر چەندە ئاسایی و سەلامەت و دروستیش بن لەوانەیە تووشی ناڕەحەتیی دەروونیی توندبن. لەوانەیە منداڵ لەبەرانبەر ئاگر گرتنی شوێنێکدا، یان لەبەرانبەر ڕووداوێکی ئوتومبێل و مەرگی کەسێکی ئازیزدا کاردانەوەی مەترسیدار و تۆقینەر پیشان بدات کە بۆ هەمیشە شوێنەواری ترسناکی ئەم ڕووداوانە لەدەروونیدا بمێنێتەوە. لێرەدا چارەسەری یەکسەری منداڵ وەکو پێویستییەکی بێ چەند وچۆن خۆی دەسەپێنێت. ئەو نیگەرانی و دڵە خورپەو شڵەژانەی کە لە مەرگی ئازیزێکدا سەرچاوەی گرتووە پێویستی بە یارمەتیی مرۆڤێکی پێگەیشتووی ئاگادار هەیە و هەر بەهۆی ئەویشەوە بە تەواوی کەم دەبێتەوە. بەو مانایەی کە دەتوانرێت منداڵ هان بدرێت بۆ سوود وەرگرتن لە کەلوپەلەکانی گەمە بە قسە باس لە بیرونەندێشە مەترسیدارەکانی خۆی بکات وهەگبەی زەینی لەبیرونەندێشە مەترسیدارەکان بەتاڵ بکاتەوەو بەرە بەرە بێتەوە سەر باری ئاسایی خۆیەوە.

(ئانافرۆید ANNA FROUD) لەکتێبەکەی خۆیدا کەبەناوی (منداڵەکانی کاتی جەنگە CHUILDREN IN WARTIME) کاردانەوەی منداڵان و گەورە ساڵان لە بەرانبەر بۆمبابارانکردنی لەندەن لەلایەن نازییەکانەوە باس دەکات. ڕوونی دەکاتەوە کە لە پاش شەوێکی بۆمبارانەدا، گەورە ساڵان

بۆکەمکردنـەوەی شـڵەژانی خۆیـان بـەبێ ویـست چـەندین جارخەیاڵەپڕلـە تـرس و تۆقینەکانیان بـۆ خـەڵکانی دیکـە بـاس دەکـرد، لەکاتێکـدا کـە منـداڵان رووبـەرووی هەمان رووداو ببوونەوە دەربارەی ترس و تـۆقینی خۆیـان کـەمتر قـسەیان دەکـرد، بەڵکو هەوڵیان دەدا ترس و کێشە دەروونییەکانی خۆیان لەنێو گەمەدا دەرببڕن. بۆ روونکردنەوە، لـە دەرەوەی پەناگـەکان خانوویـان دروسـت دەکـردوو بۆمبابارانیـان دەکرد. لەم گەمەیەی ئەولندا دەنگی (ئەژیرەکان)° دەهاتن و ئـاگر کڵپـە و بڵیسەی دەسەند و، نەخۆشخانە گەڕۆکەکان بەردەوام بریندارو کوژراوەکانیان هەڵدەگرتەوە. چەند هەفتەیـەکی یـەك لـەدوای یـەك بـەم شـێوەیە هێدمـە رووحـی و هەڵچوونە پڕ لەتۆقینـەکانی خۆیانیـان بەگەمـەکردن دەردەبـڕی، تـەنیا ماوەیـەك پـاش بەرجەستەکردنی ئەم رووداوانە بوو کە منداڵان دەیانتوانی بـەبێ تـرس و نیگـەرانی، بـە قـسە هەسـت و بـیرو ئەندیـشەی خۆیـان بـاس بکـەن. لەکاتـە هەسـتیارەکاندا شیکەرەوەی دەروونی بـۆ یارمەتیـدانی منـداڵان دەتوانێـت هۆکـارە پێویستەکان و کەشـو هەوایـەکی گونجـاوو تایبـەت و پەرسـتارێکی کـارزان و لەبـەر دڵان بخاتـە بەردەست و لەژێر تیشکی گەمەو گێڕانەوەدا ئەو ترسو تۆقین ودڵـە خورپانـە رێشە کێش بکات کە بەسەر دڵی منداڵدا زاڵبوونە.

## منداڵی نائاسایی:

کاتێك کە منداڵێك نیشانەکانی رەفتارو جوولەی سەیروسەمەرەی لێ بەدیار دەکەوێت، دەبێت یەکسەر دەست بەپێکهێنانی دانیشتنی راوێژکاریی دەروونی بکرێت تاکو یەکسەر ئاستی ناڕەحەتیی منداڵ بزانرێت و ئاشکرابێت، ئەو منداڵەی کە ناڕەحەتییەکی دەروونیی توندی هەیە، دەتوانرێت بەئاسانی لەنێو رێزی منداڵەکانی دیکە بناسرێتەوە بەو مانایەی کە هەمیشە گۆشەگیرو تەنیاییخوازەو لەماڵەوەش هەروەکو تاکە کەسێکی نامۆدەمێنێتەوەو نزیکی کەس ناکەوێت و وەڵامی پرسیاری خەڵکانی دیکە ناداتەوەو لەبەرانبەر دۆستی ودوژمنی وتووڕەیی ومیهرەبانیی خەڵکانی دیکەدا جیاوازی ناکات، و هیچ گۆڕانکاریەك لە کاردانەوەکانیدا نایەتەدی. نیگایەکی پەیوەندیدارانەو ئارەزوومەندیی ناخاتەسەر هیچ شتێك و هەرگیز زەردەخەنەی ڕازیبوون وشادومانی لەسەرلێوانیدا نەخش

نابەستێت ونامی غەموخەفەت وکاریگەربوون لەدەروونی بەدەرنییە.
کاتێك لەدایکی جوودا دەبێتەوە لەوانەیە ئارامی وگوێپێنەدانێکی زۆرپێشان بدات, هەروەها کاتێ یەکێك دەستی بگرێت بەئاسانی لە گەڵی دەڕوات، یان بە پێچەوانەوە لەوانەیە بەوپەڕی شڵەژانەوە بەداوێنی دایکی بچەسپێت. چونکە وەك بڵێی جودایی لەدایك دەبێتە هۆی نەبوون و لەناوچوونی. ڕەنگە گشت منداڵان کاتێك لەدایکیان جیادەبنەوە هاوار بکەن وبگریەن, بەڵام دەتوانرێت بەنەوازشکردن ودڵنیایی کردنەوەیان ئارام بکرێنەوە. لەکاتێکدا هیچ جۆرە تەگبیرێك شوێنەوارو کاریگەریی لەکەمکردنەوەی شڵەژان و کەموکوڕییەکان و مەتەڵی منداڵی نائاساییدا نییە.
منداڵی نائاسایی هیچ جۆرە گرینگیەك بەجیهانی دەوروبەری خۆی نادات و لەوانەیە چەندین کاتژمێریی یەك لەدوای یەك لەیەك حاڵ وشوێندا بمێنێتەوە تەنیا گرینگی بەلەشی خۆی دەدات بەبێ ئەوەی بەکەمترین شێوە بنەماکانی دابونەریەتی پەروەردە لەبەرچاوبگرێت, لەوانەیە بەئاشکرا دەستپەڕ لێبدات و لەپێش چاوی خەڵکیدا میز و پیسایی بکات. بەئاسانی چلمی لووتی خۆی دەخوات وتف لەدەموچاوی خۆی و خەڵکانی دیکە دەکات. هیچ جیاوازیەك لەنێوان ئەو خۆراك و شتی دیکەناکات, بەڵکو هەموو شتێك دەخاتە دەمیەوەو لەوانەیە بەردە مردەو گەچ قووت بدات و دەمی خۆی پڕبکات لە زبڵ و شتی پیس, هەڵبەتە هەندێك جار منداڵانی ئاساییش گەچ و گڵ دەخۆن, بەڵام لەم بارەیەوە زۆر پێدا ناگرن و سوور بوونیان نییە.
لەوانەیە منداڵی نائاسایی چەندین کاتژمێری یەك لەدوای یەك بەردەوام کاری یەکریتمی دووبارەبکاتەوە.بۆنموونە:ڕەنگە بەردەوام گرێ لەداوێك بدات یان چەندین کاتژمێر چەکمەجە بکاتەوە و دابخات و مووەکانی خۆی لوول بدات و گوێچکەی خۆی رابکێشێت و پەنجەی خۆی بخاتە نێو کەلێنی دیوارەوەو, بەیەك ڕیتمییەکی سەرسوڕهێنەر چەرخێك بخولێنێتەوە کلیلێك دابخات و بکاتەوەو,پاش و پێش بەدەرگایەك بکات. پێی باشترە گەمەبەقاڵب و دەنکە تەزبێح بکات و سوورە لەسەر ئەوەی کەبیانگەڕێنێتەوە هەمان بارو شێوەی سەرەتا.منداڵی نائاسایی دەربارەی جۆر و ژمارە و شوێنی کەلوپەلەکانی نێو ماڵی خۆی یادگەیەکی سەرسوڕهێنەری

هەیە و، ئەگەر یەکێك ڕێکیانبخات و بیانشکێنێت زۆر نارەحەت دەبێت، هەر لەگەڵ ئەوەی کەلوپەلەکانی بگەڕێنێتەوە باری پێشوو بانگ وهاوارو قیژەی خامۆش دەبێت.

لەوانەیە منداڵێکی نائاسایی لە بەرانبەر ئازاری جەستەیی کاردانەوەی سەیرو سەمەرە پیشان بدات، هەندێك کات بەسەختی ئازاری خۆی دەدات بەبێ ئەوەی کەمترین ئاهوناڵەو سکاڵا بکات. لەوانەیە سەری خۆی لەدیوار بدات و پەنجەی خۆی بخاتە کەلێنی دەرگاو سەری خۆی وەها برینداربکات کەخوێن فیچقە بکات. ڕەنگە تاکە کاردانەوەی لەبەرانبەر ئێش و ئازاردا قاقای پێکەنین و خەندە بێت. کاتێك خەڵکانی دیکە دڵسۆزی و خۆشەویستیی پێ پیشان دەدەن کەمترین کاریگەری و شوێنەوار لە دەروونیدا بە جێ ناهێڵێت.

منداڵی نائاسایی تەنانەت لەوکاتەی کەفێری قسەکردن دەبێت بۆبەستنی پەیوەندی لەگەڵ خەڵکانی دیکە هیچ سەروکارو ئارەزوویێك پێشان نادات، لەکاتی گفتوگۆدا قسەی وەها دەکات کەبەهیچ جۆرێك لەگەڵ ئەو هەلومەرجەدا ناگونجێت کەقسەکەی تێدادەکرێت، لەوکاتەی پرسیاری لێدەکرێت، ڕەنگە وەکو تووتی هەمان پرسیار دووبارەبکاتەوە. یان لەوانەیە هەرگیز قسە نەکات و لەبەرانبەر هەموو شتێکدا بەبێباکی بمێنێتەوەو گرینگی بەهیچ شتێك نەدات.

## ئەو منداڵانەی کە لەچارەسەری دەروونیدا یەکسەر ئە نجام وەدەستدەهێنن:

### منداڵە باشە فریودەرەکان:

هەندێك منداڵان ئەوەندە زیاد لە پێویست باشن کە زۆر زەحمەتە بتوانرێت پێیان باوەڕبکرێت کەلە ڕەفتاری خۆیاندا ڕاستگۆن، بەو مانایەی کەتا ئەوپەڕی گوێڕایەڵ و ڕێکوپێکو پاکیزە دێنەبەرچاو وزیاد لەپێویست چاودێریی سەلامەتی دایك و نیگەرانیی کارو بژێویی باوك و داواکاری کۆمەك پێکردنی خوشکە بچووکەکەی خۆیانن. وا خۆیان دەنوێنن کە لەتەواوی ژیان و تەمەنیان جگە لەدڵخۆشکردنی دایك و باوك هیچ ئامانجێکیان نییە، لەم بارەیەوە ئەوەندە زێدەڕۆیی دەکەن کە بۆ گەمەکردن لەگەڵ هاوتەمەنەکانی خۆیان هێزو وزەیان نامێنێ.

لەوانەیە ئەوجۆرە مندالانە لەقوتابخانەو لەمالی هاوسێیەکانیاندا هەر درێژە بەرەفتاری فریودەرانەی خۆیان بدەن. بەردەوام بەئەدەب ومیهرەبان دەبن و تەواوی کات و وزەی خۆیان لە رازیکردنی ئەو مامۆستایە خەرج دەکەن کەوا لێی دەترسن. لەوانەیە دیاری بۆ بهێنن، وێنە بکێشن و هەمیشە داوای پاککردنەوەی تەختەڕەش بکەن. لەهەمان رۆژی چوونە قوتابخانەدا بەماستاوچیەتییەوە مامەڵە لەگەڵ مامۆستا دەکەن ودڵسۆزی و وەفاو هاوڕێخوازیی خۆیان پێ پیشان دەدەن. بەلام نابێ بەهاو نرخی زیاد بۆ چاپلوسی وئەو قسانەیان دابنرێ کە دەربڕی خۆشەویستی ئەوانە بۆ بەرانبەرەکەیان ، چونکە دەتوانن هەمان ئەم قسانە لەبەرانبەر پیاوێکی نامۆو، تەواوی قوتابییەکانی نێو پۆلەکەیان دووبارە بکەنەوە،لەوانەیە ئەم ماستاوچییەتی ومامە حەمیی وخۆنواندنە چەورو نەرمانە نیشانەی ئەوەبێت کەتا ئاستێکی زۆر پالنەری دوژمنکارانەو پڕ لە رکابەرییان هەیەو،بەم شێوەخۆنواندنە درۆینەوە دەیانەوێ هەست وهەڵچوونی راستەقینەی خۆیان لەهەمبەر خەڵکی بشارنەوە, چونکە دەترسن خەڵکان بەهەستوسۆزە دوژمنکارییەکانیان بزانن وتۆڵەیان لێ بکەنەوە. ، نیشانەیەکی جیاکەرەوەو دەستنیشانکەری ئەم دەستە مندالانە ماندووبونی درێژخایەنە کە بەردەوام باڵی بەسەر بوونیاندا کێشاوە. لەبەر ئەوە لەژێر پەردە و دەمامکێکی زۆر فریودەرانەی (ئەم فریشتە سیفەتانە) زۆربەی جار پالنەری (زۆر ناشرین و ناپەسند) خۆی حەشارداوە. هەوڵی بەردەوامیان بۆ گۆڕینی ئەم پالنەرە دوژمنکاری و پڕ لە ڕکابەرییانە بەکرداری پەسەند و چاودێری و گرینگی دانی بەردەوامیان بۆ رووکەشسازی وفریودەری، ژیان و وزەیان تێکوپێك دەدات و لەناویان دەبات. لەبەر ئەوە هیچ جێگای سەرسوڕمان نییە کە هەمیشە ماندوو و داهێزراوو بێ توانا بێنە بەرچاو. بۆ گۆڕینی رەوشتی ئەم جۆرە مندالانە, دەروونناسی بە ئاسانی دەتوانێت هەنگاو هەڵێنێت ,بەومانایەی کەوایان لێدەکات واز لەم خۆبەکۆیلە پیشاندانە زێدەڕۆیە بهێنن ورێورەسمی ئاسایی ژیان بگرنەبەر، ئەوان لەژێر تیشکی بینین و ئەزموون بەرە بەرە فێردەبن کەهیچ پێویست بەو هەموو فیداکارییە قەڵپانە ناکات وتائاستێکی دیاریکراو دەتوانن پالنەرەکانی خۆیان دەربڕن. بەم رێگایەکەم کەم

ئارەزووەکانی خۆیان دەدۆزنەوەو پێی ئاشنا دەبن وپەی بە هەستەکانی خۆیان دەبەن وناسنامەی خۆیان دیاری دەکەن.

## منداڵە پێنەگەیشتووەکان:

ئەم دەستەیە ئەو منداڵانە دەگرێتەوە کەتەنیا بەشێوەی منداڵی جێگای پەیوەندی و خۆشەویستی و گرینگی پێدانی دایك و باوکیانن نەك وەکو مرۆڤی وا کە لەباری پێگەیشتن دابن و خاوەنی بیرو نیازو مەبەستەکانی خۆیان بن.

ئەومنداڵە چەچەبڤانە کەزیاد لەپێویست و سنووری خۆی ناز پەروەردە دەبن و لەدەرەوەی چوارچێوەی خانەوادەدا بۆ رووبەڕووبوونەوەی راستییەکانی ژیان هیچ جۆرە ئامادەییەکیان نییەو کەمتر هەلی وایان بۆ رێك دەکەوێت گرینگی بەپێویستی و هەستەکانی خەڵکانی دیکە بدەن. ئەوان زۆر بەدژواری و بەشێوەیەکی زۆر نائاسایی خۆشی و دارییەکانی خۆیان لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا دابەش دەکەن. لە بچووکترین گرینگی پێنەدانی دایك و باوك دڵیان دەشکێت, بەردەوام خۆیان لەخەڵکی دەبەنەپێش و ماستاویان بۆ سارد دەکەنەوە، هەرکاتێك خوازیاری شتێك بن، بەهەرنرخێك بێت دەبێ وەگیریان بکەوێت, وابەستەییەکی توند بە دایك وباوك و خوشك وبراو هاوگەمەکانی خۆیان پێشان دەدەن، بەگرینگی پێدان و پێشبینی وچاوەڕوانییەکی زۆرەوە یارمەتی لەخەڵکانی دیکە داوادەکەن و هەمووان وەزاڵەدەخەن, لەجیات ئەوەی خۆیان کارێك ئەنجام بدەن بەردەوام چاوەڕوانن هەمووکارێکیان بۆ ئامادە بکرێت , تەنانەت چاوەڕوانن لەجلوبەرگپۆشین و خۆراکخواردنیش خەڵکان یارمەتییان بدەن و بۆ چوونە دەرەوە لەماڵەوە چەندین کاتژمێر لە چاوەڕوانیدا بمێننەوە. ئەومنداڵانەی کە هەروا بەپێنگەیشتوویی بمێننەوە هەمیشە گرفتاری چەندین گرێی جۆراو جۆرن. لەماڵەوە نارەحەتی و لەقوتابخانە هەراو شەڕو لەهاوسێیەتیشدا کێشە دروست دەکەن.

بەدابەشکردنی ئەم منداڵانە بۆچەند دەستەیەکی جۆراوجۆر، دەروونناس دەتوانێت خزمەتێکی گەورەیان پێشکەش بکات, ژیانی گرووپی هەلیان بۆ دەڕەخسێنێت و یارمەتییان دەدات, بۆ ئەوەی ئاساییانە پەروەردەبن و گەشەبکەن بەهۆی چەند ئەلگۆ و سەرمەشقێکی نوێوە دەتوانن رێگاو شێوازی ژیانیان چاك بکەنەوە. ئەوان

لەمیانی گروپەوە فێری ئەوەدەبن كە لەرووی كۆمەلایەتییەوە چ لایەنێكی رەوشتیان پێشوازی لێدەكرێت و پێشبینی و چاوەروانیی كۆمەلگا لەوان چییە؟ لە ئەنجامدا تێدەكۆشن رێوەرسمی ژیان لەگەل شێوەی رەفتاری هاوتەمەنانیان بگونجێنن, لەنێو گروپدا هونەرە كۆمەلایەتییە سەرەكی وبێشومارەكانی وەك هاوبەش كردن لە سوود وەرگرتن لەكارو چالاكییەكان و بەهای هاوكاری كردنی خەلكانی دیكە فێردەبن و هەروەها فێری ركابەریەتی وناوبژیوانی وهەماهەنگی و چەنە لێدان و هتد دەبن ,بەهۆی ئەم رێگایەوە فێردەبن لەگەل هاوتەمەنەكانی خۆیاندا بژین ولەسەر بناغەی یەكسانی وبەرابەریی ئامادەی گوزەرانكردن دەبن.

## مندالە گۆشەگیرەكان:

دەتوانرێت ئەم جۆرە مندالانە بەشەرمن، دوورە پەرێز، گوێرایەل، تەنیاییخواز، خامۆش و سادە، ناوببرێن. بەزەحمەتێكی زۆرەوە دەتوانن ئەو هەستانە دەربڕن كە لە خۆشەویستی و دلێری داماڵراون. چەند هاوڕێیەكی دیاریكراویان هەیەولەگەمە دەستە جەمعییەكان هەلدێن، لەنێو خەلكیدا هەست بەناڕەحەتییەكی توند دەكەن, لەچاوپێكەوتن ومیوانداریی و هەروەها لەدۆست گرتنیش بە دوور دەكەونەوەو بەردەوام لە چاوەڕوانیی ئەوەدان خەلكانی دیكە دەروازەی هاوڕێیەتی ناوەلا بكەن. بەشێوەیەكی دلخۆشانە ئەوەندە پێشوازی لە هاوڕێیەتی ناكەن ,ئەم مندالە گۆشگیرانە زۆریان لەلا دژوارە وانە بۆ مامۆستاو قوتابیان بخوێننەوەوكاتێ مامۆستا داوای خوێندنەوەیان لێ دەكات زۆر ئازار دەچێژن و, تەنیا بەبەلێ ونەخێر وەلامی پرسیارەكان دەدەنەوە یان لەوانەیە هەر وەلام نەدەنەوە. بەشی زۆری رۆژ لەخامۆشی و گۆشەگیریدا بەسەر دەبن و تەنانەت لەگۆڕەپانەكانی وەرزشیشدا تەنیا دەمێننەوە وبەبێ هۆ لە دەوروبەرو حەوشی گۆڕەپانەكە دەخولێنەوە, كاتێكیش بڕیاری گەمەكردن دەدەن بەئارامی گەمەیەكی وەها هەلدەبژێرن كەپێویستی بەهاوبەشیكردنی خەلكانی دیكەنەبێ.

كاتێك ناچاردەبن پەیوەندییە كۆمەلایەتییەكان ببەستن نیگەرانی و شلەژانیان دەگاتە پلەیەكی مەترسیدارەوە.

شیكردنەوەی دەروونی دەتوانێت لە چارەسەركردنی مندالانی گۆشەگیردا، رۆلێكی

زۆر كاریگەر ببینێت، مرۆڤێكی پێشكەوتوو و كارزان و، هۆكاری سەرگەرمی وجموجۆلاوی و ئەفسوناوی و، یەك دەستە هاوگەمەی گونجاوو دەروونباش، درەنگ یان زوو گۆشگیر لەتەنیایی خۆی دەردەهێنن و پالّی پێوە دەنێن لەگەلّ تەواوی مندالآن تێكەلاّو بێت و گفتوگۆ بكات.

## مندالّە ترسنۆكەكان:

مندالّ وترس هەمیشە وەكو شیرو شەكر ئاوێتەی یەكتری دەبن، لە تاقیكردنەوەیەكی وردا كە چەند سالێك لەمەو بەر دەربارەی شوێنەوارو كاریگەریی ترس لەسەر دەروونی مندالآن لەلایەن دەروونناسەوە ئەنجام درا، بەتەواوی روون بۆوەو سەلمێنرا كە زیاتر لە ٩٠٪ ی مندالآن كەم و زۆر ئازار بەدەست ترسێكی تایبەتییەوە دەچێژن , مندالآنی سێ سالّە زیاتر لەسەگ دەترسن وچوار سالّییەكانیش لەتاریكی دەترسن, بەلاّم ئەم ترسانە بەتێپەربوونی كات كەم دەبنەوە تا لە تەمەنی بیست سالێدا بەتەواوی شوێنەواریان نامێنێت. هۆی ترسی دیكەی مندالآن بریتیە لەئۆتومبێلە ئاگركوژێنەوەكان، ئەژیر، زەوی لەرزین، رفاندن، لێخورینی خێرا، مار، كەوتنە خوارەوە لەشوێنی بلّند، هەندێكی دیكەیان سوورن لەسەر ئەوەی كەلەكاتی چوونە سەر جێگا لەشەودا چرای پشت سەریان رۆشن بێت، ژمارەیەكی دیكە كاتێك گوێبیستی دەنگی ئوتومبێلە ئاگركوژێنەوەكان و، هەوالّی دزیكردن دەبن تووشی ترس وتۆقین دەبن. ژمارەیەك لەمندالّە ترسنۆكەكان پێویستیان بەیارمەتیدان هەیە. ئەوان ئەو مندالآنەن كە لەترسی توندو درێژخایەندا دەژین و ئازار دەچێژن. كاردانەوە توندو بەهێزەكەیان لەبەرانبەر ترس دژواریی بارودۆخیان ئاشكرا دەكات. هەندێك كات پلەی ترسەكەیان ئەوەندە زۆرە – جا ئەگەر ترسەكە بێجێش بێت – بەتەواوی پەرێشان و داهێزراوو بێحالّ دەبن وبێ جوولە دەمێننەوە. بەردەوام نیگەرانی ئەوەن كەنەبادە ئاسمان بەسەر زەویدا برووخێت و، مالّەوە بروسك لێی بدات و لافاو هەمووشتێك وێرانبكات. بەشێوەیەكی گشتی روویەری خەیالّەپڕ لەترسەكانیان هیچ سنوورێكی نییە. ژمارەیەك لەمندالآن لە لەبەرچاوگرتن و گرینگی دان بە پاكیزەیی وخاوێنیدا زیاد لەپێویست رێگای

زێدەڕۆیی دەگرنە بەر, بەڕای ئەوان جیهان لەپیسی نوقومبووەو، بەردەوام نیگەرانن نەوەك پیسبن. هەرلەگەڵ ئەوەی گەرد و تۆزێك لەسەر دەست و جلوبەرگیان بنیشێت نیگەران دەبن و کاتێك نەتوانن بیشۆن تووشی تۆقین دەبن. مندالانی دیکە لەدەنگی بەرز و شوێنی بڵندو، خەڵکانی نەناسیاوو ,دەریاو گۆشە تاریکەکان و مێرووله وردەکان و ئاژەڵە گەورەکان ترسیان هەیە و تا ئەوپەڕی توانا لەو شوێن و چالاکیانە هەڵدێن کەبەڕای ئەوان هەڕەشاوییە, لەوانەیە بەهیچ شێوەیەك نزیکی رووبار نەکەونەوە و، بەسەرپەیژە نەکەون و لەژوورێکی تاریك نەمێننەوە. چارەسەری ئەم مندالانە بەئامادەکردنی زەمینەی ئەو چالاکیانە پێك دێت کەدەبنە هۆی لابردنی مایەی ترسەکانیان. بۆ نموونە: دەتوانرێت وایان لێبکرێت کە بەتفەنگە دەنگ گەورەکانی مەشق نیشانە شکێنی بکەن، یان دەست بەوێنە کێشان بکەن و، خۆیان لە قوڕ وەر بدەن و لەژووری تاریك دابنیشن، ژیان لەنێو گروپدا نایەڵێت منداڵی ترسنۆك ترسی خۆی بشارێتەوەو لە ئەنجامدا دەروونناس دەتوانێت تێبینیی کاردانەوە ترسناکەکانی منداڵ بکات کەوا لەو هەلومەرجەدا لێی بەدیار دەکەوێت ,هەروەها دەتوانێت منداڵەکە لەترس دەرباز بکات، بەم شێوەیە وا لەمنداڵەکە دەکات راستگۆیانە باسی ترسی خۆی بکات و بەرەبەرە توندیی ترسەکەی کەم بکاتەوەو بەسەربیرە لێڵ و تۆقینەرەکانی خۆیدا زاڵ بێت.

## کوڕە کچانییەکان:

هەندێك کات ئەوکوڕانەی کە لەخانەوادەیەکی بێ باوکدا گەشەیان کردووەو پەروەردەکراون، یان لەماڵێکدا کوڕێکی تاقانە لەنێو ژمارەیەکی زۆری خوشکاندا پەروەردە کرابێت و بژیت، پێویستییەکی بێ چەندو چۆنی بەیارمەتیی دەروونناس هەیە. لەوکاتەی کەلەم جۆرە ماڵانەدا بەزۆری سەرمەشق و ئەلگو ژن و کچن، کوڕ ناتوانێت وەکو کوڕ رەفتار بکات وکچانی نەبێت. وبەشێوەیەکی ئاسایی و گشتی، بەپێچەوانەی تەواوی کوڕان سیفەت و تایبەتمەندیی پیاوانەی تێدا گەشە ناکات و هەڵچوون و گوڕو تاو وهێزی کوڕانەی خۆی ون دەکات و لەوانەیە لەهاوبەشی کردن لەگەمەی کوڕانە بەدوور بکەوێتەوە, یان لەکاتی تێکەڵبوون لەگەڵ کوڕان هەست بەناڕەحەتی بکات و لەکەناری کچاندا ئاسوودەترو خەیاڵ رەحەتتربێت. ئەم جۆرە

کوڕانە زۆربەی جار دەبنە جێگای هێرش کردنەسەرو سنووریان دەبەزێنرێت و بەناوو ناتۆرەی ناشرینەوە پەنجەیان بۆ درێژدەکرێت، بەشێوەیەك کە بەزۆری لەرووی کۆمەلایەتییەوە زیانیان پێدەگات و لەرووی سۆزییەوە ئازار دەچێژن وبریندار دەبن، لەوانەیە لەکاتی پێگەیشتندا لەگێڕانی رۆڵی کۆمەلایەتیی خۆیان سەرکەوتن وەدەست نەهێنن. ئەو جۆرە مندالانە پێویستیان بەیارمەتیدان هەیەو بەدەستنیشانکردنی سەرمەشقێکی پەسندو بەهێزکردنی لایەن وتایبەتمەندییە پیاوانییەکانیان دەتوانرێت بەرەبەرە کەموکوڕییەکانیان نەهێلدرێت.

## کردارە ناپەسندو ناپێویستەکان:

هەندێك لەمندالان بەئەنجامدانی چەند رەفتارێکی ناپێویست بەردەوام دایك و باوکی خۆیان نارەحەت دەکەن، بۆنموونە چاوی خۆیان خێل دەکەن، بەدەنگی بەرز بۆن هەلدەمژن، دەمەلاسکە دەکەن، لەشیان دەلەرێننەوەو، چاوو برۆ هەلدەتەکێنن و ، قورگیان پاك دەکەنەوەو، شانیان هەلدەتەکێنن و، پەنجەو نینۆکیان دەجوون و قرچە لەپەنجەکانی دەستیان دێنن ، یان پێ لەزەوی دەکوتن. لەوانەیە ئەم رەفتارانە ئەوەندە ناپەسندبن کەیەکسەر پێویست بەوە بکات دایك و باوك سەرنجی بخەنەسەرو گرینگی پێبدەن، چونکە لەوانەیە بەهۆی ئەو رەفتارە درێژخایەن و دووبارانەوە شێوەی پەنجەکانیان بگۆڕێت و، پێستی لەشیان هەوبکات و نینۆکەکانیان ئازاریان پێبگات ،لەئەنجامدا زیانێکی تەواو بەدروستی و سەلامەتیی مندال بگات. جگە لەو دەنگە ناپەسندو قێزەونانەی لووت و سینگ و گرێی پەنجەکان, دەرەنگ یان زوو دەورووبەرو خەلکی بێزاردەکەن, لەبەرئەوە دەبێت بۆ چارەسەرکردنی ئەم جۆرە مندالانە پرسوڕا بەدەروونناس و پزیشك بکرێت و رێگا چارەیان بۆ دەست نیشان بکرێت.

هەروەها لەوانەیە هەندێك کات مندالە ئاساییەکانیش ئەم رەفتارە ناپەسندو ناپێویستانە بکەن، بەلام کەمتر خووی پێوەدەگرن و بەگشتی لەکاتی ماندوویی و پەرێشانیی توندو خەوالووبوون و شلەژان و لەژێر کاریگەریی سۆزە توندەکاندا ئەم

رەفتارانە دەکەن.

## تەڕکردن و پیسکردنی پێخەف:-

بەپێی ئەو ئامارانەی کەبەشێوەیەکی رێژەیی وردن، نزیکەی ١٠ـ ١٥٪ ی منداڵان پاش تەمەنی چوار ساڵی هەرپێخەفی خۆیان تەڕدەکەن و تەنانەت هەندێکیان لەکاتی رۆژیشدا ناتوانن کۆنترۆڵی خۆیان بکەن، زۆربەی ئەو منداڵانە بەهیچ جۆرێك کۆنترۆڵیان بەسەر میزکردنی خۆیاندا نییەو هەرلەگەڵ ئەوەی جێگاکەیان وشکبۆوە دووبارە تەڕی دەکەنەوە.

بەشێوەیەکی گشتی ئەوخووە نیشانەی ناڕەحەتیی منداڵەو تەنیا لە ٥٪ ی بۆ هۆیە جەستەییەکان دەگەڕێتەوە، ئاساییە کەلەپێناو بنبڕکردنی ئەم دیاردەیە دەبێ سەردانی پزیشك بکرێت.

تەڕکردنی پێخەف بەتەنیا ئاستی ناڕەحەتیی منداڵ پیشان نادات، چونکە هەم لەبارە مامناوەنجییەکان و لەبارودۆخە توندو تیژەکانیشدا هەندێك کات دەبینرێت کە بەچەند رێگایەکی کورت و سادە چارەسەر دەکرێت و هەندێك کاتیش بەزەحمەتی و دژوارییەکی زۆرەوە چارەسەردەکرێت.

هەرکاتێك پیسکردنی پێخەف دوای تەمەنی سێ تاچوار ساڵیش درێژە بکێشێت، ئەوە نیشانەی گیروگرفتی سۆزییە، تەنیا ئەو حاڵەتە نەبێت کە پزیشك هۆیە جەستەییەکەی دۆزیبێتەوە. ئەم خووە تاتەمەنی ٥ساڵی لەنێو منداڵاندا زۆر بەدی دەکرێت. بەڵام لەنێو رێزی ئەو منداڵانەش دەبینرێت کە تەمەنیان گەیشتۆتە قۆناغی شەشساڵی و بەسەرەوە. هەرچەندە منداڵ گەورەتربێت و ئەم دیاریدەیەشی لێ ببینرێت مەترسییەکەی زیاتر دەبێت.

پیسکردنی پێخەف بەشێوەیەکی گشتی رووخساری یاخیبووانەی منداڵ لەبەرانبەر کارە بەهێزو رەفتارە توندو تیژەکانی دایك و باوك پیشان دەدات، هەروەها کاردانەوەیەکە بۆ رەفتاری توندو تیژی دایك و باوك لەپاك کردنەوەی منداڵ.

لەوانەیە سەرزەنشتکردنی منداڵ مەسەلە کە دژوارترو سەختتر و بەرگریش تووندتر بکات. ئەم دوو خووە ناپەسندە ئەوەندە دایك و باوك ناڕەحەت دەکەن کەجێگای خۆیەتی تەنانەت لە هەلومەرجە بچووکەکانیشدا یەکسەر پرسورا بە دەروونناس بکرێت. لەهەربارو شێوەیەك دابێت پەیوەندییەکانی نێوان دایك و باوك ومنداڵ کاریگەری و شوێنەوارێکی گرینگی لە چارەسەرکردنی ئەم مەسەلەیەدا هەیە.

## بەشی دوازدەهەم

### ئەو دایك و باوکانەی پێویستیان بەچارەسەری دەروونی هەیە.

- کەسایەتیی دایك و باوك و رەفتاری منداڵان.
- دایك و باوکە هەڵچوو و تووڕەکان.
- دایك و باوکە دوودڵەکان.
- دایك و باوکە منداڵانییەکان.
- دایك و باوکە گومڕاکەرەکان.
- دایك و باوکە منداڵ دەرکەرەکان.
- ئەرکناسە زێدەڕۆیەکان.
- ئەو دایك و باوکانەی بەهۆی تەڵاقەوە جیابوونەتەوە

## کەسایەتیی دایك و باوك و رەفتاری منداڵان:

هەمیشە کەسایەتیی منداڵ رەنگی کەشوهەواو دەوروبەری سۆزیی ماڵ وەردەگرێت، ئەم راستییە لەهەموو روویەکەوە رۆشن خۆی دەنوێنێ. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئێمە لەساڵەکانی کۆتاییدا توانیومانە لەرووی زانستییەوە پەیوندیی نێوان خووی دایك و باوك لەگەڵ رەفتاری منداڵ جێگیر بکەین. هەندێك رەفتاری دایك و باوك ئاشکراو راشکاوانەیە بەشێوەیەك کەمنداڵ بەباشی دەتوانێت بیانبینێت و وەکو سەرمەشقی خۆی دایبنێت. هەندێك جوولەی دیکە داپۆشراوو نهێنیترە و منداڵ دەتوانێت تەنیا بیهێنێتە خەیاڵی خۆی و شتێکیان لێ هەڵبهێنجێت. روونوئاشکرایە، کە دایك و باوکی زۆر هەستیارو منداڵکار، یان عەرەقخۆرو گومڕاکارو، پشتگوێخەرو گوێپێنەدەر و زیاد لەپێویست بەویژدان و ئاکاری، بۆمنداڵەکانی خۆیان نابنە نموونەو سەرمەشقی پەسەند.

## دایك و باوكە هەڵچوو و تووڕەكان:

### ڕێگا و شێوازە تایبەتییەكان و ڕەفتاری كۆمەڵایەتی:

ئەو منداڵانەی كە دایك و باوكیان هەڵچوو تووڕەن بەئاسانی دەناسرێن, چونكە سوورن لەسەر ئەوەی كە خۆیان بە هەموو كەسێك بناسێنن و لە هەمووشوێنێك قسەی خۆیان بسەلمێنن و لەهەمان سەردەمی منداڵییەوە فێریان كردوون كە هەركاتێك بیانەوێت قسەكانیان ببەنە گوێی خەڵكی دەبێت بنەڕێننن و هەركاتێك بیانەوێت یەكێك قسەیان پێ نەبڕێت دەبێت بەتوندی و پێ بەپێ و بەردەوام قسە بكەن. ئەوان هەروەكو ئاوێنەیەكی ڕاستگۆ تووڕەو توندیی دایك و باوكیان پیشان دەدەن. زۆربەی جار دایك و باوكی منداڵانی لەم جۆرە , ئاگایان لە تووڕەییە بێسنوورو، توندیی هەڵچوونی خۆیان نییەو هەركاتێك كەسێك كەموكوڕییەكانی خۆیانیان پێبڵێت و پەنجە بۆ كەموكوڕییەكانیان درێژبكات، لەوانەیە بەشانازییەكی تایبەتییەوە بەیەكێك لە هەڵقوڵاوی تایبەتمەندییە نەژادی وخانەوادییەكانی خۆیانی بزانن. مادام ئەوان لەمیانی گروپە دیاریكراو و هاودەم و هاوڕەگەزەكانی خۆیانەوە ژیان بەسەر ببەن لەوانەیە ئەوەندە زیانیان نەبێت, بەڵام كاتێك لەگەڵ كۆمەڵێكی گەورەتر سەروكار پەیدادەكەن دەبنە هۆی ناڕەحەتی, بەومانایەی كە بەردەوام قسەی بێ بنەماو زۆربڵێیی دەكەن و بەهەڵە بابەتەكان هەڵدەسەنگێنن و شتەكان تێكەڵ و پێكەڵ دەكەن و كاتی خەڵكانی دیكە بەفیڕۆ دەدەن. زۆربەی جار حەزدەكەن قسە بۆ خەڵك بكەن و بەپێچەوانەشەوە كەمتر گوێ لەقسەی خەڵكان دەگرن. وەكو ئەكتەرەكانی سەر شانۆ هەوڵدەدەن سەرنجی خەڵكی بۆلای خۆیان ڕابكێشن، بەڵام ئاگایان لەو شوێنەوارو كاریگەرییە ناپەسندانە نییە كە لەدەروونی بینەرەكاندا بەجێیان هێشتووە.

لەوانەیە ئەم جۆرە دایك و باوكانە لەلایەنی دەروونییەوە گرێیەكی دەروونیی تایبەتیان نەبێت، بەڵام لەڕووی كۆمەلایەتییەوە مایەی زەحمەت و هەراسانكردنن ,لەبەرئەوە بۆچاككردنەوەی ڕێگاو شێوازە تایبەتییەكانی دابونەریتی كۆمەڵایەتیی خۆیان پێویستیان بەیارمەتی دان هەیە.

## دایك و باوكە دوو دڵەكان:

### گرینگی دانی بەردەوام بەشتە بچووكە كانی ژیانی منداڵ

دایك و باوكە دوودڵەكان دەربارەی بچووكترین ئەو مەسەلانەی كە پەیوەندیدارن بەمندالآن راراو دوودڵن، ئەو جۆرە دایك و باوكانە لەهەمان ئەو ساتەی كەمنداڵ پێدەنێتە گۆرەپانی ژیانەوە، دەربارەی ژیانی منداڵەكە دووچاری راڕایی و دوودڵی دەبن. ئەوەی بۆ زۆربەی دایك و باوكان ئاساییە, بۆ دایكێكی راڕاو دوودڵ لایەنی ژیان و مردنی تێدا دەبینێت. ئەو وەكو ئەو كەسە وایە كە لەدووهەنگاو جارێك مەكینەی ئۆتومبێلەكەی چاو لێدەكاتەوە نەكا لەهەنگاوی دواتر لە ئیش بكەوێت, زۆر زۆر چاودێریی مەكینەی ئوتومبێلەكەی دەكات نەوەك بەم زووانە لەكار بوەستێت و, رۆژێ چەندین جار تێبینی هەناسە هەڵكێشانی منداڵەكە دەكات و خۆراكەكانی تام دەكات، زۆر بەوردی سەیری پیسایییەكانی دەكات و دەربارەی خەوی نیگەران دەبێت. هەرلەگەڵ ئەوەی منداڵەكەی لەسەرپێ بووەستێت لەوە دەترسێت بكەوێت , هەركاتێك رابكات دەترسێت بەر بێتەوەو هەر لەگەڵ ئەوەی تای بێتێ، دایكەكە وا خەیاڵ دەكات كە منداڵەكەی بە زوویی دەمرێت.

بە ڕاستی دایكێكی ئاوا لە مانای ژیان ناگات و ساتێك نییە كارێكی نا پێویست بۆ منداڵەكە ئەنجام نەدات. ئەو شتەی كە خۆی بتوانێت لە جێگای منداڵەكە ئەنجامی بدات نابێت منداڵەكە دەستیان بۆبەرێت, تەنانەت ئەگەر خۆشی حەز بكات و ئەنجامدانیشی ئاسان بێت. دایكێكی ئاوا, زیاد لە پێویست جل لەبەر منداڵ دەكات و بە شێوەیەكی نائاسایی خواردنی دەرخوارد دەدات , ئەگەر بتوانێت تەنانەت لەجیات منداڵەكە خۆراكەكەش هەرس دەكات.

بەكورتی دایك بەشی هەرە گەورەی ژیانی منداڵ لە ئەستۆ دەگرێت و,ئەنجامی ئەمەش زۆر دژوارو مەترسیدارە، بەو مانایەی كە منداڵ گەشەدەكات, وەلێ بەپێنەگەیشتوویی دەمێنێتەوە. لەوكاتەی كە لە راستیدا لەگەڵ كەسێكی قەرزخواز ژیاوە لە پەروەردە كردن و گە شەپێدانی كەسایەتیی خۆی دەستەوە وەستان دەمێنێتەوەو تاكۆتایی ژیانی ولبەستەی دایكی دەبێت. زانیاری و ئاگاداری لەسەر هەست و ئارەزووەكانی خۆی نییەو كەمترین زانیاری لەسەر نەرێتە

کۆمەڵایەتییەکاندا هەیە، چونکە زۆربەی جار دایکی لەجیاتی ئەو بیری کردۆتەوەو بڕیاری داوە، بەزەحمەت دەتوانێت بیربکاتەوەو هەر بەهەمان ئاراستەش دەربارەی دەروونی خۆی و جیهانی دەوروبەری زانیارییەکی کەمی هەیە و هۆ ناگەڕێنێتەوە بۆ ئەنجام ،بەدەربڕینە سەر سوڕهێنەرەکان دڵخۆشدەبێت ، ئەم جۆرە منداڵانە بەشی هەرە گەورەی وزەو توانای خۆیان لە پێناو کێشمەکێشی نێوان وابەستەیی بەدایك لەلایەك و ئارەزووی سەربەخۆخوازیی دەروونیان لەلایەکی دیکەوە خەرج دەکەن. ئەم جۆرە دایك وباوکە ڕاڕاو دوودڵانە هەرکاتێك بیانەوێت سەر لە نۆی بناغەی پەروەردەکردنی منداڵەکانیان دابڕێژن بێگومان دەبێ بچنە لای دەروونناسەوە

## دایك و باوکە منداڵانییەکان:

### منداڵ وەك کەلوپەلی گەمەپێکردن و پاسەوان

کاتێك هەندێك ئافرەت دەبنە دایك جێگیرکردن و بەرقەرارکردنی پەیوەندییەکی پایەدارو پتەولەگەڵ منداڵەکانی خۆیان زۆر بەدژوار دەزانن. گەرچی ئاماوەیەك چێژ لەبوونی منداڵ وەردەگرن و هەر وەکو کەلوپەلێکی گەمە مامەڵەی لەگەڵ دەکەن، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ناتوانن بەرگەی باری لێپرسراویی دایکایەتی بگرن.

خودی ئەوان پێویستیان بەوە هەیە چاودێرییەکی دایکانە بکرێن و دەیانەوێت ئەم چاودێرییە لەجگەرگۆشەکانیان ببیننەوە, بۆیە بەردەوام لەتاقیبدان. بەم ڕێگایە چاوەڕوانن لەلایەن منداڵەکانیانەوە یارمەتی بدرێن و ئاسایشیان بۆ دابینبکرێت و بەهەمان هۆش ڕۆڵەکانیان ناچارن پارێزگاری لەدایکیان بکەن, دڵخۆشکردن وسەرگەرمییان بۆ فەراهەم بکەن و بەردەوام نیگەرانی سەلامەتی و ئارامیی دایکیانبن, لەو کاتەی کە وەدیهێنانی گشت خواستەکانی دایك لە ئەرکی ئەوان بەدەرە هەمیشە گرفتاری شکست ودوودڵی ودڵەخورپە دەبن و، سوودێك لەخێرو خۆشییەکانی سەردەمی منداڵی وەر ناگرن و بەهەستی کەموکوڕی و خۆخوری گەشەدەکەن و پەروەردە دەبن. ئەم جۆرە دایکانەش پێویستیان بە چارەسەر هەیە.

## دایك و باوكی ڕاهاتوو بەعەرەقخۆری:

### لافاوە كتوپڕو هەڵاتنە وەرزییەكان:

منداڵی دایك و باوكێكی راهاتوو بە عەرەقخۆری، هەمیشە گرفتاری لافاور شەڕو كێشە بێ بناغەو كتوپڕەكانن. منداڵەكە دەبینێت كە كتوپڕ دایك و باوكی رەوشتیان دەگۆڕێن و رێگای هەڵچوون و توندوتیژی وبەهانەخوازی دەگرنەبەرو ڕووداوی جۆراوجۆر دروست دەكەن. ئەو دەزانێت كە لەم هەلومەرجانەدا هیچ شتێك بەقەد شووشەی عەرەقێك بۆ دایك و باوك گرینگیی نییەو بە هەمان هۆش هەست بەبێ یارو یاوەری دەكات.

هەرگیز شوێنەواری بەدمەستیی دایك و باوك لە زەینی منداڵ رەش نابێتەوە. منداڵی بێ گوناه بەچاوانی خۆی دیمەنی لە ناوچوونی ئاسایش و پایەكانی ژیانی خۆی دەبینێت. دایك و باوكی بەسەرگەردانی وتووڕەیی و، بێ تواناو چاو بەفرمێسك و ستەمكار و دڵڕەقی دەبینێت وبەهیچ جۆرێك ناتوانێت درك بەم جیهانە پیسە بكات، لەوانەیە ئێستا ناچار بێت پەرستاریی بۆ دایك و باوكە مەست وبیمارەكانی بكات.

لەوانەیە دایك و باوكی راهاتوو بە عەرەقخۆری تا ئەوپەڕی پەیوەندی و خۆشەویستییەكی توندوتۆڵیان لەگەڵ منداڵەكەیاندا هەبێت، بەڵام بەهۆی گرفتە بێشومارەكانی خۆیان ناتوانن بەردەوام گرینگی بەمنداڵەكانیان بدەن وچاودێرییان بكەن ,لەبەرئەوە بۆچارەسەركردنی گرفتەكانی خۆیان پێویستیان بە یارمەتیی دەرەكی هەیە.

## دایك و باوكە گومڕاكەرەكان:

هەندێك دایك و باوك لەم خاڵە ئاگادارنین كە لەوانەیە منداڵەكانیان لە رووی سێكسییەوە چاو لەوان بكەن و لەبەرانبەر ئەواندا كاردانەوی سێكسیی پیشان بدەن. لە ئەنجامدا نەزانراوانە هەستی سێكسیی منداڵەكانیان لە بەرانبەر خۆیاندا بەهێز بكەن. ئەو باوكەی كە لە پێش چاوی كچەكەی جلوبەرگ دادەكەنێت, یان ئەو دایكەی بەردەوام كوڕە شەش حەوت ساڵەكەی لەگەڵ خۆیدا دەباتە گەرماو، هەستە سێكسی و خەیاڵكردنە عەشقییەكانی منداڵەكەی دەجوڵێنێ, هەندێك دایك و باوك

مۆڵەت دەدەن کە منداڵەکانیان لەتەکیاندا بخەون و لەنەوازشی بەرابەردا رێگای زێدەڕۆیی بگرنە بەر. هەندێك دایك و باوك ماچکردنی لێوو راگوشینی منداڵەکانیان لەئامێزی خۆیان بەزیانبەخش نازانن. ژمارەیەکی دیکە دەربارەی منداڵانی خۆیان رستەی عاشقانە بەکار دەهێنن و منداڵانی خۆیان بەدڵدار و دوڵبەر دادەنێن، چاوەڕوانی ئەوەن منداڵەکانیان رەفتارو شێوازی عاشقانەیان لەگەڵدا بکەن. هەندێك دایك حەزدەکەن لەگەڵ کوڕەکانی خۆیان سەما بکەن و تەنانەت لەو کاتانەی کە جلوبەرگی مەلەوانیکردنیشیان لەبەرە واز لەم جۆرە سەما هەستبەخشانە ناهێنن. ئەم جۆرە رەفتارە لە پەروەردەکردنی سێکسیی منداڵدا شوێنەوارو کاریگەریی نابەجێ بەجێدەهێڵێت. ئەو کچانەی کە لەماڵی باوکێکی ئاوادا گەشەیان کردبێت، حەزدەکەن لەگەڵ پیاوە بەتەمەنترەکان چێژی سێکسی وەربگرن. هەروەها ئەو کچانەی کە لەتەك دایکێکی ئاوادا گە شەبکەن، وپەروەردەبن، بەهۆی وروژاندنە سێکسییەکانەوە پێش تەمەنی سروشتی خۆیان دەچنە نێو رووداوی سێکسییەوە، بەپێچەوانەوە لەوانەیە هەندێك کات مامەڵە سێکسییەکانی دایك و باوکی خۆیان ئەوەندە رەتبکەنەوە کە لە سەردەمەکانی پێگەیشتندا خۆیان لەپەیوەندییە سێکسییەکانی هاوسەریش بەدوور بخەنەوە، یان لەگەڵ هاورەگەزەکانی خۆیان دەست بە عەشقبازی بکەن،بۆیە دایك و باوکی گومڕاکەریش پێویستیان بە یارمەتیی دەروونناس هەیە.

## دایك باوکە منداڵ دەرکەرەکان:

### وازهێنانی جەستەیی و هەڵاتنی سۆزی:

زۆربەی دایکان و باوکان تەنانەت ناتوانن ئەم بیرە بخەنە خەیاڵگەی خۆشیانەوە کە لەوانەیە دایکێك لە کوڕەکەی بێزاربێت ،بەخوێندنەوەی هەواڵەکانی رۆژنامەکان کەدەربارەی منداڵە دەرکراوەکان وئەومنداڵانەیە کەبوونەتە هۆی ئەوەی سنووری دایك و باوکیان ببەزێنن، دایکوباوکان نوقمی سەرسوڕمان دەکەن. تەنانەت ئەوجۆرە دایك و باوکە هەرگیز بڕواناکەن کە دایکێك واز لەکوڕەکەی بهێنێت. بەپێچەوانەوە کەمکردنەوەی سۆز بەربڵاوترەو رەواجی هەیە. زۆربەی دایك و باوکان

پارێزگاریی ئەو خۆشەویستییە لەبەرچاوناگرن کە بۆ پەروەردەی سروشتیی منداڵ سەرەکی وبنەڕەتییە ,ئەم هەڵاتن وخزینە سۆزییە لەچەند سەرچاوەیەکی جیاوازەوە هەڵدەقوڵێت کە دەتوانرێت بەم شتانە ناوبنرێن: پێنەگەیشتن و دەرچوون لەرۆڵە سێکسییەکان و ناهاوسەنگی وشڵەژانە دەروونییەکان و ئاڵۆزییە دەروونییەکان و هەڵاتنی سۆزی وچەندین رووخسارو شێوەی هەیە. لەوانەیە بەشێوەی عەیبگرتنی بەردەوام لەمنداڵ وسووربوون لەسەرکەماڵێکی زیاتر بەدیاربکەوێت ,یان ڕەنگە بەشێوەی گوێ پێنەدانی تەواو بەچارەنووسی منداڵ و هەندێك کاتیش بەشێوەی خۆپێشاندان بەدەربڕینی خۆشەویستیی فراوان و چاودێریی زێدەڕۆ یانە بەدیاربکەوێت.

لە راستیدا منداڵە دەرکراوەکان پەیامی بێزاری و بێتوانیی لەدایك و باوکی خۆیان وەردەگرن کە کەمو زۆر ناوەڕۆکەکەی بەم شێوەیە :(بێ هۆهەراسان وماندووم مەکە زوو گەشەبکەو من لەشەڕی خۆت رزگار بکە).

ئەم جۆرە دایك و باوکانە بۆیە لە منداڵانی خۆیان بێزارن چونکە حەزدەکەن لەگشت جۆرە بەڵێندان و لێپرسراویەتی و ئازارو رەنجێك بەدووربن. بەخێرایی خواردنیان دەدەنێ و بەخێرایی دەیانبەنە ئاودەست و ئەوان بەهیچ شێوەیەك ئامادەی قەبوڵکردنی ئەو لێپرسراویەتییە نین کە لەوان دەخوازرێت. لەوکاتەی کە ئەم جۆرە منداڵانە بەرلەساتی ئاسایی بە زۆر ئازادی بەدەست دەهێنن، بەردەوام دووچاری ترس وشکست ورەخنە لێگرتن دەبنەوە، بەردەوام لەچاوەڕوانیی رەخنە لێگرتن وسەرکۆنەکردنن ,گشت گرینگیپێدانیان بۆکۆکردنەوەی بەڵگەو بیانووە بۆئەوەی بەرگری لەخۆیان بکەن, ژیانیان بەشێوەیەکە وەکو بڵێی بەجووری لەدایك بوون کێشراوەنەتە دادگا ودەبێ پارێزگاری لە خۆبکەن، ئەوان ئەوەندە سەرقاڵی(گوناهە نەکراوەکانی) رابردوو ودوودڵی وجڵەوگیرکردنی مەترسییەکانی ئایندە دەبن کە بەباشی ناتوانن ئەرکەکانی ئێستایان ئەنجام بدەن.

گرینگی دانی بەردەوامیان بە مەترسی و بەرگری لەخۆکردن بارێکی ئەوەندە سەنگینە کە لەرووی سۆزییەوە ئەوان وەزاڵەدێنێت و, لەلایەنە جەستەییەکاندا بێتوانایی پیشان دەدەن, هەرکاتێك بڕیاربێت کە ئەم منداڵانە بەبەختیاری و

ئاسودەیی ببینرێن دەبێت بێ سێ و دوو ,هەم خۆیان و هەم دایك و باوكیان چارەسەری دەروونییان بۆبكرێت.

## ئەركناسە زێدەڕۆكارەكان:

( پێشكەشكردنی بەختباشی لەسەر تەبەقی زێڕ) - ژمارەیەكی زۆری دایك و باوكان كەلە ئەركناسیدا رێگای زێدەڕۆیی دەگرنەبەر بۆ پەروەردەكردنی منداڵانی خۆیان پێویستیان بەرێنمایی هەیە,لەوانەیە زۆر ئەركناس وفیداكارین، بەڵام بەهۆی زێدەرۆییكردن لەئەركناسیدا زیانێكی گەورە بەمنداڵانیان دەگەیەنن, ئەوان سوورن لەسەرئەوەی كە بەهەرنرخێك بێت منداڵی خۆیان ئاسوودە بكەن, تەنانەت ئەگەر ئەم ئاسوودەییە ببێتەهۆی لەناوچوون وفەوتانی منداڵەكەش. بۆ ئەوەی كەمترین ناڕەحەتی لەدڵی منداڵ پەیدانەبێت خۆیان دەخەنە نێوئاو وئاگرەوەو, هەر كاتێكیش لەو تێكۆشانەدا شكستیان خوارد هیچ گرینگییەكی پێ نادەن, ئاگاداری ئەو راستییەنین كە ئاسودەیی، خۆی لە خۆیدا ئامانجێكی دیاریكراو نییە بەڵكو دەرەنجامی كارو گەمەو عەشق و ژیانە، حەزبكرێت و حەزنەكرێت ژیان پێویستی بەسنوورێكی جیاكەرەوەی نێوان ئارەزوو و تێركردنی ئەم ئارەزووانە هەیە, لەنێوان دانانی نەخشەو جێبەجێكردنی نەخشەدا پێویستمان بە تێپەڕبوونی كات هەیە. بە واتایەكی دیكە ژیان بریتییە لە ئازارو هەروەها بەرگەگرتنی ئازارەكان. هەڵبەتە ئێمە نەخشە بۆ دروستكردنی ئێشو ئازار ناكێشین، چونكە بیماری وناخۆشیش پێشبینی ناكەین، بەڵام كاتێك كە منداڵێك ئازاری پێگەیشت، نابێ دایك و باوكەكە خۆیان ئازاربدەن, كاتێك منداڵێك دەگریەت هیچ پێویست بەوەناكات دایك (هەزار سەرمەقولات لێبدات تاكوخەندەی لێوی منداڵەكە بگەڕێتەوە، )جگە لەمەش منداڵ پێویستی بە پەروەردەكردنێكی ئاقڵانە هەیە كە لەسەربناغەی خووگرتن بە ئازاردان وهەستكردن بە كەموكوڕی دانەڕێژرێت.

كەكاتێك داخوازییە لۆژیكی و بچووكەكانمان ڕووبەڕووی گریەو بانگو هاواری منداڵ دەبێتەوە، باشترە سووربین لەسەر ئەوەی كە منداڵەكە فەرمانەكەی ئێمە جێبەجێ بكات وگرینگی بەناڕەزاییەكانی نەدەین, ئارامكردنەوەی منداڵ هیچ كاریگەرییەكی لەچاككردنەوەی بارودۆخدا نییەو دەبێت ئاگامان لەوەبێت كە حەزبكەین و

حەزنەکەین هەندێك هەور دەبنە باران. تەنیا ئەو کارەی کە دەتوانرێت بکرێت ئەوەیەکە ئارامی و دانبەخۆداگرتن پیشان بدرێت تا لافاوەکە دەنیشێتەوە, منداڵان هێز و ئارامی لە تواناو هێزە نەلەرزیوەکەی ئێمە وەردەگرن.

## ئەو دایك و باوکانەی بەهۆی تەڵاقەوە جیابوونەتەوە:

نمایشکردنی خۆشەویستی و دۆستایەتیی قووڵ: تەڵاق وەکو برانی دەست وپێ تاقیکردنەوەیەکی تاڵ و نائاساییە کە برینەکەی لەرووحدا سارێژ نابێت، بەڕای دایکان و باوکان وەك کۆتایی هاتنی زۆربەی خەون وخولیاو ئارەزووە شیرینەکانەو,لەوانەیە بەڕای منداڵانیش وەکو کۆتایی هاتنی ژیان پێشوازیی لێبکرێت. دایك و باوك لەمیانی بەدبەختی وناشووب وئەو ئاڵۆزییەی کەلەتێکشکانی پایەکانی ژیانی خانەوادەیی سەرچاوەی گرتووە ,دەبێت رێگایەکی وەها بگرنەبەر کە تاپێیان دەکرێت زیانێکی کەمتریان بۆمنداڵەکانی خۆیان هەبێت.
خراپترین ئەوکارەی کەژن ومێردی لەیەك تەڵاقدراو دەتوانن بیکەن ئەوەیە کە بۆتۆڵەسەندنەوە لە یەکتری منداڵ وەك چەکێك بەکاربهێنن. هەستەکانی منداڵ خاووپێنەگەیشتوون ,سوود وەرگرتن لەم هەستانە هەمیشەبوونی هەیە. دوودڵی وڕاڕایی ژن ومێرد بۆ ئەم سوود وەرگرتنە گەلێك توندوبەهێزە, هەریەکەیان دەتوانن لەبەردەم منداڵدا رەخنە لەئەوی دیکەبگرێت وبەگوناهکاری لەقەڵەم بدات, لەوانەیە منداڵان ناچاربن کە لایەنگری دایك و باوکیان بکەن و لە کێشەو ئەو گفتوگۆیانەی کەدەربارەی دەرامەتی ژیان وقوتابخانەو، چاوپێکەوتن و شتی دیکەیە بێنە ناومەسەلەکانەوە. کاریگەریی ئەم ناکۆکی وکێشانە بۆمنداڵان مەترسیدارە یەکجار مەترسیدارە.
باشترین ئەورێگایەی کەژن ومێردی لەیەك تەڵاقدراو لەبەرانبەر منداڵەکانی خۆیان دەیگرنە بەر ئەوەیە کە بەلای کەمەوە لەبەرچاوی منداڵان وەکوجاران رۆڵی دایکانە باوکانەی خۆیان بگێڕن، جانەگەر بەشێوەیەکی رووکەشانەش بێت.هەڵبەتە ئەم جۆرە هەماهەنگییە ئاسان نییە، چونکە لەمیانی رکابەریەتی ودوژمنایەتیەوە

پێویستی بەپێشاندانی هاورێیەتی وخۆشەویستی قووڵ هەیە.ڕێنماییەکانی دەروونناس بەلای کەمەوە یارمەتی ژن ومێردە لەیەك تەلاقدراوەکان دەدات کە ڕێگایەکی وەها بگرنەبەر کە منداڵەکانیان زیانێکی کەمتری لێبببینن، چونکە دکتۆر(لویزدسپرتD.R.LOUISEDESPERt) لەکتێبەبەناوبانگەکەی خۆی(منداڵە دایك تەلاقدراوەکان) ئەم مەسەلەیە بەم جۆرە باسدەکات: (لەوانەیە ژن و مێردێك نەتوانن لە ژیانی هاوسەریەتیی خۆیاندا سەرکەوتن وەدەستبهێنن، بەلام ئێستاش دەتوانن شکستی تەڵاق بکەنە سەرکەوتنێکی گەورە.) بۆ ڕوونکردنە لەژێر تیشکی کۆشش وئەقڵ و ڕێنماییدا دەتوانن تەلاقەکەی خۆیان بکەنە تاقیکردنەوەیەکی پەندوعیبرەت ئامێزو بەم ڕێگایەش ئەوەی لە ژیانی ژن و مێردایەتیدا نەیانتوانیووە بەدەستی بهێنن لە تەلاق وەدەستی بهێنن.

## دواوتە

ئەورێگا نوێیانەی کەلەم کتێبەدا پێشنیارکراون، تەنیانەو کاتە دەتوانێ ڕۆڵی دایکایەتیی وباوکایەتیی ئاسان و ڕۆشن بکات کە لەئەنجامدانیدا خوو وسروشت و بارودۆخی منداڵان بەوردی لە بەرچاو بگرێت، لەبەر ئەوەی کاردانەوەی منداڵان لە بەرانبەر ڕێگاو شێوازە پەروەردەییەکانی ئێمەدا جیاوازە .دەستەیەك لە منداڵان ڕووی خۆش پیشان دەدەن و بەئاسانی چۆنیەتیی پەیوەندیی وخوو و ڕەوشتی خۆیان دەگۆڕن. دەستەیەکی دیکە پارێزگارن و لەبەرانبەر سووربون و بەرگریەکانی ئێمەدا بەنارەواییەوە ڕەفتاری خۆیان دەگۆڕن, کۆمەڵەیەکی دیکەش کە زۆر پێ لە پاشترن لەبەرانبەر (هەر ڕاو بۆچونێکی نوێدا) دەربارەی ژیانی خۆیان بەرگری دەکەن و بەتوندی دەوەستنەوە .لەبەر ئەوە بۆ ئەوەی ڕێگاچارەنوێیەکان کاریگەریەکی باشتری لە چاککردنەوەی پەیوەندی نێوان دایکو باوکو منداڵاندا هەبێت ,هەرگیز نابێت گەوهەرو ناوەڕۆکی خوو وکەسایەتیی منداڵان نادیدەبگیرێت.

لە پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکاندا، ئامانج وابەستەی هۆکارەو ،ئەنجامیش وابەستەی تێکۆشان( هەوڵدان )ە, کەسایەتی و ڕەوشتیش لەوکاتەداپێشدەکەوێت کە ڕێگاو شێوازەکانی پەروەردەکردنی منداڵان لەسەربناغەی ڕێزو خۆشەویستییەوە دابنرێت .

ئومێدەوارین ئەم ڕێگانوێیانەی چاککردنەوەی پەیوەندیی نێوان دایکو باوك لەگەڵ مندالآن هەستیارییەکی قوولتر دەربارەی سۆزی مندالآن لەخودی دایکو باوکاندا پەیدابکات, ئەوان بخاتە سەر ئەو ڕێگایەی کە زیاتر گرینگی بە پێویستییە دەروونیەکانی جگەر گۆشەکانی خۆیان بدەن.

(١) ڕەنگە ستایش کردن گەورە سالآنیش بخاتە نێو دوودڵی ونیگەرانییەوە. (ف. د. ریڤ)((F.D.Reeve لەمانگنامەی ئەتلەنتیك (monthly at lantic) ژمارەی سیبتێمبەری ساڵی١٩٦٢ لەلاپەڕەی ٣٨ لە بابەتێك لەژێر سەردێڕی: روبێرت فرۆست (ROBERT FROST) ڕووبەڕووی خرۆشۆف دەبێتەوەو بەم شێوەیە دەدوێت:(ستایشکردن و ڕێزگرتنی لەرادەبە دەری فرۆست لەلایەنخرۆشۆفەوە ئەوی زۆرتووڕەکردبوو تائەندازەیەك خستبوویە نێوترس دڵتەنگییەوە.... هەستی دەکرد دەبێ جارێکی دیکە کارێکی گەورەتر ئەنجام بدات. ئەوکارە گرینگەی نەتوانێ لە ژێر باریدا بێتەدەر.

٢ـ پاڵەوانی یەکێك لە چیرۆکە بەناو بانگەکانی ئەمریکایە کە چووە نێو خەوێکی چەند ساڵیەوەو کاتێك بێدار بۆوە بارودۆخی جیهان گۆڕان و وەرچەرخانی بەسەر داهاتبوو.

٣ ـ دارێکە بۆ خزین لەسەر بەفر لە پێیەکان دەخرێت. یەکێکە لە (پارچەکانی وەرزشی سەر بەفر پارچەکانی بریتییە لە دوو داری درێژو ناسك کە لەپێیەکان دەخرێت و دوو داری باریکی وەك گۆپاڵیشی هەیە کە لەدەست دەگیرێت.

٤– ئەومنداڵەی تازەلەدایك بووە

٥–ئەژیر: انذار